

# کـــازاخـــەکان

## ڕۆمان

لیۆ تۆلستۆی

وەرگێڕانی

ئەمین کەردیگلانی





# خانەی موکریانی بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

- **کازاخەکان**

- **نووسینی:** لیۆ تۆلستۆی
- **وەرگێڕانی:** ئەمین گەردیگلانی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** گۆران جەمال رواندزی
- **بەرگ:** رێمان
- **پیتچنین:** م. شاسەنەم
- **نرخ:** ٥٠٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم ٢٠١٤**
- **تیراژ:** ١٠٠٠ دانە
- **چاپخانە:** موکریانی (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی(٢٦٢)ی ساڵی (٢٠١٤) پێدراوە.**

**زنجیرەی کتێب (٨٢٤)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com
**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# یەک

ئیتـر هـیچ دەنگێـک لە مۆسـکۆوە بەرگـوێ نـاکەوێ. زۆر بە دەگـمەن لە سـووچێکەوە، دەنگی کرپە و تەقوکوتی تـایەی عارەبـانە لە کۆڵانەوە دێ. لە پەنجەرەکانەوە ئیتر هیچ تیشکێک خۆ بە ژووریدا ناکات، لەنتەرەکـان هەمـوو کـوژاونەتەوە. نـاڵەی گازەنگەکـان لە سـەر ئاسـمانی شـاری خەوتـوو شـەپۆل دەدەن و نزیک بوونەوەی بەیان ڕادەگەیێنن. کۆڵانەکان چۆڵوهۆڵن. جاروبـار عارەبانەیەکی شەوڕۆ بە تایەی باریکی خۆی، سینگی شـەقڵ نەشـکاوی بەفر کـووز دەکـا و عارەبانەئـاژۆ لە سـووچێک خـۆی کوشـمەڵە دەکـا و بە دەم چـاوەڕوانیی هـاتنی موسـافیرێکەوە خەو دەیبـاتەوە. پیرێژنێـک بەرەو کلێسـە کەوتۆتە ڕێ. لە کلێسە ئێستا تەنیا چەند مۆم کز دەسووتێن و شۆقی مەیلەو سـووریان دەکەوێتە سـەر وێنەی زێڕینی حەزرەتی مـریەم. کرێکـاران دوای شەوگاری درێژی زستان لە خەو هەستاون و بەرەو شوێنی کارەکانیان ملـی ڕێیان گرتووە.

لە کۆڕی پیاواندا شەونشینی هەر بەردەوامە.

لە کەلێنـی دەربـیجەی داخـراوی یەکێـک لە پەنجەرەکـانی ڕێسـتوڕانی شـەوالیەوە، بە پـێچەوانەی یاسـا ڕوونـاکی دەڕژێـتە دەرێ. لەبەر دەرگـا فەیتوونێـک و چەنـد عارەبـانە و چەنـد هێلیـنگەی کـرێ ڕاوەسـتاون. ترۆئیکـا[1]یەکـی نـزمیش لەوێ ڕاگیـراوە. عارەبانەئـاژۆ لـۆی ڕووپۆشـەکەی هەڵدەداتەوە و خـۆی ڕاستەوپاسـتە دەکـات و هەر دەڵێـی لە قـوژبنێکی مـاڵی خۆیان خۆی حەشار داوە.

پێشخزمەتێـک کە لە سەرسـەرا دانیشـتووە، هەر دوو دەسـتی بە لاجەسـەری خـۆیەوە دەگـرێ و دەکەوێـتە گـۆمی بیـر و خەیـاڵەوە: «ئەوانە

١ ترۆئیکا: عارەبانەی سی ئەسپەیە کە تایبەتی ڕووسیایە.

چەندە چەنەوەری دەکەن؟ ئەویش ڕاست لە کاتێکدا کە سەرەی خزمەتی منە!» لە ژووری تەنیشتەوە کە تەواو ڕووناکە، دەنگی سێ کەسی گەنج دێ کە بۆ خواردنی شێو هاتوون. ئەوان لەسەر مێزێک دانیشتوون کە بەردەماوی خۆراک و مەشرووبی لێ ماوە. یەکیان کە لاوێکی خڕپلانەیە، پاکوخاوێن، بەڵام دالْگۆشت و ناشیرینە و بە چاوی کز و مێهرەبانیەوە چاو لە یەکێک لە هاوڕێکانی دەکات کە دێت و دەچێ. دووهەمی، کە لاوێکی کەڵەگەت و تێکسمڕاوە، لە سەر مێزێکی پڕ لە بتڵی خاڵی دانیشتووە و بە دەم وەنەوزدانەوە یاری بە زنجیری کاتژمێرەکەی خۆی دەکات. سێهەمی بە کۆڵەباڵێکی کەڵپۆسی نوێوە بە نێو ژوورەکەدا دێت و دەچێ و جاروبار ڕادەوەستێ و بادامێک لە نێوان قامکەکانیدا گوشار دەدات تاکوو بیشکێنێ. قامکەکانی ئەستوور و خەریتەن، بەڵام نینۆخەکانی ڕێکوپێکن. ئەم لاوەیان بەردەوام بزەیەکی شاراوەی لەسەر لێوە، چاوی سوور هەڵگەڕاوە و قەڵافەتێکی تۆسنی هەیە. ئەو خێرا خێرا و بە تووڕەیی قسە دەکات و لە کاتی ئاخافتنەکەیدا سەر و دەستی زۆر دەجووڵێنێ، بەڵام دیارە ئەو وشە گونجاوانەی بۆ نادۆزرێتەوە کە کوڵی دڵی خۆی پێ هەڵڕێژێ. هەر وشەیەک لە دەمی دێتە دەرێ، پێی وایە دەربڕی ئەو ڕازە نییە کە لە سەر دڵی قورسایی دەکات. بزەش لە سەر لێوی ناپەڕێ. ئەو لاوەیان کە لە سەر سەفەرە، دەڵێ: «ئێستا دەتوانین هەموو شتێک بڵێین! مەبەستم ئەوە نییە خۆم بە هەقدار بزانم، بەڵام حەز دەکەم تۆ من ئەو جۆرە بناسی کە خۆم، خۆم دەناسم، نەک ئەو جۆرەی کە خەڵکی باسی دەکەن. تۆ دەڵێی من دەرهەق بە ئەو، تووشی هەڵە بووم؟ ...»

دەربڕی ئەو قسانە بۆی دەردەکەوێ کەسێک بە سەرنجی پڕ لە مێهرەبانییەوە چاوی لێدەکات. لاوی خڕپلانە و ناحەز وەڵامی دەداتەوە: «ـ هەڵە؟ بەڵێ!»

دیارە شەکەتی و دڵۆڤانییەکی زیاتر لە چاوانی ئەودا شەپۆل دەدا. ئەو لاوەی ئامادەی ڕۆیشتنە، دەڵێ:

ــ مــن دەزانــم تــۆ بــۆ ئــاوا قســه دەكەی. تــۆ پێــتوایه بەختەوەریــی خۆشەویست بوون لەگەڵ بەختەوەریی خۆشویستن یەکسانە و بۆ تەواوی ماوەی ژیان بەسندە دەکات کە یەکجاری بە دەستی بهێنین.

لاوی نـاحەز و خـڕیلانە لەگەڵ ئەوەی چـاوی زیـت کردبـۆوە، گـوتی: «ــ بەڵێ، کاکی خۆم! بەسندە دەکات، تەنانەت سەروزیادیشە.»

ئەو لاوەی لەسەر سەفەرە، لەگەڵ ئەوەی خەیاڵ هەڵیگرتبوو و بە چاوی پڕ لە دڵسـۆزییەوە لە هـاوڕێکەی دەڕوانـی، گـوتی: «بـۆ نـابێ خۆشـەویسـتی کەسێک لە دڵماندا بێ؟ بەڵێ، بۆ دەبێ خۆشویستن تاوان بێ! ئەوین گوێ بە فەرمان نادا و سنوور ناناسێ، نا، خۆشەویست بوون، جۆرێک چارەڕەشییە، ئەوپەڕی بەدبەختییە کاتێک مرۆڤ هەست دەکا لەبری ئەو خزمەتەی پێی کراوە هیچ خزمەتێکی لە دەست نەهاتووە و نەیکردووە. ئاخ خودایە گیان!»

پاشان بە ناهومێدی دەستێکی هەڵتەکاند و گوتی: «خۆزگە هەموو ئەوانە هۆکارێکیـان بووبـووایە. بەڵام مەسـەلەکە بە پـێچەوانەیە، هەمـوو ئەوانە لە خۆوە ڕوو دەدەن، بەبێ ئەوەی دەستمان تێیدا هەبێ. بەڕاستی دەتوانم بڵێم من ئەم هەست و سۆزەم دزیوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەمە شتێکە کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە. مەڵێ نـا، تۆ دەبوو لە بیری ئەوەدا بی. دەی باشـە، ئێسـتا حەز دەکەم باوەڕم پێ بکەی لە نێوان تەواوی ئەو گەوجێتی و ئاکارە ناحەزانەدا کە لە مـاوەی تەمەنمـدا ئەنجـامم داوە، ئەمەیـان تەنیـا کـردەوەیەکە کە لێـی پەشیمان نیم و ناشتوانم لێی پەشیمان بم. نە لە سەرەتادا و نە لە ئاکامیشدا مــن نە بە ئەوم گوتــووە نە بە خــۆم. هەمیشــەش ئەو هەســتەم هەبــووە: وەلحاسڵ ئێستا ئەوم زۆر خۆشدەوێ... پاشان بۆم دەرکەوت ئەو قسەیەش خۆی درۆیەک بووە، ئەویش درۆیەکی نەخوازراو، دیارە خۆشەویستیش بەو شـێوەیە نـابێ، وانییـە؟ منـیش نەمـدەتوانی بچـمە پێشـترەوە، ئەو، چـۆتە پێشترەوە. بڵێی تاوانی من بێ؟ ئەگەر نەمتوانیوە، خەتای من چی بووە؟»

هاوڕێکەی بۆ ئەوەی خەوەکەی بڕەوێ، جگەرەیەکی داگیرساند و گوتی: «کوڕە لە سەری مەڕۆ، ئیتر هەر گوێشی مەدەیە! ئەوەی ڕوون و ئاشکرایە

ئەوەیە کە تــۆ هێشــتا ئاشــق نەبــووی و هەر ناشــزانی مانــای ئەشــق و خۆشەویستی چییە!»

لاوێک کە کەڵپۆسـی نـوێی لە بەردا بـوو، دەیویسـت دیسـان شـتێک بڵـێ، هەردوو دەسـتی بە لاجە سـەریەوە گـرت بەڵام نەیتـوانی ئەوەی لە دڵیـدایە دەیبڕێ.

ـ ئاشق نەبووم!.... بەڵێ، وایە. من هێشتا ئاشق نەبووم، بەڵام بە ئاواتەوەم ئاشـق بـم، ئاواتێـک کە زۆر گەورەیە و لەویـش گەورە و بەهێزتـر هەر نـابێ. لەگەڵ ئەوەشــدا یــانی ئەشــقێکی ئەوتــۆ بــوونی هەیە و هەمــوو شــتێک بە ناتەواوی دەمێنێتەوە؟ وەلحاسڵ من زۆر بە توندی خـۆم تووشـی گرفت و ئاڵۆزی کـردووە. بەڵام ئێسـتا هەمـوو شـتێک کۆتـایی هـاتووە. هەق بە تـۆیە؛ منیش پێموایە ژیانێکی نوێ خەریکە دەست پێدەکا.

ئەو لاوەی لەســـەر کورســـییەکە وەنەوزی دەدا و یـــاریی بە زنجیـــری کــاتژمێرەکەی دەکــرد گــوتی: «ژیــانێکی نــوێ کە دیســان تێیــدا تووشــی سەرلێشێواوی دەبی.»

بەڵام ئەو لاوەی کە لە سەر سەفەر بوو، ئەم وتەیەی نەبیست و درێژەی بە قسەکانی دا:

ـ من بۆ ئەم سەفەرەم لە لایەک بە داخەوەم، لە لایەکیشەوە ڕازیم. بۆچی بە داخەوەم؟ خۆشم نازانم!

پاشان سەبارەت بە ئەو دەستی کرد بە قسە کردن، بێئەوەی ئاگادار بێ خەڵـک وەک ئەو بیـر لەو مەســەلەیە نـاکەنەوە و هۆگریشــی نـین. مـرۆڤ هیچکات بە ڕادەی کاتی شادی و پلەزیقان و دڵخۆشی، خۆپەرست نییە. لەو جۆرە کاتانەدا پێی وایە لە دنیادا هیچ شتێک لە ئەو جوانتر و سەرنجڕاکێشتر نییە.

لەو کاتەدا نۆکەرێکی لاو کە باڵتەیەکی جاوی لە بەردا بوو و پشتێنێکی لە پشتی بەستبوو، خۆی کرد بە ژووریدا و گوتی:

ـ دیمیتری ئاندریڤیچ، تەتەر پەلەیەتی و لەوە زیاتر ماتڵ نابێ! عارەبانە لە کاتژمێر یازدەوە لێرە ڕاوەستاوە و ئێستا کاتژمێر چوارە.

دیمیتری ئاندریڤیچ چاوێکی لە ژانۆی نۆکەری خۆی کرد. لە پشتێنەکەی و لە پۆستاڵەکانی و لە چاوە خەواڵووەکانیدا دەنگی ژیانێکی نوێی دەبیست، ژیانێک کە لێوڕێژ بوو لە ئازار و بێبەشی و چالاکی. لەگەڵ ئەوەی بۆ یەکێک لەو ئاغزوونانە دەگەڕا کە داینەخستبوو، گوتی: «لە ڕاستیدا.... خوداحافیز!»

لەگەڵ ئەوەشدا کە داوایان لێکردبوو پاداشێکی تازە بدات بە تەتەرەکە، کڵاوە بێشەپکەکەی لە سەری کرد و لە چەقی ژوورەکەدا ڕاوەستا؛ جارێک دوو جار یەکتریان ماچ کرد، تۆزێ ڕاوەستان و بۆ جاری سێهەم یەکتریان ماچ کرد. ئەو لاوەی کەڵپۆسە تازەکەی لە بەردا بوو، هات بۆ لای مێزەکە، پێکێکی هەڵدا و دەستی هاوڕێ خڕیلانە ناشیرینەکەی خۆی گرت و سوور هەڵگەڕا.

ـ نا، من هەرچۆنێک بێ پێی دەڵێم. من دەبێ لەگەڵ تۆ ڕاست و ڕەوان بم. هەر دەبێ واش بم چونکە زۆرم خۆشدەوێی... کەوایە تۆ ئەوت خۆشدەوێ؟ من هەمیشە بیرم لەوە کردۆتەوە... وا نییە؟

ئەوی دیکەیان بە بزەیەکی زۆر مێهرەبانترەوە گوتی:

ـ بەڵێ وایە.

ـ یان ڕەنگە...

لەو کاتەدا پێشخزمەتی ڕستۆران کە وەنەوزی دەدا و دوایین قسەی ئەو دوو هاوڕێیەی بیستبوو، لە خۆی پرسی: «بۆ ئەو پیاوانە هەمیشە مەسەلەیەک دووپات دەکەنەوە؟» گوتی:

ـ ببوورن، من دەبێ مۆمەکان بکوژێنمەوە. کێ حیسابەکەم دەداتێ؟

چونکە لە پێشدا زانیبووی کێ پارە دەدا، ڕووی لە پیاوە کەڵەگەتەکە کرد و گوتی: « حیسابی دەکەن؟»

کابرای کەڵەگەت گوتی: «بەڵێ، چەندەیە؟»

- بیست و شەش ڕۆبل.
کابرا تۆزێکی بیر کردەوە، بەڵام هیچی نەگوت و سیایی حیسابەکەی لە گیرفانی ئاخنی.
دوو کەسەکەی دیکە درێژەیان بە قسەکانیان دا.
لاوە خڕپلانە و ناحەزەکە بە ڕوانینێکی دڵۆڤانانەوە گوتی: «خوداحافیز، تۆ زۆر کوڕی چاکی!»
هەردووکیان فرمێسک لە چاویاندا قەتیس ما. پێکەوە هاتنە دەرێ، لە سەر قاڵدرمەکان ڕاوەستان.
مسافیرەکە ڕووی لە لاوە کەڵەگەتەکە کرد و لەگەڵ ئەوەدا سوور هەڵگەڕابوو، گوتی: «هاوڕێ، تۆ حیسابەکەی شەوالیە بدە و لەسەر من بینووسە.»
ئەوی دیکەیان لەگەڵ ئەوەی خەریکی لە دەست کردنی دەستەوانەکانی بوو، وەڵامی دایەوە: «باشە، باش!»
کاتێک گەیشتنە سەر قاڵدرمەکان بێئیختیار گوتیشی: «من چەندە ئێرەیی بەو حاڵ و ئاکارەی تۆ دەبەم.»
مسافیر سواری عارەبانەکە بوو، کورتەکی کەڵپۆسی لە خۆی پێچا و گوتی: «زۆر چاکە، یاڵڵا، با بڕۆین!» تۆزێک کشا دواوە، بۆ ئەوەی جێ بۆ ئەو کەسە بکاتەوە کە خەمی بۆ دەخوا، دەنگی دەلەرزی.
ئەوی دیکەیان گوتی: «خوداحافیز، میتیا[2]، خودا ئاگادارت بێ...» تەنیا ئاواتی ئەو، ڕۆیشتنی هەرچی زووتری مسافیرەکە بوو، هەربۆیە بۆ بەڕێکردنی هیچ دۆعایەکی نەکرد.
هەردووکیان بۆ ساتێک بێدەنگ بوون. دیسان یەکێکیتر گوتی: «خوداحافیز!»
کەسێک گوتی: «عارەبانەچی، لێخوڕە!» عارەبانەی پۆستە کەوتە ڕێ. یەکێک لە هاوڕێکان هەرای کرد:

---

٢ سووکەڵە ناوی خۆمانەی دیمیترییە.

ـ ئیلئازار، عارەبانەکەی من!

فـایتوونەوانی عارەبـانەی کـرێ و هێلیـنگە تایبەتەکـان، کەوتـنە جموجـۆڵ، شەققەی خەڕەزەن هەستا و هەوسارەکانیان شل کرد.

فەیتوونی نیوە بەستوو، سینگی بەفری شـەق کـرد و هـاتە پێشـێ. یەکێک لەو لاوانەی ئامادەی سەفەر بوو، گوتی: «ئەمە ئۆلێنینە، زۆر کـوڕێکی باشـە! بەڵام خەیـاڵێکی قـۆڕە، پیـاو بچـێ بـۆ قەفقـاز، ئەویـش وەک قوتـابیی فێـرگەی سەربازی! تۆ سبەی شەو لە باشگا شێو دەخۆی؟»

ـ بەڵێ.

پاشان لێک دوور کەوتنەوە. موسـافیرەکە لە نێو کورتەکە کەڵپۆسـەکەیدا هەسـتی بە گەرمـا دەکـرد. لە تەختـی عارەبـانەکەدا دانیشـت. قـۆپچەی کـورتەکەکەی بە تەواوی کـردەوە. ترۆئیکـا بە شـێوەیەکی نارێـک و هەڵـبەز دابەز لە کـۆڵانێکی تـاریکەوە بـۆ کـۆڵانێکی تـر دەڕۆیشـت، بە بەردەرگـای ماڵانێکدا دەڕۆیشت کە مسافیرەکە تا ئێستا چاوی پێیان نەکەوتبوو. ئۆلێنین پێـی وا بـوو تەنیـا مسـافیرەکان بەو کۆڵانـانەدا تێـدەپەڕن. تـاریکی و پەژارە تەواوی وڵاتی داگرتبوو و بێدەنگی باڵی بە سەر شـارەکەدا کێشـابوو، ڕۆحـی لێـوڕێژ بـوو لە بیـرەوەری و ئەشـق و خەفەت و فرمێسـکی هیـوا، کە ئەو حاڵەش هەناسەی سوار دەکرد....

# دوو

«مـن ئاشـقم! مـن هەتـا ڕادەی شـێتی ئاشـقم! ئـاخ چ خەڵکێکـی باشـن، چ خەڵکێکی ڕێکوپێک!» ئۆلێنین ئەو وشانەی لە بەرخۆیەوە دووپات دەکردەوە و حەزی دەکـرد بگـری. بەڵام بـۆ فرمێسـک لە چـاوی هەڵـنەدەوەری؟ ئەو خەڵکە باشـانە کێ بـوون؟ چ کەسێکی تـا ئەو ڕادەیە خۆشدەویسـت؟ بە هیچ جۆرێک ئەو مەسەلەیەی بۆ نەدەچۆوە سەر یەک. جاروبـار سـەرنجی ماڵێکی دەدا و لەوەی کە ئەو مــاڵە بەو شــێوە ســەیرە بینــا کــراوە، تووشــی سەرسـووڕمان دەبـوو، هێنـدێ جـاریش کە تەتەر و ژانـۆی نـۆکەری تـا ئەو ڕادەیە نــامۆ دەهــاتە بەرچــاو و لە پەنــای خۆیــدا دەیــدین کە لەگەڵ ئەو کەندولەنـدی ڕێگـا ڕایـان‌دەتلەکێنێ، لەگەڵ ئەودا بە سـواری ئەسـپی تونـدئاژۆ ڕێگا دەبڕن، ئەو ئەسپانەی کە بە سینگی زوقم لێ‌نیشـتووەوە ڕچە دەشـکێنن و ترۆئیکا بە دوای خۆیاندا ڕادەکێشن. ئەو دیسان دەیگوت: «ئـاخ هاوڕێیـانی خۆشەویست! چەندەم خۆشدەوێن!» تەنانەت جارێک دەنگی هەڵبڕی: « بژی! براڤۆ!» هەرلەگەڵ دەربڕینی ئەو وشەیە خۆی سەری لە خۆی سـووڕما و لە خۆی پرسـی: «بەڕاستی بڵێی سـەرخۆش بـووبێتم؟» لە ڕاسـتیدا ئەو بە تەنیـا نزیکەی دوو بتڵی شـەڕاب خواردبۆوە، بەڵام تەنیـا شـەراب نەبـوو کە تـا ئەو ڕادەیە شـوێنی لە ســەر ئـۆلێنین دانــابوو. ئەو تەواوی ئەم قســانەی وەبیــر دەهاتنەوە کە پێی وا بوو سادقانەن و بە شـێوەیەکی ڕواڵەتـی و بە هەڵکەوت پێیان گوتبوو. ئەو دەستگوشین و ڕوانین و بێدەنگی و زایەڵەی ئەو دەنگەی کە کاتی سواربوونی عارەبانەکە پێی گوتبـوو: «خوداحـافیز میتیـا!» هەمـووی وەبیر هاتبۆوە. ئەو ڕاستی و یەکڕەنگییە لێبڕاوانەیەی تایبەتی خـۆی وەبیـر دەهـاتەوە و هەمـوو ئەوانە بـۆ ئەو خەم و دڵتەنگییەکیـان پێـوە بـوو. بەر لە

وەڕێکەوتن، تەنیا هاوڕێیان و خزموکەس و خەڵکی ئاسایی نەبوون کە وێدەچوو هەموویان لە ناکاو ڕوحمەکەیان بۆی تلیسابێتەوە و خۆشەویستی خۆیان بۆ دەربڕیبێ، بەڵکوو کەسانی دژواز و ڕەقیبیش وێدەچوو وەک کاتی دانپیانانی بەر لە مەرگ، بە باوەشی ئاواڵەوە بەرەو پیری هاتبێتن و دەستی ئاشتییان بۆ درێژ کردبێ. ئەو لە دڵی خۆیدا پێی وابوو: «ڕەنگە ئیتر نەتوانم لە قەفقاز بگەڕێمەوە.» هەروەها بە خەیاڵیدا هات کە ئەو هاوڕێیانی خۆی و کەسێکی دیکەی خۆشدەوێ و زۆری دڵ بە خۆی سووتا.

بەڵام ئەوە خۆشەویستی نەبوو کە ڕۆحی ئەوی تا ئەو ڕادەیە خەمبار و ئاڵۆز کردبو و نەیدەتوانی بە سەر زمانی خۆیدا زاڵ بێت و خۆ لە دەربڕینی قسەی بێمانا ببوێرێ و تەنانەت ئەوینی ژنێکیش ئەوی تووشی ئەو پەشێواوییە نەکردبوو. (ئەو قەت ئاشق نەببوو) جۆرێک هەستی خۆپەرستی، هەستێکی بەتین و پڕ لە هیوا، ئەوینێکی نوێ سەبارەت بەو شتەی لە ڕۆحی ئەودا جوان و دڵگر بوو (هەروەها وا دیار بوو لە ناخی ئەودا جگە لە چاکە و جوانی، هیچ شتێکی تر بوونی نەبوو.) فرمێسکی پێ دەڕشت و وای لێدەکرد وڕێنە بکات و وشەی بێواتا دەربڕێ.

ئۆلێنین لاوێک بوو کە لە هیچ بەشێکدا خوێندنی تەواو نەکردبوو، لە هیچ کوێ دەستی لە ڕەش و سپی نەدابوو. (تەنیا هۆگرییەکی وشک و ڕواڵەتیی بۆ کاروباری کۆمەڵایەتی هەبوو، کە ئەویش مەعلووم نەبوو چییە.) ئەو نیوەی سامانەکەی خۆی بە فیڕۆ دابوو، ئەو، هەتا تەمەنی بیست و چوار ساڵان هیچ ڕێگایەکی بۆ خۆی هەڵنەبژاردبوو و دەستی بۆ هیچ کارێک نەبردبوو. ئەو، ڕاست ئەو شتە بوو کە لە کۆڕی لاوان و خۆشڕابوێرانی مۆسکۆدا بە «پیاوی هەرزەکار» بەناوبانگە.

لە تەمەنی هەژدە ساڵییەوە ئۆلێنین ئازاد بووبوو، ڕاست وەک کوڕێکی خانەدان و ساماندار ی ئەم سەدەیە، کە لە تەمەنی مێرمنداڵیدا دایک و باوکی لە دەست بدات، بۆیە بە کەیفی خۆی ڕایدەدا و هیچ بەرگێڕەوەیەکی نەبوو. ئەو دەیتوانی هەموو کارێک بکات و پێویستی بە هیچ شتێک نەبوو. ئەو، هیچ

شتێکی بە لاوە گرینگ نەبوو و گوێی بە بوون و نەبوون نەدەدا. نە بنەماڵەی هەبوو، نە وڵات؛ نە بیر و باوەڕی هەبوو نە هەستی بە بەرپرسایەتی دەکرد. ئەو، بڕوای بە هیچ شتێک نەبوو و هیچیشی لە هیچ کەس قەبووڵ نەدەکرد. بەڵام لەگەڵ ئەوەی دانووی لەگەڵ هیچ کەس نەدەکولا و لە هەموو کەس و شتێک ناڕازی بوو، کوڕێکی ڕووگرژ و لەشداگیراو و بە پرتە و بۆڵە نەبوو؛ بە پێچەوانە، ئەو، هەمیشە هۆگری شتێک بوو. ئەو لە سەر ئەم باوەڕە بوو کە ئەشق بوونی نییە و هەرجارێک کە لەگەڵ ژنێکی شۆخوشەنگ بەرەوڕوو دەبوو، حاڵی تێکدەچوو. لە مێژ بوو دەیزانی کە پلەوپایە و شانازی جۆرێک گەوجێتی و خۆهەڵخەڵەتاندنە، بەڵام کاتێک لە کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێدا شازادە سێرژ دەهات بۆ لای و قسەی خۆش و دنەدەرانەی بۆ دەکرد و ئافەرینی پێ دەگوت، ئەو بە پێچەوانەی بیروباوەڕی خۆی، زۆری چێژ وەردەگرت و دەگەشایەوە. بەڵام ئەو زۆری گوێ بەو شتانەش نەدەدا و لە بەرچاوی نەدەگرتن، مەگین تا ڕادەیەک کە تووشی دەروەست بوونی نەکات و نەکەوێتە ژێر باری منەتەوە. هێندێجار کە وای لێدەهات ئاشقی کەسێک بێت یان خەریک بوو دڵی بدۆڕێنێ، تووشی ئازار و ململانێ دەبوو، ململانێیەکی خوێڕییانەی لەگەڵ ژیان هەست پێدەکرد. بە شێوەی خۆماک و بە خێرایی هۆگریی خۆی لەگەڵ ئەو هەستە یان ئەو مەسەلەیە دەپچڕاند و هەوڵی دەدا ئازادیی خۆی بە دەست بهێنێتەوە. بەم شێوەیە بوو کە لەگەڵ ژیانی کۆمەڵایەتی و هەڵسوکەوت لەگەڵ خەڵک و ڕاگەیشتن بە ماڵ و سامانەکەی و مۆسیقا کە سەردەمێک پێی وابوو وا چاکە خۆی بۆ تەرخان بکات و تەنانەت پێ بنێتە دنیای ئەشقەوە کە هیچ بڕوایەکی پێی نەبوو. ئەو لە خۆی دەپرسی ئەم هەموو توانا و وزەیەی گەنجێتی کە مرۆڤ لە ژیانیدا تەنیا جارێک دەستەبەری دەکات، چۆنی بە کار بهێنێ؟ دەبێ ئەو وزەیە لە ڕێگای هونەرە جوانەکاندا سەرف بکات یان لە ڕێگای زانست و ئەویندا، یان لە ڕێگای کردەوەی چالاکانەدا؟ ئەم وزەی گەنجێتییە نەک هەر وزەی هۆش و دڵ و فێربوونە، بەڵکوو توانایییەکە کە قەت قەت جارێکیتر وەدەست

نـایەتەوە، توانـایی‌یەک کە تەنیـا جارێـک بە مـرۆڤ دەدرێ تـاکوو ئەوەی لە خـۆی دەخـوازێ، هەرچـۆنێکی بخـوازێ و لە تەواوی دنیـادا هەرچییـەک کە حەزی لێیەتـی، دروسـتی بکـات. ڕاسـتە کەسـانێک هەن کە بەری لەو تاسـە و حەز و توانـــایی‌یەن و لەگەڵ پێنـــانە نێـــو ژیـــانەوە، یەکەم هەل کە بۆیـــان هەڵـدەکەوێ، دەیقـۆزنەوە و نەجیبـانە هەتـا کۆتـایی ژیـان، لەو شـوێنەدا ڕادەوەستن، بەڵام ئۆلێنین لە وجوودی خۆیدا بە چڕوپڕی هەستی بە بوونی ئەم خـودا بە هێـزەی گەنجێتـی دەکـرد و ئەم چییەتیـیە دەبـوو بە ئاواتێـک، دەبوو بە تەنیا بیرێک بۆ ویستن و ئەنجامدان، هەروەها کوێرانە خۆ فڕێدانە نێو چاڵێکی بێبنەوە، بەبێ‌ئەوەی بزانێ بۆ کێ و بۆ چی ئەو کارە دەکات. ئەو لە نـاخی خۆیـدا بە باشـی لەو وزەیە دەگەیشـت و بەوە لەخۆبـایی بـوو، بەبێ ئەوەی بشزانێ بۆچی، زۆری لێ ڕازی بوو. هەتـا ئەم کاتە ئەو جگە لە خۆی هـیچ کەسـی خۆشنەویستبوو، جگە لەوەش هیچـی تـری پێ نەدەکرا. چـونکە لە وجـوودی خۆیـدا جـگە لە چـاکە، هیچـی دیـکەی نەدەدی و هێشـتا دەرفەتـــی لە دەســـتدانی خەیاڵەکـــانی خـــۆی نەبـــوو. کاتێـــک مۆســـکۆی بەجێ‌هێشت، خۆی بە بەختەوەر دەزانـی کە کوڕێکی گەنج بیر لە هەڵەکانی ڕابردووی خۆی دەکاتەوە و لە ناکاو بە خۆی دەڵێ: «نـا، من نەمدەویست ئـاوای لێ بێ.» ئۆلێنین بە خۆی گوت کە تەواوی کردەوەکانی ڕابـردوو بە ڕێکەوت بووە و هیچ گرینگایەتییەکیـان نەبـووە، پێشـتر نەیویسـتووە ژیـانێکی نەجیبـانەی هەبـێ؛ بەڵام ئێسـتا بە دوورکەوتـنەوە لە مۆسـکۆ، ژیـانێکی نـوێ دەســـت پێدەکـــا کە لەودا ئیتـــر ئەم هەڵە و پەشـــیمانییانە ڕوو نـــادەن و بە دڵنیایی‌یەوە لەگەڵ بەختەوەری دەستەملان دەبێ.

زۆر جار لە گەشتە درێژخایەنەکاندا ڕوو دەدا کە لە ماوەی دوو یان سێ مەزڵی سـەرەتادا، مـرۆڤ هەروا خەیـاڵی لەو شـوێنەیە کە لێی دابـڕاوە. دوای ئەوە زۆر زوو و لەگەڵ ڕۆژ کـــردنەوەی یەکەم شـــەوی غەریبـــایەتی، ئەم خەیـاڵانە بەرەو شـوێنی نیشـتەجێ بـوونی دەگـوێزرێتەوە و لەوێ مســـافیر

باڵەخانەیەک لە سەر بۆشایی ساز دەکات؛ بۆ ئۆلێنین ڕاست بەو شێوەیە بوو.

لە دەرەوەی شار، لە کاتی تێپەڕین لەو دەشت و مەزرا پڕ لە بەفر و ڕچە نەشکاوانە، دڵی کرایەوە کە لەو دەشتە چۆڵەدا بە تەنیایە. پاشان کەڵپۆسەکەی لە خۆی پێچا و خۆی لە سووچی دواوەی عارەبانەکە پەستاوت. ئۆقرەی گرت و خەوێکی ئارام باڵی بە سەردا کێشا. ماڵئاوایی کردنی هاوڕێکانی زۆری دڵتەنگ کردبوو، تەواوی ماوەی زستان کە لە مۆسکۆ ڕایبواردبوو، وەبیری هاتەوە و وێنەکانی ئەو ڕابردووە کە خەیاڵ و سەرکۆنەی گرینگ و جۆراوجۆر لێی دەشێواند، بێئیختیار خۆیان لە مێشکی دەهاڵاند و لە زەینیدا زەق دەبوونەوە.

ئەو، پاشان هاوڕێیەکی خۆی وەبیر هاتەوە کە بەڕێیکردبوو و پێکەوە سەبارەت بە پێوەندیی نێوان ئەو و کچێک دوابوون. ئەو کچە زەنگین و دەوڵەمەند بوو. ئۆلێنین لەبەر خۆیەوە بیری دەکردەوە: «چۆن دەکرێ هاوڕێکەی من ئەو کچەی خۆشبوێ؟ چونکە ئەو کچە حەز لە من دەکات!» گومان و دڕدۆنگی لە خەیاڵیدا ڕەگاژۆی دەکرد. پاشان بە خۆی گوت: «ئەو خەڵکە چەندە ناپاکن، کاتێک پیاو بیری لێ دەکاتەوە... بەڵام لە ڕاستیدا بۆچی من تا ئێستا ئاشق نەبووم؟ هەموو خەڵکی پێم دەڵێن ئاشق نەبووم، بڵێی ڕۆحی من وەک ڕۆحی ئاژەڵێک وابێ؟» پاشان دڵدۆڕاوییەکانی خۆی وەبیر هاتەوە، کە شەوانە لەبەر شۆقی چرا لەگەڵ خوشکی یەکێک لە هاوڕێکانی دادەنیشت و خۆشەویستی تووشی دڵەکوتەی دەکرد. شۆقی چراکە پەنجەی نەرم و دڵڕفێن و لێو و چەنەی جوان و سپیوسۆڵی ئەوی ڕووناک دەکردەوە و سات بە سات زیاتر ئاشقی دەبوو. بۆیە قسەوباسی دوور و درێژ و خەم و کێشەی ژیان و شەرموشکۆ و هەستی تاوان کە ناخ و ڕۆحی داگرتبوو هەمووی تێکڕا وەبیر دەهاتەوە. دەنگێک بەردەوام لە دەروونیدا دووپات دەبۆوە: «نا، وا نەبوو، لە ڕاستیدا بەو جۆرەش نەبوو!» پاشان دیمەنی باڕ و سەمای مازورکا لەگەڵ شۆخەکیژی وەبیر هاتەوە و لە

دڵـی خۆیـدا بیـری کـردەوە: «ئەو شــەوە چەنـدە ئاشـق بـووم، چەنـدەش بەختەوەر بـووم! بەیـانیی ڕۆژی دواییش کاتێک لە خەو هەسـتام و هەسـتم کرد ئازادم، ڕق و قین چەندەی گوشار بۆ ڕۆحم هێنا و ئازاری دام! کەوایە دەبـێ بڵـێم ئەویـن ڕووم تێناکـا و قەت دەسـت و پـێم نابەستێ؟ــ دیســان درێژەی بە بیرکردنەوەکەی دا: «نا، ئەوین بۆ مرۆڤ پێویست نییە! کەوایە ژنە جوانەکەی جیرانمان کە بە من و دۆبرۆین و مارشاڵی خانەدانی دەگوت ئەستێرەکانی خۆشدەوێ، ئەویش ئەویـن نەبـووە.» ئێسـتا خەریکـی وەبیـر هێنـــانەوەی چالاکییەکـــانی شـــوێنی ژیـــانی خـــۆی بـــووە و لەوێـــش لەو بیرەوەرییـانەدا هـیچ جـۆرە حەز و هیـوایەک نەبـوو کە چێـژی شـادیی پـێ ببەخشێ. بیری دەکردەوە: «بڵێی ئەوان سەبارەت بە سەفەرەکەی من زۆر بـدوێن؟» «ئەوان» کـێن؟ نـازانێ. پاشـان لە ناکـاو بیرێـک بە زەینیـدا هـات، نێوچاوانی تێکنا و هەر ئەوەش بووە هۆی ئەوەی دەنگێکی سەیر لە لێوی بێتە دەرێ. ئەم بابەتەش ئاغای کاپێل و شەش‌سەد و حەفتا و هەشت ڕۆبل کە بە بەرگدرووەکەی خـۆی قەرزدارە، هەر لەو کـاتەدا ئەو وشـانەی وەبیـر دێـتەوە کە بـۆ پـاڕانەوە و تکـا بە بەرگـدرووەکەی دەگـوت تـاکوو سـاڵێکی دیکەی دەست لـێ ڕاگرێ و هەروەهـا قەڵافەتـی تـووڕە و دڕدۆنگـی کـابرای بەرگـدرووی هێنـایە بەرچـاوی خـۆی. هەر لەو کـاتەدا چاوێـک دەقرتێنـێ و هەوڵ دەدا خەیـاڵێکی تـاڵ لە مێشـکی خـۆی دوور بخـاتەوە و دەڵـێ: «ئـاخ، خودایە گیان، خودایە گیان!» پاشان بیری فڕی بۆ لای ئەو کچە جوانەی کە کـاتی ماڵئـاوایی باسـیان کردبـوو، لە دڵـی خۆیـدا دەڵـێ: «لەگەڵ ئەوەشـدا ئەو منی خۆشدەوێ! بەڵێ ئەگەر من زەماوەندم لەگەڵ بکردایە، ئێستا ئەو هەموو قەرز و قــۆڵەیەم لە کــۆڵ کەوتبــوو، لە کاتێکــدا ئێســـتا پـــارەیەکی زۆر بە واســـیلۆڤ قەرزدارم.» هەر لەو کـــاتەدا دوایـــین شـــەوی قومـــاری لەگەڵ واسـیلۆڤ وەبیـر هـاتەوە کە لە باشـگا کردبوویـان و ئەو شـەوە کـچەش لە باشگاکە بوو و لە بەرچاوی ئەو زۆر خوێڕی و سـووکوچرووکانە داوای لە واسـیلۆڤ کردبـوو دیسـان یـاریی لەگەڵ بکـات و ئەویش زۆر بێموبالاتـانە

دەستی بە ڕوویەوە نابوو. «ساڵێک دەست پێوە دەگرم و تەواوی ئەو قەرزانە دەدەمەوە. قورمدا بە چاوی هەموو ئەو کەسانەدا!...» لەگەڵ ئەوەشدا کە بە خەیاڵ خۆی ئاسوودە کردووە، دەست دەکات بە بژاردنی ئەو قەرزانەی لە سەریەتی و کاتی دانەوەیان و گۆشەیەک کە دەتوانێ بیداتەوە: «داخ ئەوەیە من قەتم قەرزی مۆرێل لە کۆڵ ناکەوێ و پاچرای ڕیستۆرانی شەوالیەش لەولاوە ڕاوەستێ.»

هەر لەو دەمەدا بیری لە شەوێک دەکردەوە کە ئەو قورەی بۆخۆی گرتبۆوە و کەوتبووە ژێر باری قەرز. لەو شەوەدا کۆڕێکی بادەنۆشی لەگەڵ ئۆرکێسترای قەرەجەکان پێکهاتبوو کە بەڕێوەبەرەکانیشی هاوڕێی پترزبۆرگ بوون: ئەلکساندر ب.... ئاجوودان و شازادە و... هەروەها پیرەپیاوێکی خانەدان و ناوبەدەرەوە .... پاشان بیری کردەوە: «ئەو ئاغایانە بۆ ئەوەندە لەخۆڕازی و قۆڕەدەماخن؟ بۆچی ئەوان کۆڕێکی تایبەت پێکدێنن کە بە بڕوای خۆیان ئەندام بوون لەو کۆڕانەدا بۆ خەڵکی دەبێ زۆر جێی شانازی بێ؟ یانی بە هۆی ئەوەیە کە ئەوان ئاجوودانن؟ بەڵام ئەوە جێی داخە کە ئەوان چەندە خەڵک بە گێل و گەمژە دەزانن! بەڵام من چاکم دا بە گورچوویاندا کە هیچ هۆگرییەکم پێیان نییە و قەت حەز ناکەم لێیان نزیک بم. سەرەڕای ئەوەش پێموایە ئاندرێتی موباشر زۆر قەڵس دەبێ کاتێک ببیستێ من سەرم خستۆتە سەر پیاوێکی وەک ئەلکساندر ب...، سەرهەنگ و ئاجوودانی ئەعلاحەزرەت و دمبەدمەم لەگەڵدا کردووە... ئەو شەوە هیچ کەس بە قەت منی پێکی شەراب هەڵنەدا؛ من ئاوازێکی نوێم فێری قەرەجەکان کرد و هەموو گوێیان بۆ ڕاگرت. لەخۆڕا هێندێ گەوجێتیم نواند، بەڵام ئەوە نابێتە هۆی ئەوەی کە من کوڕێکی باش نەبم.»

لە مەزڵی سێهەم، کازیوەی بەیان ئۆلێنینی غافڵگیر کرد. چایی خواردەوە و لەگەڵ ژانۆ جێوبان و جانتاکانیان ڕێکوپێک کرد، پاشان زۆر سەنگین و بە ئارامی لە نێوەڕاستی عارەبانەکەدا دانیشت. بە باشی دەیزانی جێگای هەرشتێک کوێیە، پارە لە کوێیە و چەندەیە، پسوولەی بلیتی عارەبانە و

ڕەسیدی پۆستچی، هەموو ئەوانە هێندە بە لایەوە ئاسانیان دەنواند کە شادی لە دڵــی گەڕا و ئەم ســـەفەرە دوور و درێــژەی وەک گەشــتێکی خــۆش و بەردەوام دەهاتە بەرچاو.

هەر لە قاوەڵتوونەوە هەتا نیوەڕۆ سەرقاڵی حیساب و کیتاب بوو: چەند فەرسەخیان ڕێگا بڕیوە، هەتا یەکەم مەزڵ، چەند فەرسەخی ماوە، مەودای گەیشتن بە یەکەم شار چەندەیە، دەبێ چەند فەرسەخی دیکە ڕێگا ببڕن تــاکوو بــگەنە یەکەم شــوێنی وچــانگرتن و پشــوودان، هەتــا کــاتی چــایی عەسرۆژە دەبێ چەندە ڕێگا ببڕن، هەتا گەیشتنە ئیستاورۆپیل چەندەیان ڕێگــا مــاوە، ســـەرجەم مەودای ڕێگــای ســـەفەرەکەیان چەنــد فەرســـەخە و چەندەیان بڕیوە و چەندی ماوە. لەگەڵ ئەوەشدا بیری دەکردەوە چەندە لەو پارەیە دەبێ بۆ قەرزوقۆڵە دابنێ و چەندە لە داهاتی مانگانەی دەبێ بۆ خەرجی لە بەرچاو بگرێ. لای ئێوارە، دوای خواردنەوەی چایی عەسرۆژە حیسابی کرد کە هەتا گەیشتنە ئیستاورۆپێل لە یازدە فەرسەخی ڕێگا حەوت فەرسەخیان ماوە و قەرزەکانی لە دوای حەوت مانگ، دەبێ یەک لە هەشتی تەواوی داهــاتەکەی خــۆی بــۆ تەرخــان بکــات. وردەوردە هێــور بــۆوە و ڕووپۆشەکەی لە خۆی پێچا و لە نێوەڕاستی عارەبانەدا تخێڵ بوو و خەوی لــێکەوت. خەیاڵەکـــانی ئێســـتا بەرەو داهـــاتوو فڕیبـــوون و لە قەفقـــاز دەسووڕانەوە. تەواوی خولیاکانی داهاتووی لەگەڵ وێنەی «ئامالاتبەگ»، ژنانی چێرکس، کوێستانەکان، شیو و دۆڵ، سێڵاوی بەتەوژم و مەترسی ئاوێتە بووبوون. هەموو ئەمانە لێڵ و تەمومژاوی بوون؛ بەڵام شانازیی هەڵخەڵەتێنەر و هەڕەشەی مەرگ، مەزە و تامی ئەو داهاتووەن. هێندێ جار بە بــوێرییەکی بــێوێنە و وزەی سەرســـووڕهێنەر دڵــی تــاقمێکی زۆر لە دەشتەوانانی دەڕفاند و دەیکردنە لایەنگری خۆی؛ بڕێجاریش خۆی دەبووە دەشــتەوان و چیانشــین و شــان بە شــانی ئەو خەڵــکە خەبــاتی دەکــرد و لە هەمــبەر ڕووســـەکاندا بەرگریــی لە ســـەربەخۆیی خــۆی دەکــرد. کاتێــک وردەکارییەکـــان لە بەرچـــاوی زەق دەبـــوونەوە، لەو نێـــوانەدا دۆســـت و

ناسـیاوانی کـۆنی مۆسـکۆی دەدی. ئەلکسـاندر ب... لە نێـو ئەوانـدا بـوو و هێنـدێجار لەگەڵ ئەو، هـاوڕێ لەگەڵ ڕووسـەکان یـان هـاوڕێ لەگەڵ چیانشـینان شـەڕی دەکـرد. تەنـانەت ڕوون نەبـوو چـۆن ئاغـای کاپێـل کە بەرگـدروو بـوو لەو سـەرکەوتنەی ئەودا بەشـداری دەکـات. ئەگەر هاوکـات لەگەڵ ئەو بیر و خەیاڵانە شـەرمەزاری و بێهێزی و هەڵە سـەریان هەڵدایە، نەیاندەتوانی لە سەر باڵی ئەو خەیاڵە شیرینە دایگرن. دیارە لەوێش لە نێو شاخ و داخ و سێلاو و ژنانی چێرکس و مەترسییەکان، ئەم هەڵانە دووپات نابنەوە. خولیایەکی دیکەش هەیە کە لە هەمووان شیرینترە و لەگەڵ هەموو خەیاڵەکانی ئەو لاوە تێکەڵ دەبێ. ئەم خولیایە، خولیا و ئەشقی ژنە. لەوێ، لە نێـو ئەو شـاخ و کێـوانە، ئەم ژنە لە زەینیـدا وەکـوو ژنێکـی خزمەتکـاری چێرکس بە لەشولاری لەبار و پرچی درێژ و چاوی شینەوە، ڕۆحسووک و گوێڕایەڵ دێتە بەرچـاو. ئـۆلێنین لە نێـوان ئەو شـاخ و کێـوانەدا، چـاوی بە کەوێڵێکـی هەژارانە دەکەوێ و لە بەردەرگـای کەوێـڵەکە ئەو چـاوەڕوانییەتی، ئەمـیش لەگەڵ ئەوەی شـەکەت و مانـدووە، خوێنـاوی و تـۆز لێنیشـتوو، بە نێوچـاوانی کراوە و شـاد بە هـۆی شـانازییەوە، دەچـێ بۆ لای. ئەم ئاشـقانە ماچەکانی و باوەشـی و دەنگە نەرمەکەی و نەرمونیـانی و کەوی بوونی ئەو هەسـت پێدەکـا. ئەو ئـافرەتە شـۆخێکی دڵـڕفێن و نەخوێنـدەوارە، سـرک و ناسـک و ئاسکئاسـاییە. لە شـەوانی درێـژی زسـتاندا فێـری خوێنـدنەوە و نووسـینی دەکـا. ئەو زۆر بەهـۆش و خـاوەن مـرخە و بە زوویـی زانیـارییە پێویسـتەکان فێـر دەبێ. بۆ دەبێ وا نەبـێ؟ ئەو دەتـوانێ بە ئاسـانی زمـانە بیانییەکـان فێـر بـێ، دەتـوانێ شـاکارەکانی ئەدەبـی فەڕەنسـا بخـوێنێتەوە و تێیبگـا. بـۆ وێـنە دەبـێ حەز بە خوێنـدنەوەی نـۆتردام دۆپـاری بکـات. ئەو تەنـانەت دەتـوانێ بە زمـانی فەڕەنسـی قسـە بکـات. لە کـۆڕ و میوانیـدا بە قوڕمساخییەکی سروشتییەوە دەتوانێ وەکوو خاتوونێکی خانەدان بەشداری بکات. ئەو دەتوانێ زۆر بە ئاسانی و بە توانایییەکی ئاشقانەوە گۆرانی بڵێ. لە دڵـی خۆیدا گـوتی: «ئـاخ! لەو گەوجێتییە!» ئێسـتا عارەبانەکەیـان گەیشـتە

وێستگەیەکی پۆست. دەبێ ئەسپەکان بگۆڕن و پارەیەک بە مەیتەری ئەسپەکان بدەن. بەڵام سەرلەنوێ بیر و خەیاڵی گەوجانە کە ماوەیەک لەمەوبەر مێشکی خستبووە گێژەنەوە و لە سەری دەرکردبوون، دیسان خۆیان لە مێشکی هاڵاندەوە. هەمیسان ژنانی چێرکس و ناوبانگ و شانازی و گەڕانەوە بۆ ڕووسیا و نیشانەی ئاجوودان و ژنی دلڕفێن هاتنە بەرچاوی. دیسان بە خۆی گوت: «بەڵام ئەشق بوونی نییە. کاری خەڵک هەمووی گەوجێتییە. شەش‌سەد و حەفتا و هەشت ڕۆبل؟ وڵاتی بەزیویش کە بۆ زیاتر لە تەواوی ماوەی تەمەن ماڵوسامانی بە من بەخشیوە؟ لە ڕاستیدا جوان نییە بە تەنیایی کەڵک لەو ماڵوسامانە وەرگرم. دەبێ دابەش کرێ، بەڵام بە سەر کێدا؟ شەش‌سەد و حەفتا و هەشت ڕۆبل بۆ کاپێل، پاشان بزانین چۆن دەبێ... .» ئێستا بیر و خەیاڵی ئاڵۆز و تەم‌ومژاوی خۆیان لە مێشکی هاڵاندبوو و تەنیا پرخەپرخی گەنجانەی ژانۆ بوو کە نەیدەهێشت خەوی لێبکەوێ. دوای ماوەیەک دەگەنە مەزڵێکی تر و لەوێ دەبێ عارەبانەکەیان بگۆڕن و درێژە بە سەرەفەکەیان بدەن.

بەیانی ڕۆژی دوایی، دیسان ئەو شتانە دووپات بوونەوە! هەر ئەو مەزڵانە و چایی و گۆڕینی ئەسپ، قسە کردن لەگەڵ ژانۆ و خەون و خەیاڵی لێڵ و وەنەوزی کاتی عەسر و خەوی پچڕپچڕی گەنجانە لە کاتی ڕێگابڕینی شەوانەدا.

# سیٚ

ئۆلێنین هەتا زیاتر لە ڕووسیا دوور دەکەوتەوە، بیرەوەرییەکانیشی بەو شێوەیە مەحاڵ دەهاتە بەرچاوی؛ هەتا زیاتر لە قەفقاز نزیک دەبۆوە، دڵیشی سووکتر دەبوو. هێندێ جار بیری دەکردەوە: «بۆ هەمیشە بڕۆم و ئیتر نەگەڕێمەوە، وەها خۆم ون بکەم کە ئیتر خەڵک چاویان پێم نەکەوێتەوە. ئەم کەسانەی لێرە دەیانبینم، وەک خەڵکانی تر ناچن. هیچکامیان من ناناسن، هیچکامیان ناتوانن لە مۆسکۆ، لە کۆڕێکدا من ببیننەوە کە سەردانی دەکەم، یان سەبارەت بە ڕابردووی من شتێک بزانن. لەم کۆڕانەشدا هیچکەس نازانێ من لە نێو ئەو خەڵکەدا چیم کردووە. .» لە نێو ئەو بوونەوەرە تووڕە و تۆسنانەدا کە لە ماوەی ڕێگادا دەیدی، جۆرێک هەستی نوێ کە لێوڕێژ بوو لە ڕزگاری لە هەموو ئەو گرفت و تەنگوچەڵەمانەی لە ڕابردوودا تووشی ژیانی بووبوو. ئەو خەڵکە بە هیچ شێوەیەک هاوشان و هاوشێوەی ئاشناوڕۆشناکانی مۆسکۆی نەبوون. ئەم خەڵکە هەتا زیاتر بە ڕقدا دەچوون، شوێنەواری ژیار لە نێویاندا کەمتر وەبەرچاو دەهات و ئەم خۆی ئازادتر و سەربەستتر دەدی. ئیستاورۆپێل، کە دەبوو پێیدا تێپەڕێ، تووشی دەردەسەری کرد. تابلۆی دووکانەکان و تەنانەت ئەو تابلۆیانەی بە زمانی فەڕەنسی نووسرابوون، ئەو خاتوونانەی لە نێو فایتوونی گەورە و سەرئاوەڵادا دانیشتوون و بە لایاندا تێدەپەڕین، هێلینگەی کرێ کە لە گۆڕەپانەکە ڕاوەستابوون، شەقامێکی پڕ لە دار و سەیرانگایەک، پیاوێکی باڵتە لەبەر بە شاپۆ[3]یەکەوە لە شەقامەکە پەڕییەوە و چاوی لە مسافیرەکان دەکرد، هەموو ئەوانە تەمی خەمێکیان بە سەر دڵیدا کێشا.

---

٣ مەبەست کارمەندی دایرەیە.

«ڕەنگە ئەم کەسانە یەکێک لە هاوڕێکانی من بناسن! .» دیسانیش کەوتەوە بیری باشگا و بەرگدروو و قومار و هاونشینەکانی خۆی... بە پێچەوانە، دوای ئەوەی لە ئیستاورۆپێل تێپەڕین، بارودۆخەکە زۆر خۆشتر بوو. هەموو شتێک لەگەڵ ئەوەدا کێوی و کەوی نەکراو بوون، بەڵام جوان و شەڕانییان دەنواند. ئۆلێنین شاد و دڵخۆش بوو. هەموو کازاخەکان و پۆستەچی و بەرپرسانی پۆست، لە بەرچاوی، سادە و ساکاریان دەنواند و هێندە لە دڵەوە نزیک بوون کە دەکرا گاڵتە و گەپیان لەگەڵ بکات. کەوتە قسە لە گەڵیان، بێئەوەی پێویست بێ لەمەڕ کاروبارەکانیانەوە پرسیاری دەکرد، هەموو ئەوان بەشێک لە ئەندامی مرۆڤایەتی بوون کە ئۆلێنین بێئیختیار خۆشی دەویست و دەیپەرەست، هەموو ئەو خەڵکەش بە چاوی ڕێز و خۆشەویستییەوە لەویان دەڕوانی و بە ئامێزی گەرموگوڕەوە وەریانگرت.

لە ناوچەی کازاخەکانی دەن، دیسان عارەبانەکەیان بە هێلینگەیەک گۆڕییەوە؛ دوای ئەوەی لە ئیستاورۆپێل تێپەڕین، هەوا وردەوردە بەرەو گەرمی دەچوو و ئۆلێنین ڕووپۆشەکەی لە بەری داکەند. لێرە بەهار بوو، بەهارێکی خۆش و دڵگر کە ئۆلێنین قەت چاوەڕوانی ئەوەی نەدەکرد.

لێرەوە ئیتر چوونە دەرێ لە گوند بە شەودا قەدەغە بوو، لە ئێوارە بە دواوە دەیانگوت مەترسیدارە. ژانۆ وردەوردە ترسی لێ نیشتبوو، تفەنگێکی پڕ هەمیشە لە نێو هێلینگەکەدا بوو. ئۆلێنین ئەوەی پێ خۆش بوو و تۆزێ دڵی حەسایەوە. سەرۆکی پۆست باسی پیاوکوژییەکی ترسناکی بۆ کردبوو کە ماوەیەک لەمەوبەر ڕووی دابوو، ئۆلێنین بەردەوام بیری لە کوێستانی پڕ بەفر و هەرەس دەکردەوە کە بۆیان باس کردبوو و حەزی دەکرد ببینێ، لە دڵی خۆیدا گوتی: «چاکە، گەیشتین! تازە خەریکە دەگەینە کوێستان.»

ڕۆژێک دەمەو ئێوارە، پۆستەچییەکی نووقایی[٤] بە خەرەزەنگەکەی خۆی ئاماژەی بە کوێستانی پشت هەورەکان کرد. ئۆلێنین بە تامەزرۆیییەوە چاوی لەو شوێنە بڕی. بەڵام هەموو شتێک تاریک و لێڵی دەنواند و هەور

٤ یەکێک لە عەشیرەتەکانی تورک.

هەتا نێوقەدی کێوەکانی داپۆشیبوو. ئۆلێنین شتێکی خۆڵەمێشین و سپی و شەپۆلئاسای دی، ئەگەرچی زۆری هەوڵ دا بەڵام نەیتوانی هیچ جوانییەک لەو کێوانەدا ببینێ کە ئەو هەمووەیان تاریف بۆ کردبوو. بیری کردەوە کە کوێستان و هەورەکان زۆر شێوەی یەکتر دەدەن و جوانیی لە ڕادە بەدەری کوێستانی پڕ بەفر ڕاست وێنەی مۆسیقای باخ و ئەوین، خەیاڵاوییە، کە ئەو قەتی بڕوا پێی نەبوو. ئیتر چاوەڕوانی ئەوە نەبوو کوێستان ببینێ. بەڵام سبەینێی ئەو ڕۆژە، کەڕەی بەیانی، لە سەرمانا خەبەری بۆوە و زۆر بەبێ‌وازی چاوێکی لە دەستەڕاستی خۆی کرد. هەواکەی ساو بوو. لە ناکاو لە دوورەوە بارستاییەکی گەورەی سپی و بێ‌پەڵە و ڕەشانگی دی کە لێوارەی ناسکیان هەبوو، دەتگوت دەستی هونەرمەندێکی خاوەن زەوق، لە ئاسمانی بێ‌سنووری دابڕیون. کاتێک مەودای نێوان خۆی و کێوەکان و ئاسمانی بۆ دەرکەوت، کاتێک لە بەرزایی بێ‌وێنەی کێوەکان تێگەیشت، کاتێک ئەو جوانییە بێ‌سنوورەی هەست پێ‌کرد، لەوە ترسا کە ئەوەی بە چاو دەیبینێ تاپۆ و تارمایی یان خەیاڵ بێ. تەکانێکی لە خۆی دا کە خەبەری بێتەوە. کێوەکان هەروا لە جێی خۆیان چەقیبوون.

لە پۆستەچیی پرسی: «ئەمە چییە، ئەوانە چین؟»

- کێون.

ژانۆ گوتی: «منیش ماوەیەکە چاویان لێ‌دەکەم، زۆر سەیرە! لە شاری ئێمە کەس باوەڕ ناکات و شتی وای نەدیوە.»

تێپەڕینی ترۆئیکا بە جادەی بێ‌کەندولەنددا، کێوەکانی بە لووتکەی مەیلەوسوور و دروەشاوە لەبەر پڕشنگی خۆر، بە دەم ئاسۆوە بە توندی ڕادەدا. لە سەرەتادا، ئەو کێوانە بوونە هۆی سەرسووڕمانی ئۆلێنین، بەڵام دواتر شادییان لە دڵی گێڕا. پاشان کە زۆربەی ئەو زنجیرەکێوانەی دی کە بە بەفر داپۆشرابوون و لە کێوە ڕەشەکان جیا نەدەبوونەوە، بەڵکوو ڕاست سەریان لە ئەستێپ هێنابووە دەرێ و بەرەو ناوچە دوورەدەستەکان هەڵدەهاتن، دیتی وردەوردە ئەم جوانییانە خەریکن شوێنی لە سەر دادەنێن و

کێوەکان هەستیان دەبزواند. لەم ساتەوە هەرچی دەیتوانی ببینێ و بیری لێ بکاتەوە و هەستی پێ بکات، هەموویان بۆ ئەو خاوەنی دیاردەیەکی نوێ، دیاردەیەکی تووڕە و پڕشکۆ بوون. بیرەوەرییەکانی مۆسکۆ، شەرمەزاری و پەژیوانی، خەیاڵی پیس و ناحەز سەبارەت بە قەفقاز، هەموو ئەوانە یەکجێ لە سەر لاپەڕەی خەیاڵی بزر بوون. دەنگێکی ڕازاوی پێی دەگوت: «ئێستا خەریکە دەست پێ‌دەکا! .» جادە، بە قەراغ چۆمی تەرەکدا[5] تێدەپەڕی و ستانیتسا[٦] و دانیشتوانی ئەم مەڵبەندە، ئیتر شتێکی ڕاستەقینە بوون. ئەو چاوی لە ئاسمان دەکرد و بیری لە کێوەکان دەکردەوە! ئێستا دوو ئەسپسواری قازاخ بە لایاندا تێپەڕین، تفەنگەکان لە نێو بەرگی چەرمیدا بە شانیانەوە هەڵدەکان، ئەسپەکان لاق و گوێزینگی ڕەش و خۆڵەمێشینیان بە ڕێکوپێکی هەڵدێنا و دایان‌دەنایەوە؛ دیسان شاخ و کێو!... لەوبەری ڕووباری تەرەک دووکەڵ لە ئائوولێکەوە[٧] بەرەو ئاسمان هەڵدەچوو. دیسان شاخ و کێو!... خۆر هەڵاتبوو و پڕشنگی خۆر بە سەر سنگی ڕووباری تەرەکەوە کە ئەمبەرەوبەری قامیشەڵان بوو، دەدرەوشایەوە. دیسان شاخ و کێو! عارەبانەیەک لە ستانیتسایەک هاتە دەرێ، چەن ژن، ژنانی جوان و شۆخوشەنگ، عارەبانەکەیان لێ‌دەخوڕی. دیسان شاخ و کێو!... «ئەبرەکەکان[٨] لە ئەستێپ بۆسە دەنێنەوە و من دەڕۆمە پێشێ، من لێیان ناترسم، من خاوەنی تفەنگ و وزە و توانا و گەنجێتیم.» دیسان شاخ و کێو!...

---

5 terek

٦ Stanitsa بە گوندی کازاخەکان دەڵێن.

٧ Aoul بە شارۆچکەی ناوچەیی دەڵێن

٨ Abrak خەڵکی غەوارەی ناوچەکە

# چوار

هەردوو بەری ڕۆخی ڕووباری تەرەک کە ستانیتساکانی کوێستانی لەوێ هەڵکەوتــوون، لە مەودای نزیــک هەشــتا وێرســتدا[9] لە بــاری زەوی‌وزار و دانیشــتووانەوە خــاوەنی بــارودۆخێکی یەکســانە. ڕووبــاری تەرەک کە کازاخەکـان لە کوێسـتان جیـا دەکـاتەوە، پێچەڵاوپـووچ و خـوڕ و بەلـرفەیە، بەســتێن و پانــاوکی چــۆمەکەش زۆرە و هەردوو بەری ڕۆخەکە لــم و خیزەلانی مەیلەو خۆڵەمێشی ڕاخراوە و پەڵەپەڵە گیاوگژی لە سـەر ڕسکاوە. ڕۆخی چەپی ڕووبارەکە کەندەلانێکی نـزم و گرنجگرنجە. چۆمەکە هەمیشـە بەشـێکی ئەم لێـوارەی ڕۆخە دەخـواتەوە کە بـنگەڕێکە پـڕ لە دارە بەڕووی سـەد سـاڵە و سپیداری پیر و هەڵۆڵ، شـەپۆلەکان خەڵف و نەمـام و خیـز و خۆڵەکەی لەگەڵ خۆیـان ڕادەمـاڵن. دەسـتی ڕاسـتی ڕۆخەکە، چەنـد ئـائوولی بێـدەنگ و ئـارام و لەگەڵ ئەوەشـدا ئـاڵۆز و شـێواوی لـێ هەڵکەوتـووە؛ لای چەپـی ڕۆخەکەش نـزیکەی نیـو وێرسـت دوورتـر لە ڕووبـارەکە، گونـدی کازاخەکـان هەڵکەوتـوون کە هەر کامەیـان حەوت هەشـت وێرسـت لە یەکتـر دوورن. پێشـتر زۆربەی ئەو گونـدانە لە سـەر لێـواری چۆمەکە بـوون، بەڵام تەرەک هەمـوو سـاڵێ بەهـاران، بەرەو لای بـاکوور کـلا دەبـێ و لێوارەکـان دەخواتەوە و وردەوردە لە ماڵەکان نزیک دەبێتەوە، بۆیە خەڵکی ناچار بوون گوندەکان چۆڵ بکەن و لرفەی لافاو، دار و پەردووی مـاڵە چۆڵەکانی لەگەڵ خـۆی ڕامـاڵی، بە چەشـنێک کە ئێسـتا لەوێ جگە لە هێنـدێ بەردی بنـاغە و دیــواری کــۆن و بەردیــن کە ڕەگ و ڕیشــەی دڕک و گیــا باوەشــی لــێ وەرهێنـاون و بـاخی هەرمـێ و هەڵـووچە ڕەشـە و سـپیداری ئیتالیـایی کە لە

---

9 یەکەی پێوانی قەدیم لە ڕووسیا، ١٠٦٧ میتر

نێویاندا هەموو جۆرە قەرسیل و ڕێزەڵە مارانەیەکی لێ ڕواوە و بە ساقەتەی دارەکانـدا هەڵـگەڕاون، هـیچ شـتێکی تـر وەبەرچـاو نـاکەوێ. هـیچکەس لەوێ نیشتەجێ نییە و تەنیا لە سەر ڕمڵی نەرم و شێدار جێگا پێی مەڕەکێوی و گـورگ و کەروێشـک و مریشـکەکێوی کە حەز دەکەن لەو کەنـاری چـۆم و شوێنە زەنوێرە بژین، دەکەوێتە بەرچاو. تووڵەڕێیەک کە لە گوندێکەوە تاکوو گوندێکی تـر وەک مـار بە سـەر عەرزیدا ڕاکشـاوە، لە نێو دارستانەکەوە بە قەدرایـی مەودای تیرێـک تێـدەپەڕێ. دەوروبەری ڕێگـاکە چەنـد مـۆڵگەی کازاخەکانی لێیە کە چاوەدێریی نـاوچەکە دەکەن. لە نێو ئەو مۆڵگانەدا چەند برجی چکۆلە ساز کراوە کە چەکدارە کازاخەکان لەوێدا ئێشک دەدێرن. تەنیا ملکی کازاخەکان، پەڵەزەوییەکی قۆپی و پڕدار و درەختە کە ئەویش تەنیا شەشسـەد مەتـر درێژاییەکەیەتـی. لە لای باکووریشـەوە، تەپـۆڵکە لمەکـانی ئەسـتپ، نووقـا یـان مـوزدۆک[10] هەڵکەوتـوون کە هەتـا هەرێـمە دوورەکـان درێــژەی هەیە و خــودا دەزانــێ لە کــوێ دەگــاتە ئەســتپی تورکمــان و هەشــتەرخان و زەوی‌وزاری قیرقیزەکــان. لە باشووریشــەوە، ئەوبەری ڕووبارەکەی تەرەک، کێوی چیچینیای مەزن و زنجیرەچیای کۆچکالۆسـۆڤ و کوێستانی ڕەش و زنجیرەکێوێکی تر و دوای ئەویش کوێستانی پڕ لە بەفر هەڵکەوتووە و ئەگەرچی دیار و بەرچاوە، بەڵام هێشتا پێی هیچ مرۆڤێکی پێ نەگەیشـتووە. لەو نـاوچەیە کە زەوی‌وزارێکـی پڕپیـت و بەرەکەتـی هەیە و لێڕەوارەکەی پڕە لە گیاوگژ و میوەی بەکەڵک، لە دێرزەمانەوە کە هیچکەس وەبیـری نـایە، هـۆزێکی شـەڕخواز دەژیـن، تیـرەیەکن جـوان و قـاڵبوو لە دەمارگرژیی ئایینی ڕووسیدا کە پێیان دەڵێن کازاخی لووتکەنشین.

سـاڵانێکی دوور و درێـژە کە ئەژدادی ئەوان لە ڕووسـیا تەرە بـوون و لە پشـت تەرەک، لە نێـو شـاخ و لێـڕەواری چێچێنیەکانـدا نیشـتەجێ بـوون، ئەو شـوێنەش یەکەم کێوەکـانی سـنووری چێچێنیـای گەورە بـوو. چـونکە لە نێـو چێچێنیەکاندا ژیـاون، لەگەڵیـان تێکەڵ بـوون و داب‌ونەریت و شـێوەی ژیـانی

10 Mosdok

ئەوان و دانیشتووانی کوێستان فێر بوون، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەوپەڕی سادەیی‌یەوە زمانی ڕووسی و مەزهەبی کۆنی خۆیان پاراستووە، لە نێو ئەوانەدا باوەڕێک ئێستاش برەوی هەیە کە تیزار ئیڤان، هاتووە بۆ ڕۆخی تەرەک و کەیخودا و ڕیش‌سپییەکانی دانیشتووی لووتکەی چیای بانگ کردووە بۆ لای خۆی و زەوی‌وزاری بەری ڕووسی تەرەکی پێ بەخشیون و هانی‌دان کە بە شێوەیەکی دۆستانە و دڵسۆزانە پێکەوە بژین. لەگەڵ ئەوەشدا بەڵێنی پێ‌دان کە بۆ گۆڕینی مەزهەب و گوێ‌لەمستی حکوومەت گوشاریان بۆ ناهێنێ و دەتوانن ئازادانە لەو شوێنە بژین. بنەماڵەکانی کازاخ هەتا ئەمڕۆ خزمایەتیی خۆیان لەگەڵ بنەماڵەی چێچێنیەکان بە گەرم‌وگوڕی ڕاگرتووە و ئەشقی ئازادی و ساکاری و شەڕ و تالان کار و پیشەی هەمیشەیی‌یانە و خوویان پێ گرتووە.

ڕووسیا تەنیا لە باری نەرێنییەوە کاریگەریی لە سەریان بووە و ئەو کارتێکەرییەش بە شێوەی بەرگری کردن لە ئازادیی هەڵبژاردن و دەست بە سەرداگرتنی گازەنگی کلێسەکان و دانانی مۆڵگەی سەربازی لە ناوچەکە دێتە بەرچاو. ئەگەرچی کازاخەکان زۆریان ڕق لەو جیگیتە[11] چیانشینانەیە کە براکانی ئەوانیان دەکوشت، بەڵام لە ناخی دڵەوە نەفرەتیان لەو ڕووسیانەش دەکرد کە لە نزیک ئەوان خێوەتیان هەڵدابوو و بۆ پارێزگاری لە گوندەکەیان هاتبوون و بۆنی تووتنەکانیان ماڵ و کۆڵانەکانیانی دادەگرت. ئەوان ڕێز بۆ دوژمنە چیانشینەکان دادەنێن، بەڵام چاویان بەرایی نادا ئەو سەربازە زاڵمانە ببینن کە غەوارەن و هاتوون بۆ داگیرکردنی ئاو و خاکەکەیان. لە سەریەک گوندنشینی ڕووسی، لە بەرچاوی کازاخەکان کەسانێکی نامۆ و سووک‌وچرووکن، دڕندە و بێ‌بەزەیین، بۆیە وێنەی ئەوانیان لە کەسایەتیی دێوەرە گەڕۆکەکان، یان خێڵی ئەو ڕووسە چکۆلانانەدا دەدی کە لە ناوچەی کازاخەکان بە چاوی سووک لێیان

---

١١ جیگیت بە زمانی ناوچەیی یانی جوامێر و بەجەرگ

دەڕوانـین و پێیـان دەگـوتن شـاپوال.[12] بـۆ تەڕپۆشـی کازاخەکـان لاسـاییی چرکسییەکان دەکەنەوە، چەکوچۆڵی باش لە چیانشینەکان دەکڕن، باشترین ئەسـپیش لە چیانشـینەکان دەکـڕن یـان لێیـان دەدزن. کـازاخێکی ڕەسـەن شـانازی بە خـۆیەوە دەکـا کە زمـانی تـورکی بزانـێ و کاتێـک کەیفـی سـازە تەنـانەت لەگەڵ براکەشـی بە تـورکی قسـە دەکـات. لەگەڵ ئەوەشـدا کە ئەم نەتەوە چکۆلە مەسیحییە، بۆ ئەم سووچە تەریکەی دنیا پەڕەوازە بوون و لە نەتەوەی موسوڵمانەوە بگرە هەتـا نیوەوەحشـی و سـەرباز گەمارۆیـان داون، خۆیـان لە بـارودۆخێکی بـاش و ژیـارێکی پێشـکەوتوودا دەبیـنن و پێیـانوایە بەرزترین مرۆڤی سەر زەوی کازاخەکانن. ئەو خەڵکە جگە لە خۆیـان تەواوی نەتەوەکانی دیکەیان پێ دواکەوتووە و بە چاوی سووک لێیان دەڕوانن.

کازاخ زۆربەی کاتەکانی خۆی لە پاسگایە، یان خەریکی شەڕە، ئەو کاتەی بـۆی دەمێنێتەوە ئەویـش بـۆ ڕاو و ڕاوەماسـی تەرخـان دەکـا. دەکـرێ بڵێین هیچکات لەماڵەوە کار ناکات. زۆر بە دەگمەن لە ستانیتسا دەمێنێتەوە و ئەو کاتانەش دەڕوا بۆ گەشت و سەیران. هەموویـان لە مـاڵەوە شـەڕابیان هەیە و خـواردنەوە لێـرە زیـاتر بـۆ لایەنـی کەیـف و نەهەنـگ و لەبەرچـاو گرتنـی تەشریفاتی ئایینی، گرنگیی پێدەدرێ و واز لێهێنانی بە جۆرێک لادەری و هەڵگەڕانەوە لە دین دێتە ئەژمار.

ژن بۆ کازاخەکان کەرەسەی کەیف و خۆشڕابواردنە؛ تەنیـا کچـان مـافی ڕابواردن و کەیف و نەهەنگیان لەگەڵ پیـاوان هەیە و کاتێـک شـوو دەکەن، لە سەرەتای ژیانی ژنومێردایەتییەوە هەتـا ئەو کـاتەی پیـری کەلەلایـان دەکـات، دەبێ بە پێی ڕێسـای ڕۆژهەڵات کار بۆ مێـردەکەی بکـات و زەحـمەت بکێشـێ و بچەوسـێتەوە. ئەم ڕێسـا و نەریـتە لە لایەکەوە بە قـازانجی ژنە، چـونکە لە باری جەستەیی و ڕۆحییەوە گەشـە دەکـات و لە دەرەوە بەدەر لە دەسـەڵاتی پیاوە و لە ژیانی ماڵێشدا خـاوەنی پێگە و دەسـەڵاتێکی بێسـنوورە و زۆر لە ژنانی ڕۆژئاوا خاوەن دەسـەڵاتترە. دوور کەوتنەوەی ئەو لە ژیـانی گشـتی و

---

١٢ شاپوال لە زمانی ناوچەییدا بە مانای هەللاجە.

خووگرتن به کاری قورسی پیاوانه، پلەوپایە و دەسەڵاتی ئەوی مسۆگەر کردووه. پیاوی کازاخ ئەگەرچی لە نێو خەڵکدا خۆی لە باسی خۆمانە و باسی ژنان دەبوێرێ و بە کارێکی نەشیاوی دەزانێ، بەڵام کاتێک لە ماڵەوە لەگەڵ ژنەکەی بەرەوڕوو دەبێ و تەنیا دەکەوێ، سەرەڕای ویستی خۆی، پێملی دەسەڵاتی ژنەکەی دەبێ و موو ناپسێنێ. هەموو ماڵ و سامانەکەی، تەواوی کەرەسە و پێداویستی ماڵ، ژن دابینی کردووه و هەر ئەویش دەتوانێ ئاگاداریی لێ بکات و بیپارێزێ. لەگەڵ ئەوەشدا کازاخەکان لەسەر ئەو باوەڕەن کارکردن بۆ پیاوی کازاخ شوورەییيە و تەنیا ژنان و کرێکارانی نووقایی دەبێ کار بکەن، بەڵام ئەگەر چاوی خۆی نەقووچێنێ و خۆی گێل نەکات، دەزانێ کە تەواوی ئەو کەرەسە و پێداویستییانەی کەڵکی لێ وەردەگرێ، تەواوی ئەو شتانەی بە ملکی خۆی دەزانێ، هەمووی بەرهەمی کاری ژنە و هەر ئەو ژنەی ماڵێ، یانی دایک، یان هاوسەر، کە پیاوی کازاخ بە قەرەواش و خزمەتکاری دەزانێ، دەسەڵاتی ئەوەی هەیە پیاوی ماڵێ لە تەواوی ئەو پێداویستیانە بێبەش بکات. سەرەڕای ئەم کارە دایمی و پیاوانە و تاقەتپڕووکێنەی کە خراوەتە ئەستۆی ژن، بۆتە هۆی ئەوەی کە ژنانی ناوچەی چیانشین، ئاکارێکی پیاوانە و سەربەخۆیی‌یەکی بێوێنە بە دەست بهێنن و ئەوەش تا ڕادەیەکی زۆر وزەی جەستەیی و ئاوەزی سالم و خۆڕاگری و توانایی بڕیاردانی ئەوانی گەشە پێداوە. بۆیە ژنان زۆر لە پیاوان بەهێزتر و بەهۆشتر و جوانترن.

لەم جوانییەدا ئەوەی کە بە شێوەیەکی تایبەت سەرنجڕاکێشە، تێکەڵاوێکە لە قەڵافەتی ڕێکوپێک و لەش‌ولاری چرکسی بە خووخدەی ئازاد و بەهێزی ژنانی باکوورەوە. ژنانی کازاخ وەک چرکسییەکان جلوبەرگ دەپۆشن. کراسی تورک، بەشمیت[١٣] و چوویاک[١٤] جلوبەرگی ئەوان پێک دێنێ، بەڵام لەچکە وەک ڕووسەکان لە سەر دەپێچن و گرێی دەدەن. وردەکاری و

١٣ Bechmete جۆرێک هێلەگی کوڵە لە بەرگن سازی دەکەن.

١٤ پۆستاڵی نیوە جزمە دروسکراو لە قایشی نەرم.

پاکوخـاوێنی و تەڕپۆشـی، جـوانی و ڕێکوپێـک کردنـی مـاڵ بـۆ کـازاخ وەک خووخدەی لێ هاتووە و بە پێویستی ماڵ و ژیانی دەزانن. بۆ پێوەندی گرتن و هەڵسـوکەوت لەگەڵ پیـاوان، ژنـان و کچـان ئـازادییەکی تەواویـان هەیە و ستانیتسـای نۆڤملینسـکایا هەمیشــە وەک ناوەنـدی کەسـوکار و ئەژدادی کازاخەکـانی لـووتکەی چیـا دێـتە ئەژمـار. لەوێ هێسـتاش زیـاتر لە هەمـوو شوێنێکی دیکە، داب و نەریتی کۆن پارێزراوە و ژنانی ئەم گوندە، هەمیشـە بە هـۆی جـوانی و شۆخوشـەنگییەوە لە تەواوی وڵاتـی قەفقـازدا ناوبانگیـان هەبـووە. ئەوان بژیـوی خۆیـان لە ڕێگـای ڕەز و باخـاتی میـوە و بێسـتانی کـاڵەک و کـوولەکە و ڕاو و ماسـیگرتن و داچانـدنی گەرمەشـانی و هەرزن بەدەست دەهێنن.

نۆڤملینسکایا و ڕووباری تەرەک مەوداکەیان سێ وێرستە و لێڕەوارێکی چڕ لێکیان جیا دەکاتەوە. چۆمێک بە قەراغ ئەو ڕێگایەدا تێدەپەڕێ کە دەچێتە گونـدەکە و ئەوبەرەی دیـکەش هەمـوو ڕەز و بـاخی سـەوز و گەشـاوەیە. لەولای ئەویشــەوە کێوەکـانی ئەسـتپی نووقـا دیـارن. دەوری گونـدەکە بە مەتەرێزێکـی خـۆڵین و تەیمـانی تنگـز و تیکـان گیـراوە. بـۆ چـوونەدەرێ و هاتنەژوورێ لە ستانیتسا دەبێ لە دەروازەیەکی گەورە و کۆڵەکەدار تێپەڕێ. سـەردەرانەی دەروازەکە بە قـامیش و جەگەن داپۆشـراوە و چەنـد هەنگـاو لەولای ئەویشـەوە تـۆپێکی گەورە لە سـەر پـێچکەی داریـن دابەسـتراوە، کە نزیکەی سەد ساڵ دەبێ کەڵکی لێ وەرنەگیراوە و یەکێکە لە دەستکەوتەکانی زووی کـازاخ لە شـەڕ و بەربەرەکانێـدا و بە شـانازییەوە چـاوی لـێ دەکەن. لەبەر دەروازەکەدا هێنـدێ جـار کازاخێـک بە جلـوبەرگی سـەربازییەوە ڕادەوەسـتێ و شمشـێر لە نێـوقەدی دەدا و چەک لە شـان خەریکـی کێشکگرتنە و هێندێ جاریش کەسی لێ نییە، کێشکچییەکەش هێندێ جار چەسپ بۆ مـلازم لێدەدا کە لەوێوە تێدەپەڕێ و هێندێ جاریش ئاگای لێ نیـیە ئەفسـەر بە لایـدا تێـدەپەڕێ و چەسـپی بـۆ لێنـادا. بە بنمـیچەکەوە سـەفحەیەکی سـپی هەڵواسـراوە کە بە خەتێکـی خـۆش لێـی نووسـراوە:

«ئەژمـاری بنەماڵەکـان دووسـەد و شەسـت و شـەش؛ دانیشـتووان، پیـاو هەشتسـەد و نەوەد و حەوت کەس، ژن هەزار و دوازدە کەس.» مـاڵی کازاخەکان لەسەر داربەست بینا کراوە و زۆر لە زەوی بەرز نەکراونەتەوە و بە وردی دار و دیوارەکەیـان بە قـامیش داپۆشـیوە، سـەردەرانەی ماڵەکـان زۆر بەرزە، تەواوی ماڵەکان، تەنانەت ئەگەر تـازە سـازکراویش بن، لانـی‌کەم ڕێکوپێک و خـاوێن و خۆمـاڵین و قاڵدرمەی جوان و تەکووز، دوور لە یەک سـاز کـراون، کـۆڵانی گەورە و چکـۆڵە لە نێـوان ماڵەکانـدا هەڵکەوتـوون و گونـدەکەیان پـێکەوە گـرێ‌داوە. زۆربەی ئەو مـاڵانە پەنـجەرە گەورە و چکۆڵەکانیان بەرەو باخی سەوز و گەشاوە دەکرێتەوە و سپیدار و دارەبووز ڕاست هەڵچوون و سێبەری فێنکی خۆیان بە سـەربانی ماڵەکـان دەبەخشـن، ڕەنگێکی سەوزی تۆخیان هەیە و تێراوی لە سیمای گەڵاکانیاندا خۆ دەنوێنێ، هەروەها داری ئەقاقیا بە گەڵای گەش و تەڕچک و گوڵی سپیی بۆن‌خۆشـەوە بە دەم شـنەی شـەماڵەوە دەشـنێنەوە؛ خـۆر پڕشـنگی زێڕینـی خـۆی بە سـەر بنجی گوڵی لاولاو و بڕکەی کوولەکەسـەراوی و ڕەزانـدا دەڕێژێ کە لەبەر پەنجەرەکاندا شین بوون و تەرز و توولیان بە دار و دیوارەکاندا هەڵگەڕاوە و جوانیی ماڵەکەیان سەد هێندە لـێ کردووە. نێوەڕاسـتی گۆڕەپانی گوندەکە سـێ دووکـانی لێـیە کە قومـاش و تـووی گـوڵەبەڕۆژە و بـاقلەی سـەوز و غوراِبی دەفرۆشن. لە پشت پەرژینێکیش دوای ڕیزێک دارەکەوتـی پیر، کە لە هەموو دارەکانی تر بەرزتر و گەورەترن، مـاڵی فەرماندەی لیوا هەڵکەوتووە کە پەنجەرەکـانی دووتـایین و هەرکـام بە لایەکدا دەکـرێنەوە. بە ڕۆژدا و بە تایبەت لە ڕۆژانی هاویندا کۆڵانەکان چۆڵن. کازاخەکانیش هەمـوو سـەرقاڵی کاروباری خۆیـانن، بەشـێکیان لە سـەربازخانەن و بەشـێکی دیکەش لە مەزرا خەریکی کشت‌وکاڵن. پیرەپیاوەکان دەچن بۆ ماسی‌گرتن یان ڕاو، یان لەگەڵ ژنان لە نێو باخ و زەرحاتەکاندا کار دەکەن، تەنیا کەسانی زۆر پیر و منالانی ساوا و کەسانی نەخۆش و کەلەلا لە ماڵێ دەمێننەوە.

# شەش

پیــاوانی دانیشــتووی ستانیتســا یــان لە دەشــت و مەزرا ژیــانی خۆیــان ڕادەبوێرن یان لە سەر ئەو پۆستانە کە کازاخەکان پێی دەڵێن سەربازخانە. لووکاشکای بێباک، ئەو کوڕە لاوەی کە پیرێژنەکانی دێ باسیان دەکرد، لای عەسر، ئێشکچی برجی چکۆلەی نیژنێ پرۆتۆک[15] بوو. ئەو پۆستە ڕاست لە قەراغ ڕووبــاری تەرەک هەڵکەوتبــوو. لووکاشــکا هەنیشــکی نــابووە ســەر مشــارەی بــرجەکە و چــاوی لە خــاڵێکی دوور بڕیبــوو. جارجــار چــاوی لە خوارێ دەکرد و هاوقەتارەکانی خۆی دەدی و قسەی لەگەڵ دەکردن. ئێستا خۆر لە لووتکەی بەفرینی کێوەکە نزیک بووبۆوە و گەواڵە هەورەکانی سپی داگیرابــوو. هەورەکــان کە لە خــوار لــووتکەکەوە شــەپۆلیان دەدا، بەردەوام سێبەری چڕ و درێژی خۆیــان دەخستە ســەر پێدەشتەکە. ســەفای خۆراوا وەک شـــنەبایەکی فێنـــک ئاســـمانی داگرتبـــوو. لە لێـــڕەواری خۆڕســـک و چڕوپڕەوە هەوایەکی فێنک دەهاتە دەرێ، بەڵام دەوروبەری پۆستەکە هێشتا گەرم بوو. دەنگی کازاخەکان کە پێکەوە قسەیان دەکرد، دەبوو بە زایەڵە و لە بۆشایی ئاسماندا دەمایەوە. ڕووباری خوڕ و لێڵی تەرەک لەگەڵ لرفە و شــەپۆل و هــاژەی خــۆی زیــاتر لە کەنــدڕ و لێــواری بێجــووڵەی خــۆی جیــا دەبۆوە. ئاوی ڕووبارەکە کەمتر دەنیشتەوە و ئەمبەرەوبەری ڕۆخەکە لمێکی زەردی شێدار داپۆشیبوو. ڕاست بەرەوڕووی پۆستی چاوەدێری، لەوبەری ڕۆخەکەوە هەموو شتێک ئارام و بێدەنگ بوو؛ قامیشــەڵانی چڕ و کورتەبــاڵا، کڕ و بێخشپە، هەتا داوێنی کێوەکە خۆی ڕاکێشابوو. هێندێک لە دواترەوە، لە کەنــاری پۆســـتەکە، مــاڵانی چێکــراو بە گڵەســـوورە، بە دووکەڵکێشـــی

15 Nijne-protok

کەللەقەندی و قەمۆچکە شێوەوە و سەربانی تەخت و لووس و سواغکراو کە شارەدێی چێچێنیەکان بوو، دەهاتە بەرچاو. چاوانی زیت و وریای پیاوی کازاخ کە لە نێو برجەکەدا ڕاوەستابوو چاوی بە شوێن ئەو ژنە چێچێنیانەدا دەگێڕا کە جلی شین و سووریان لە بەردا بوو و لە مالانی بێدەنگ و دووکەڵی دەمەو ئێوارەدا دەهاتن و دەچوون.

ئەو ڕۆژە، سات لە دوای سات چاوەڕوان دەکرا کە ئەبرەکەکان لە کەناری تەرەکەوە کوتوپڕ هێرش بێنن و هەڵکوتنە سەریان. چونکە ئێستا مانگی مەی بوو و لەم مانگەدا، مێشە و دارستانەکان ئەوەندە چڕوپڕ بوون کە زۆر بە زەحمەت دەتتوانی بە نێویدا بڕۆی و ڕێدەرکەی. ئاوی چۆمەکەش وەها کەم بووبۆوە کە لە زۆر شوێنەوە دەتوانی بە بەردەباز لێی بپەڕیەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە دوو ڕۆژ لەمەوبەر پیاوێکی کازاخ لە لایەن فەرماندەی لیواکەیانەوە بە پسوولەی فەرمانێکەوە هاتبوو و لەو فەرمان و ئاگادارییەدا هاتبوو کە بە پێی ئەو زانیارییانەی کە دیدەوانەکان داویانە، دەستەیەکی هەشت کەسی، دەیانهەوێ لە ڕووباری تەرەک بپەڕنەوە. هەربۆیە پێویست بوو زۆر بە وریاییەوە کێشک بدێرن و چاوێکیان بکەن بە چوار چاو. بەڵام لە سەربازگەکەدا هیچ چەشنە پارێزگارییەکی تایبەت و چاوەدێریی ورد و باری نائاسایی لە بەرچاو نەگیرابوو.

کازاخەکان وەک ئەو کاتەی کە لە مالی خۆیان دانیشتبێتن، بێخەم و خەیاڵ خەریکی ڕاوەماسی بوون و نە چەکیان پێ بوو نە ئەسپەکانیان زین کردبوو. هێندێکیان خەریکی ڕاوەماسی بوون و تاقمێکی دیکەشیان سەرگەرمی بادەنۆشی بوون، هێندێکی دیکەشیان چووبوون بۆ ڕاو و تەنیا ئەسپی کابرای کێشکچی بە زین و پابەندەوە ئامادە لە نێو پۆلە دار هەڵووچەی قەراغ لێڕەوارەکە بەسترابۆوە. تەنیا کازاخێکیش کە بە چەک و شمشێری چێرکساوە ئامادە ڕاوەستابوو، ئەو ئێشکچییە بوو کە لەسەر برجەکە ڕاوەستابوو. ملازمێکی کەڵەگەت و بەلەباریکە کە نێوپشتی زۆر باریک و درێژ و لاق و باسکی زۆر باریک و جاڵجاڵووکەیی بوو، قۆپچەی

بەشمیتەکەی کردبۆوە و لەبەر ئیسبایەکدا دانیشتبوو و چاوی قووچاندبوو. تەوەزەل و لەشداگیراو، ئەو جۆرەی کە تایبەتی سەرۆکەکانە، هەرجارەی سەری لە سەر دەستێکی دادەنا و بێئۆقرە خۆی ئەمبارەوبار دەکرد. کازاخێکی بەساڵاچوو، بە ڕیشێکی درێژ و ڕەشەوە، کە چەند چڵی سپی لە نێویدا دیار بوو و تەنیا کراسێکی لە بەردا بوو، پشتێنێکی چەرمی ڕەشی لە سەر بەستبوو، لە قەراغ چۆمەکە دانیشتبوو و بە لەشێکی داگیراوەوە چاوی لە ڕووبارە خوڕ و کەفچڕێنەکەی تەرەک دەکرد. ئەوانی دیکەش کە گەرما جاڕزی کردبوون و ماندوو و شەکەت، خەریکی شیو کردن یان هۆنینەوەی ڕەشمەی ئەسپ بوون، یان لەسەر ڕملی گەرمی ڕۆخی ڕووبارەکە خۆیان لە گەزدا بوو و گۆرانییان دەگوت. کازاخێکی بەلەباریکە و داڵگۆشت کە بە هۆی بای وشک و گەرم، پێستی دەموچاوی ڕەش داگەڕابوو، هێندە مەست بوو لە پاڵ دیواری ماڵێکی چکۆڵەدا وەک مردوو لە سەر گازەرای پشت کەوتبوو؛ بن ئەو دیوارە هەتا دوو کاتژمێر لەمەوبەر نیسیێ بوو بەڵام ئێستا تیرێژی کلومنجڕی خۆر هەموو لەشی کازاخەکەی داپۆشیبوو و ئەوەندەی دیکە سەری پێ قورس کردبوو.

لووکاشکا، کە لە سەر برجێکی چکۆڵە کێشکچی بوو، کازاخێکی جوانچاک و خاوەنی بەژن و باڵا و قەڵافەتێکی لەبار بوو، ئەو تەمەنی نزیکەی بیست ساڵان و زۆر شێوەی دایکی دەدا. قەڵافەت و ئازای ئەندامی، سەرەڕای هێز و ورەی گەنجانە نیشاندەری وزە و هێزێکی بەرزی ڕۆحی بوو. ئەگەرچی ماوەیەکی زۆر نەبوو چووبووە ڕیزی ئەرتەش و خزمەتی سەربازیی دەست پێکردبوو، بە دیتنی قەڵافەت و هەڵسوکەوتی ئارامیدا، دیار بوو کە ڕێوشوێنی سەربازی کاریگەریی لە سەری بووە و هەست بە غورووریێک دەکا کە تایبەتی کازاخەکانە و دەکرێ بڵێین تایبەتی کەسانێکە کە هەمیشە چەکدار و خاوەن دەسەڵاتن؛ هەروەها دیار بوو پیاوێکی کازاخە و لە بایەخی ڕاستەقینەی خۆی ئاگادارە و شانازی بە خۆیەوە دەکات. کەرکە فشوفۆڵەکەی لە چەند شوێنەوە دڕابوو، کڵاوەکەی وەک چیچینیەکان کێشابووە دواوە و پووزەوانە ماهووتەکەی لە ژێر ڕەفیچکەیدا بۆ خوارەوە دانووشتاندبوو.

جلەکانی زۆر نایاب نەبوون، بەڵام لووکاشکا هەر ئەو جلانەی بە شێوەیەکی ڕێکوپێک و تایبەتی کازاخەکان کە لاسایی کردنەوەی جیگیتی چێچێنیەکانە، لە بەر دەکرد. جیگیتێکی دروست و حیسابی هەمیشە جلوبەرگی فشوفۆڵ و شڕ و ناڕێکوپێک لەبەر دەکات، ئەوەی لەودا جێی سەرنجە، چەکی زۆر باشی لە شاندایە. بەڵام ئەو جلە شڕانە جۆرێک لە بەردەکات و ڕەخت و فیشەک و چەک بە شێوەیەک لە خۆی توند دەکات کە هەموو کەس توانایی لاسایی کردنەوەی نییە و ئەوە تەنیا دابی پیاوێکی کازاخ یان چەکدارێکی چیانشینە. لووکاشکا قەڵافەت و سەروپۆتراکی کتومت دەتگوت پیاوێکی جیگیتە. دەستی لەسەر مشتووی شمشێرەکەی دانابوو لە کاتی چاوتروکاندندا، هەمیشە چاوی لە ئائۆلی دوورەدەست دەبڕی. دەم و لووت و چاوی هیچکام بە جیا جیا جوان نەبوون، بەڵام کاتێک لە یەکەم نیگادا سەرنجت دەدا، قەڵافەتی جوان و ڕێکوپێک و ڕوخساری بەهۆش و وریای بە چاو و برۆی ڕەشەوە، هەرکەس بوایە، ناچاری دەکرد، بە پێچەوانەی ویستی خۆی بڵێ: «تیەح لەو کوڕە جوانچاکە!»

لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی بە تەوەزەلی و لەشی داگیراوەوە باوێشکی دەدا و ددانە سپی و درەوشاوەکانی دەرکەوتبوون، بە دەنگێکی بەرز و بەبێ ئەوەی ڕووی قسەی لە کەسێکی دیاریکراو بێ گوتی: «ئەو هەموو ژنە چییە لە ئائۆل کۆ بوونەتەوە، چەندە قەرەباڵغە!»

ناسایر[16] کە لە خوارەوە خەوتبوو، سەری هەڵێنا و بە پەلە چاوی لە سەرێ کرد و گوتی: «حەتمەن دەچن بۆ ئاو.»

لووکاشکا بە پێکەنینەوە گوتی: «چەند خۆشە بە تەقەی تفەنگ بیانترسێنم، جا دەکەونە تەقوڕەو و تێک دەقژقژێن!»

- تەقەی چەکەکەت ناگاتە ئەوێ.

لووکاشکا بە تووڕەیی ئەو مێشوولانەی هەڵفڕاند کە لە ڕوومەتی نیشتبوون و گوتی: «قسەی قۆڕ! تەقەی چەکی من ناگاتێ. تۆزێ ڕاوەستە. زۆری نەماوە بۆ جێژنەکەیان. من دەچم بۆ لای قیریخان و لەوێ بووزا[17] دەخۆمەوە.»

---

16 Nasaire

لە نێو دارەکانەوە خشەخشێک سەرنجی ڕاکێشان. ئەویش سەگێکی بەڵەکی نارەسەن بوو، کە لە نێو دەوەنەکاندا وەرکەوتبوو، بۆنی بە جێگا پێیەکەوە دەکرد و کلکە برینداردەکەی ڕادەوەشاند، لووکاشکا بۆی دەرکەوت کە ئەو سەگە، سەگی یەکێک لە ڕاوچییەکانی دراوسێیە، کە ناوی مامەئیرۆشکا[18] بوو؛ بە دوای ئەودا تاپۆی خاوەنەکەی ناسییەوە کە بە نێو قامیشەلانەکەدا دەهاتە پێشێ.

مامەئیرۆشکا کازاخێک بوو بە قەڵافەتێکی گەورە و زەبەلاحەوە، ڕیشی سپی وەک چۆڕی شیر و پیاوێکی چوارشانە و سینگپان بوو کە لەو ناوچە و کوێستانە هیچکەس نەبوو تاکوو ئەوی لەگەڵ هەڵسەنگێنن، هەموو پیاوێک لە چاو ئەو چکۆڵەی دەنواند. هەموو ئەندامەکانی لەشی، قایموقۆڵ و پتەو بوون لێک دەکالانەوە؛ لەسەر یەک ئەو پیاوێکی بەهێز و پۆلاکورۆژ بوو. زیپۆنێکی دڕاوی لە بەردا بوو و شاقەلەکانی بە لادا کردبوو، کەوشەکانی لە پێستی بزنەکێوی و بە چەند بەنی باریک لە لاقی توند کردبوو؛ کلاوێکی سپی لاهەڵقلیشاوی نابوو بە تیلاگی سەریەوە. جەللەی داوە کەوەکەی ڕاست و چەپ لە شانی کردبو و جووجەڵەیەک و بازێکی ڕاوی بۆ لە داوخستنی هەڵۆ لە توربێنێک نابوو و بە لاکەلەکەیدا هەڵیواسیبوو. شانەکەی دیکەشی پشیلەکێوییەکی پێوە بوو کە لە نێو دارستانەکە ڕاوی کردبوو بە گوریسێک چوار پەلی بەستبوو و وەک جانتا کردبووی بە شانیدا. خورجینێکی لە کۆڵی کردبوو کە ساچمە و باڕووت و نان و پێخۆری تێدا هەڵگرتبوو. تفەنگەکەی بە دەستەوە گرتبوو؛ کلکە ئەسپێک بۆ دەرکردنی مێش و خەنجەرێکی گەورەی کالان کونکونی خوێناوی و دوو سوێسکەی کوژراوی بە بەر پشتێنەیدا هەڵواسیبوو. کە چاوی بە پازگاکە کەوت، ڕاوەستا. پاشان بە دەنگێکی بەرز و گڕ کە زایەڵەکەی لەو لێڕەوار و دۆڵەدا دەنگی دایەوە، لە سەگەکەی ڕاخوڕی:

---

١٧ Bousa مەشرووبێکە لە تۆوی هەرزن ساز دەکرێ، تایبەتی تورکەکانە.

١٨ ئەم ناوە هەمان نازناوی Erofeiیە کە ئەویش وشەی Hierotheeیە بۆتە زمانی نەتەوەیی ڕووسی.

- هۆی لیام!

پاشان تفەنگێکی سەرپڕی گەورە کە کازاخەکان فیلینتای پێ دەڵێن، لە شانی کرد و کڵاوەکەی لە سەری داگرت. پاشان هەر بەو دەنگە بەهێز و پڕ نەشەیەوە ڕووی لە کازاخەکان کرد و گوتی: «هەک لەبەر ئەو قەڕەوڵە جوانانە مرم! بژین بۆ ئەو کوڕە باشانە!»

بەڵام لە کاتی گوتنی ئەو وشانەدا هیچ گوشارێکی بۆ خۆی نەدەهێنا، بەڵام دەنگی هەروا پڕ لە گرمە و ناڵە بوو و دەتگوت بانگ لە کەسێکی ئەوبەری ڕووبارەکە دەکات. چەند دەنگی گەنجانە، هەرکامەی لە لایەکەوە بە شادی و نەشە و ڕووخۆشییەوە وەڵامیان دایەوە:

- سڵاو مامە، سڵاو! بەخێر بێیتەوە.

مامەئیرۆشکا لەگەڵ ئەوەی بە سەر قۆڵی چێرکساکەی ئارەقەی دەموچاوە سوورەکەی خۆی دەسڕی، گوتی: «ئێوە چاوتان بە هیچ نەکەوت؟»

ناسایر، چاوێکی قرتاند و لەگەڵ ئەوەی شانی هەڵدەتەکاند و لاقی ئەمبارەوبار دەکرد گوتی: «جوان گوێ بگرە! لێرە لەسەر ئەو سپیدارە، هەڵۆیەک نیشتۆتەوە و هەموو ڕۆژێ لای عەسر ئەم ناوە پێکدا دەدا.»

پیرەپیاوی خاوەن ئەزموون گوتی: «درۆ مەکە، واز بێنە لەو قسانە.»

ناسایر، بە پێکەنینەوە گوتی: «بڕوام پێ بکە وایە، بەڕاستمە. تۆ من لە بۆسەدا دانێ، جا پیشانت دەدەم چ جۆرە هەڵۆیەکە.»

کازاخەکان هەموو دایان لە قاقای پێکەنین. ناسایر کە گاڵتەی بە پیرەپیاوەکە دەکرد، چاوی بە هەڵۆ نەکەوتبوو، بەڵام ماوەیەکی زۆر بوو لەو پاسگایە فێر بووبوون سەریان دەخستە سەر مامەئیرۆشکا و گاڵتەیان پێدەکرد، هەر جارێک کە ڕێی دەکەوتە ئەو دەوروبەرە، بەملا و بەولادا دەیانڕەتاند و ماندوویان دەکرد.

لووکاشکا لە سەر برجەکەوە گوڕاندی بە سەر ناسایردا: «هۆی وڵاخ! سەر مەخەنە سەری، بەسیکەن!»

ناسایر ئیتر نەشەی شکا و بێدەنگ بوو.

پیرەپیاو وەڵامێکی دایەوە کە هەموو کازاخەکان کەیفیان پێی ساز بوو، گوتی: «ئەگەر پێویست بێ خۆم دەچمە بۆسەوە.»

گتێکی گرت و گوتیشی: «ئەی ئێوە بەرازتان نەدیوە؟»

ملازم کە زۆری کەیف ساز بوو ئەو هەلەی بۆ هەڵکەوتووە، خۆی سەرقاڵ بکات، ئاوڕی دایەوە و لەگەڵ ئەوەی بە هەردوو دەستی پشتە درێژەکەی خۆی دەخوراند، گوتی: «وا دیارە دیتنی بەراز کارێکی ئاسان نییە! لێرە، ئەبرەکەکان ڕاو دەکەن نەک بەراز.»

پاشان لەگەڵ ئەوەی بەبێ‌هۆیی چاوی دەقرتاند و ڕیزی ددانە سپییەکانی وەدیار کەوتبوون، گوتیشی: «تۆ، مامەئیرۆشکا، خۆ سەبارەت بە ئەوان هیچت نەبیستووە! ها؟»

پیرەپیاو وەڵامی دایەوە: «سەبارەت بە ئەبرەکەکان؟ نا. من هیچم نەبیستووە. ڕاستم پێ بڵێ تۆ ئاگادارییەکت هەیە؟ من زۆرم توونییە، بۆرەپیاو، ئەگەر ڕاستت دەوێ خەریکە لە توونیاندا زمانم بشکێ و ئیتر توانام نییە بە ڕێدا بڕۆم، جارێ پەلەم لێ مەکە، بەم زووانە نێچیرێکت بۆ دێنم قەتت شتی وا نەدیبێ. جا چاوەڕێ بە!»

ملازم وا دیارە گوێی لێ نەبوو کە یەکی دیکە لە چەکدارەکان چیی گوتووە، پرسیی: «کەوایە خۆت دەچیتە بۆسەوە؟»

مامەئیرۆشکا وەڵامی دایەوە: «من دەمەوێ نزیکەی شەوێک بچمە بۆسەوە. ڕەنگە خودا بۆ جێژن نێچیرێکی باش بخاتە داومەوە، ئەگەر خودا ئەوەم بە قسمەت بکات دڵنیا بە بەشی تۆشی لێ دەدەم، بەڵێنیت دەدەمێ.»

لووکاشکا لەو سەرەوە بانگی لە مامەئیرۆشکا کرد و لەگەڵ ئەوەی سەرنجی هەموو کازاخەکانی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا، گوتی: «هۆی مامە، هۆی! بڕۆ بۆ ئەو سەرەوە، نزیک چۆمەکەی سەروو، ئەوێ ڕەوەیەکی زۆر گەورەی لێیە. گاڵتە ناکەم. ماوەیەک لەمەوبەر یەکێک لە کازاخەکانی ئێمە نێچیرێکی باشی ڕاو کرد.»

لووکاشکا ئەوەی گوت و لەگەڵ ئەوەی تفەنگەکەی لە شانیدا ڕاستەوپاستە دەکرد، بە دەنگێک کە دیار بوو پێنانەکەنێ، گوتیشی: «بڕوام پێ بکە درۆ ناکەم.»

پیرەپیاو لووتی هەڵێنا و گوتی: «بەڕاستیتە لووکاشکای دڵشێر! ئەو کازاخە لە کوێ ئەو نێچیرەی ڕاو کرد؟»

لووکاشکا گوتی: «تۆ ئەو شوێنەت نەدیوە؟ دیارە زۆر منداڵی مامە. دەنا چۆن ئەو شوێنە پێ نازانی. ڕاست لە نزیک کەندەڵانەکەیە، مامە!»

پاشان بە لەبزێکی جیددی گوتیشی: «ئێمە بە قەراغ کەندەڵانەکەدا دەڕۆیشتین کە کوتوپڕ نێچیرەکە جووڵایەوە و من چەکەکەم ئامادە نەبوو، بەڵام هەر لەو کاتەدا ئیلی ئەنگاوتی.... من خۆم شوێنەکەت پیشان دەدەم. زۆریش دوور نییە مامە. بەڵام جارێ پەلەم لێ مەکە. من هەموو ئەم ناوچەیە شارەزام.»

لەگەڵ ئەوەی بە شێوەیەکی لێبڕاوانە و تا ڕادەیەک فەرمانپێدەرانە ڕووی قسەی لە ملازم بوو گوتی: «مامە هۆسۆڤ! کاتی گۆڕینی قەرەوڵە.»

پاشان بێئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێت، تفەنگەکەی بە دەستەوە گرت و لە برجەکە هاتە خوارێ.

دوای ئەوە ملازم لەگەڵ ئەوەی چاوی لە دەوروبەر دەکرد، فەرمانی بە لووکاشکا دا: «وەرە خوارێ. گوورکا پێموایە ئێستا نۆرەی تۆیە! برۆ سەرێ.»

پاشان ڕووی لە پیرەپیاو کرد و گوتیشی: «لووکاشکا، تۆ زۆرت شوو لێهەڵکێشاوە. ئەویش وەک تۆ دایمە بەملا و بەولادا هەڵدێ. هەدادانی نییە. قەت لە ماڵێ داناکەوێ، دوێنێش نێچیرێکی ڕاو کردبوو.»

# حەوت

ئێستا خۆر ئاوا بووبوو و لارە سێبەری ئێواران بە خێرایی لە لای لێڕەوارەکەوە دەهاتە پێشێ. کازاخەکان لە دەوروبەری پاسگا کاروبارەکانیان تەواو کردبوو و بۆ خواردنی شێو لە ئیسبا کۆ دەبوونەوە. تەنیا پیرەپیاو لە ژێر سپیدارەکە مابۆوە و مات دانیشتبوو و بێچووە بازەکەی بەستبۆوە و چاوەڕوانی هاتنی هەڵۆ بوو. هەڵۆکە لە سەر دارەکە بوو، بەڵام نەیدەویست لە بێچووە بازەکە ڕۆبێ. لووکاشکا، بەبێ‌ئەوەی دەست و لاقی تێکەڵ بێ، لە نێو دار هەڵووچە چڕوپڕەکاندا خەریکی چەقاندنی داو بوو، لە سەر ڕێگای سوێسکەکان، لە بەرخۆیەوە ویرەویری دەهات و گۆرانی لە دوای گۆرانی دەیگوت و ئەوی دەیگوت نەیدەگوتەوە. سەرەڕای قەڵافەتی گەورە و شان و باهۆی قایم‌وقۆڵ دیار بوو هەموو چەشنە کارێکی قورس و گران و سووک و ئاسانی لە دەست دێ.

لە ناکاو دەنگێک هاتە گوێ کە دەیگوت: «هۆی لووکاشکا! کازاخەکان خەریکن شێو دەخۆن.»

ئەوەش دەنگی تیژی ناسایر بوو کە لە لێڕەواه چڕەکە هاتبووە دەرێ و بانگی لووکاشکای دەکرد.

ناسایر سوێسکەیەکی زیندووی نابووە بن‌باخەڵی و بە نێو دەوەنەکاندا دەیویست ڕێگا بۆخۆی بکاتەوە، پاشان لە نێو دارەکان هاتە دەرێ و پێی نایە سەر ئەو تووڵە ڕێیەی بەرەو ئیسبا دەهات. لووکاشکا دەستی لە گۆرانی گوتن هەڵگرت و گوتی: «ئا...! ئەوەت لە کوێ ڕاو کرد؟ حەتمەن لە داوەکەی منت کردۆتەوە ...»

ناسایر هاوتەمەنی لووکاشکا بوو و ئەویش وەک ئەو لە وەرزی بەهاردا دامەزرابوو، پیاوێکی کوڵەبنە و ناشیرین و ڕیوەڵە بوو. سەری لە چاو لەشی

زۆر گەورەی دەنواند و دەنگە تیژەکەی گوێچکەی پیاوی ئازار دەدا. ئەو و لووکاشکا دراوسێ و هاورێ بوون.

لووکاشکا لە سەر گیاوگژەکە چوارمەشقی دانیشتبوو، سەرقاڵی ڕێکوپێک کردنی داوەکە بوو و دەیویست لە سەوزەڵانییەکەدا بینێتەوە.

- من نازانم، ڕەنگە هی تۆش بێ.

- مەگین لە پشت کەندەڵانی نزیک سپیدارەکان نەبوو؟ ئەگەر لەوێ بێ، هی منە. دوێنێ خۆم لەوێ داوم نایەوە.

لووکاشکا هەستا و چاوی لە سوێسکە ڕاوکراوەکە کرد. دەستی بە سەرە خۆڵەمێشینە تۆخەکەیدا هێنا، سوێسکەکە لە ترسانا ملی درێژ کردەوە و گلێنەی ڕەشی لە نێو هێلوونی چاویدا سووڕاند؛ لووکاشکا بە ئارامی باڵندەکەی لە ناسایر وەرگرت.

- ئێستا چێشتێکی زۆر خۆشی پێ لێدەنێین. زوو سەری ببڕە و پەڕوپۆکەی داماڵە.

باڵندەکەی دایەوە دەست ناسایر.

- خۆمان بیخۆین یان بیدەین بە ملازم؟

- ئەمەیان هەر بۆخۆمان دەیخۆین، گوێی مەدەیە.

پاشان ناسایر گوتی: «من حەز ناکەم ئەم باڵندە بەستەزمانە سەر ببڕم.»

- بیدە بە من.

لووکاشکا چەقۆیەکی چکۆلەی لە گیرفانی دەرهێنا و خێرا هەردوو باڵی پێکەوە جووت کرد و نایە ژێر پێی. سوێسکەکە لەرزی و تەکانێکی لە خۆیدا. بەڵام لە چاوترووکانێکدا سەرە خوێناوییەکەی لە لەشی جیا بۆوە و کەوتە باڵەپڕژێ.

لووکاشکا باڵندە سەربڕاوەکەی لە سەر عەرزەکە دانا و گوتی: «بەوە دەڵێن کار. ئێستا تەڕەکەبابێکی چەور و خۆشی پێ ساز دەکەین.»

ناسایر چاوی لە سوێسکەکە کرد، لەگەڵ ئەوەی بەزەیی بە باڵندەکەدا دەهات، دەستی دا لاقی هەڵیگرت و گوتی: «جوان گوێ بگرە لووکاشکا! ئەو

نەگبەتە دەیهەوێ دیسان بمنێرێ بۆ پۆستە چکۆلەکە (نەگبەت ملازم بوو) ئەو و فۆمۆشکینی بە دوای چخیردا ناردووە، دوای من نۆبەی تۆیە. ئێمە چەند شەوە بە پێوە ڕاوەستاوین. ناوچاوانەکەی ئێمەش وایە هەمیشە ئەو کارەمان بە تووشەوە دەبێ.»

لووکاشکا بە فیتوو لێدان ڕۆیشت بۆ لای پاسگاکە و دەنگی هەڵبڕی: «لە بیرت نەچێ، دەزوو لەگەڵ خۆت بێنە.»

ناسایر بە نیشانەی ڕەزایەت سەری لەقاند.

ـ من ئەمڕۆ پێی دەڵێم، حەتمەن پێی دەڵێم.

ناسایر هەروا درێژەی بە قسەکانی دا:

ـ ئێمە پێی دەڵێین، پێی دەڵێین کە ئیتر ناتوانین و بڕایەوە! تۆش پێی بڵێ، ئەو بە قسەی تۆ دەکا. ئاخر ئەو کارە یانی چی؟

لووکاشکا کە دیار بوو لە بیری شتێکی دیکەدایە، گوتی: «ئەوەش خۆی کارێکە. گەوجێتییە گەوجێتی! ئەگەر شەوێ ئێمەی لە ستانیتسا دەرکردایە، تووشی چەرمەسەرێ دەبووین. پیاو لەوێ بە دڵی خۆی ڕایدەبوێرێ، بەڵام لێرە... بەڵام لە پاسگا یان پۆستی چکۆلە، بارودۆخەکە جۆرێکی ترە گەوجە پیاو!»

ـ تۆ دەچی بۆ گوند؟

ـ من بۆ جێژن دەچم.

لەناکاو ناسایر گوتی: «گوورکا دەیگوت لەم ڕۆژانەدا دوونیای تۆ لەگەڵ فۆمۆشکین خۆشی ڕادەبوێرێ.»

لووکاشکا ددانە سپییەکانی وەدیار خست، بەڵام بێئەوەی پێبکەنێ، گوتی: «چاوی دەرێ! پێتوایە من هێندە گێژم ناتوانم ژنێک یان کچێکی دیکە ساز کەم؟»

ــ گوورکا دەیگوت: من لەلای ئەو بووم؛ مێردەکەی لە ماڵێ نەبوو. فۆمۆشکین هات لەوێ دەستی کرد بە شیرینی خواردن. من هێندێک لەوێ مامەوە و پاشان هاتمە دەرێ. لە بەر پەنجەرەکە گوێم لێ بوو دوونیا

دەیگوت: «ئەو ڕۆیشت، بە قەرە قەمەر، با بڕوا، خۆشەویستەکەم تۆ بۆ شیرینی ناخۆی؟ بۆ خەوتن هەر لێرە بە، پێویست ناکا بڕۆیەوە بۆ مەزڵەکەی خۆتان.» منیش لە بەر پەنجەرەکە گوتم: «زۆر چاکە.»

ـ گاڵتە دەکەی!

ـ سوێندت بۆ دەخۆم کە درۆم لێ نابیستی.

لووکاشکا بێدەنگ بوو.

ـ ئەو یەکێکی دیکەی پەیدا کردووە، دەیجا چش، چاوی دەرێ! خۆ قاتی کچ نییە. ئەو نا، یەکێکی تر. ڕاستت دەوێ زۆری لێ وەڕەز بووم.

ناسایر گوتی: «ئەرێ، تۆ هەروای. تۆ دەبێ لەگەڵ ماریانکای کچی ملازم کلک تێک هاڵێنی و لەگەڵی ڕابوێری. ئەو هێشتا لەگەڵ کەس کەینوبەینی نییە.»

لووکاشکا نێوچاوانی وێکهێنا و گوتی: «ماریانکا؟ بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە.»

ـ دەی باشە، بڕۆ قسەی لەگەڵ بکە..

ـ ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ مەگین ئەم گوندە کەمی کچ تێدایە؟

لووکاشکا دیسان دەستی کرد بە فیتوو لێدان. لە بەردەرگای پاسگاکە دەهات و دەچوو و لەگەڵ ڕاوێچکە کردن و بە گۆمی خەیاڵدا ڕۆچوون گەڵای لە دارەکان دەکردەوە و لە مشتیدا هەڵیدەگوڵۆفی یان بە ددان دەیپچڕی. کاتێک بە نێو گیاوگژەکەدا تێپەڕی، لە ناکاو خەڵفێکی چکۆڵەی دی کە ساقەتەکەی لووس و بێگرێ بوو، قەڵەمبڕەکەی لە گیرفانی دەرهێنا و لە بندا ئەو خەڵفە ناسکەی بڕی و لەگەڵ ئەوەی شووڵکەکەی ڕادەوەشاند و وەک قامچی لە هەوای ژوورسەر و بەردەمی خۆی ڕادەکێشا، ڤینگەی دەهات، گوتی: «شووڵێکی باشم پەیدا کرد بۆ خاوێن کردنەوەی لولەی تفەنگەکەم و کاری شتێکیشم بۆ دەکا.»

کازاخەکان لە نێودالانی پاسگا لە سەر عەرزی دانیشتبوون و لە سەر مێزێکی پێچکە نەوی خەریکی خواردنی شێو بوون. کاتێک باسی ئێشکگرتنی

پۆستە چکۆلەکەیان دەکرد، یەکێک لەوان ڕووی لە ملازم کرد و پرسیی: «ئێستا نۆبەی کێیە؟»

ملازم وەڵامی دایەوە: «نۆبەی کێیە؟ بوورلاک لەوێ بووە.»

پاشان بەبێدڵنیا بوونی تەواو درێژەی پێدا: «فۆمۆشکینیش لەوێ بووە.»

لەگەڵ ئەوەی چاوی لە لووکاشکا دەکرد گوتی: «ئێوە هەردووکتان، تۆ و ناسایر دەبێ بچن بۆ ئەوێ. ئەرگۆشۆڤیش دەبێ بچێ. ڕەنگە ئێستا کاتی پشوودانی بەسەر چووبێ.»

ناسایر لەسەرەخۆ گوتی: «تۆ خۆت هەمیشە پشوو دەدەی. ئیتر بۆ چاوت بەرایی نادا ئەو پشوو بدات و سەرخەوێک بشکێنێ؟»

کازاخەکان دایان لە قاقای پێکەنین.

ئەرگۆشۆڤ ئەو کازاخە سەرخۆشە بوو کە لەبەر ئیسبا خەوتبوو. ئەو تازە خۆی کردبوو بە نێو دالانەکەدا و خەریکی هەڵگوڵۆفینی چاوە خەواڵووکانی بوو. هەر لەو کاتەدا لووکاشکا هەستایە سەر پێ و دەستی کرد بە خاوێن کردنەوەی تفەنگەکەی.

ملازم گوتی: «دەی زوو بن زوو! خێرا شێوەکەتان بخۆن و بڕۆن بۆ ئەوێ.»

بەبێئەوەی گوێ بداتە هیچ ڕەزایەت و ناڕەزایەتییەکی کازاخەکان، دەرگای پێوەدا. لەگەڵ ئەوەی بە ڕواڵەت زۆری هیوا بە ڕەزایەتی ئەوان نەبوو، گوتی: «ئەگەر دەستوور نەبوایە، نەمدەناردن. بەڵام بیری لێ بکەنەوە کە لە ناکاو بووزباشی لە ئاسمانەوە نازڵ دەبێ! وەک دەڵێن هەشت کەس لە ئەبرەکەکان لە چۆمەکە پەڕیونەتەوە.»

ئەرگۆشۆڤ گوتی: «کەوایە دەبێ بچین، چونکە دەستوور دراوە! لەو جۆرە کاتانەدا نابێ سەرپێچی بکەین. من پێتان دەڵێم کە دەبێ بچین.»

لووکاشکا کە بە هەردوو دەستی، کوتێکی گەورە لە گۆشتی سوێسکەکەی لە بەردەمی ڕاگرتبوو و جارێک چاوی لە ناسایر و جارێک لە ملازم دەکرد، دیار بوو هیچ حەزی لەو باسە نییە و گاڵتەی پێدەکردن. کازاخەکان هێشتا

نەچووبــوونە دەرێ، کە مامەئیرۆشــکا، کە لە خــۆڕا هەتــا شــەوێ لە ژێــر سـپیدارەکە دانیشـتبوو، خـۆی کـرد بە نێـو دالانە تـاریکەکەدا و گـوتی: «یـاڵڵا کوڕینە! با بڕۆین، منیش لەگەڵتان دێم.»

دەنگە گڕەکەی ئەو کە دەنگی هەمـوو حازریـانی خـپ کـرد، لە ژێـر مـیچە نەوییەکەدا دەنگی دایەوە: ئێوە بچنە بۆسەی چێچێنیەکانەوە، منیش بۆسـە بۆ بەراز دادەنێم.

# هەشت

بە تەواوی هەوا تاریک بووبوو کە مامەئیرۆشکا و سێ پیاوی کازاخ بە کەپەنکی ڕەشەوە و چەک لە شان لە پاسگا چوونە دەرێ و بە قەراغ چۆمی تەرەکدا کەوتنەڕێ و گەیشتنە شوێنی مەبەست. ناسایر حەزی لە ڕۆیشتن نەبوو، بەڵام لووکاشکا گوڕاندبووی بە سەریدا و هەموویان بە پەلە ملی ڕێیان گرتبوو.

دای ئەوەی ماوەیەک بە بێدەنگی ڕۆیشتن، کازاخەکان لە کەندەڵانەکە تێپەڕین و بە تووڵەڕێیەکی نێوانبڕی قامیشەڵانێکدا ڕۆیشتن کە زۆر چڕ و چڕگەن بوو و گەیشتنە نزیک ڕووباری تەرەک. لە کەناری چۆمەکە کاریتەیەکی ڕەشی ئەستوور کە سێڵاو بەرەو ڕۆخەکەی هێنابوو، لەسەر ڕملی کەنارەکە کەوتبوو و گیاوگژی تازەڕسکاوی دەوروبەری پان کردبۆوە.

ناسایر گوتی: «وا چاکە هەر لێرە بچینە بۆسەوە!»

لووکاشکا گوتی: «دەی زۆر چاکە، تۆ هەر لێرە بمێنەوە، من هەرئێستا دەگەڕێمەوە. بەپەلە دەچم شتێک پیشان پیرەپیاو دەدەم.»

ئەرگۆشۆڤ گوتی: «بۆ بۆسەنانەوە ئێرە باشترین شوێنە. هیچکەس نامانبینێ و ئێمە هەموو جێیەکمان لێ دیارە. زۆر جێگایەکی چاکە و شوێنی لەوە باشترمان دەستناکەوێ بۆ دانانی بۆسە.»

ناسایر و ئەرگۆشۆڤ کەپەنکەکانیان لەسەر ڕمڵەکە ڕاخست و لە پشت کاریتە ئەستوورەکە خۆیان مات کرد، لووکاشکایش لە پێش مامەئیرۆشکاوە دەڕۆیشت.

لووکاشکا گوتی: «ئەوەتا لەم نزیکانەیە، هێندەمان نەماوە بگەینێ، زۆر دوور نییە. ئێستا پیشانت دەدەم لە کوێوە تێپەڕیون. تەنیا من شوێنەکەی پێدەزانم.»

پیرەپیاو بە دەنگێکی لەسەرەخۆ و سرتەئاسا وەڵامی دایەوە: «زووکە پیشانمی بدە، تۆ زۆر لە خۆ دەفشی و خۆت بە پیاوێکی بەجەرگ دەزانی!»

چەند هەنگاو لەولاوەترەوە لووکاشکا ڕاوەستا، لەسەر قوولکەیەکی چکۆلە دانەوییەوە و فیتوویەکی لێدا؛ پاشان لەگەڵ ئەوەی جێپێیەکی تازەی پیشانی پیرەپیاو دەدا، گوتی: «لێرە ئاویان خواردۆتەوە، دیتووتە؟»

پیرەپیاو وەڵامی دایەوە: «خودا دەست بە عومرت بگرێ، لە نێو کونە بەراز و بن کەندەڵاندا خودا خێریکمان وەرێدێنێ و بە دەستی خاڵی ناگەڕێینەوە، زۆر باشە تۆ بگەڕێوە.»

لووکاشکا قاپووتەکەی دا بە شانیدا و بە لێواری ڕووبارەکەدا گەڕایەوە. لە کاتی گەڕانەوەدا هێندێجار بە وریایی چاوی لە لای چەپ و قامیشەڵانەکە دەکرد و هێندێجاریش لە ڕووباری تەرەک کە بە لرفە و هاژەهاژ تێدەپەڕی و شەپۆلی تووڕە سەریان بە کەندەڵانی ڕۆخەکەدا دەکێشا. بیری لە چێچێنیەکان دەکردەوە و لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەوی دیکەشیان ڕەنگە هەر لەم نزیکانە چووبێتە بۆسەوە و خەریکی خۆ مەڵاسدان بێ.» لە ناکاو خشپەیەکی بەرز لە لای دارستانەکە و خوڕێنکی چۆمەکەوە دایچڵەکاند و ناچاری کرد تفەنگەکەی بە دەستەوە بگرێ. لە خوارووی چۆمەکەوە بەرازێک بە هاسکەهاسک هات و تاپۆی ڕەشی دوای ئەوەی لە ڕووبەری ڕوون و درەوشاوەی ئاوەکە جیا بۆوە، هەمیسان خۆی کردەوە بە نێو قامیشەڵانەکەدا و لە بەرچاو بزر بوو. لووکاشکا زوو کۆلاسی تفەنگەکەی کێشا. سێرەی گرت، بەڵام فریا نەکەوت بیتەقێنێ. بەرازەکە ئیتر خۆی کردبوو بە کونەکەیدا. لووکاشکا بە تووڕەیی تفێکی کردەوە و بە ڕێگای خۆیدا ملی پێوەنا. کە گەیشتە نزیک پۆستە چکۆلەکە، دیسان ڕاوەستا و بە هێواشی فیتوویەکی لێدا. دەنگی فیتوویەک وەڵامی دایەوە و چوو بۆ لای هاوڕێکانی.

ناسایر بە تەواوی ملی بە خوزدا گرتبوو و لە حەوت ساڵان ڕاست بووبۆوە. ئەرگۆشۆڤ چوارمەشقی دانیشتبوو و بۆ ئەوەی جێگا بە

لووکاشکا بدات دانیشی، تۆزێ کشایه دواوه و گوتی: «بەڕاستی سەر ئەم پۆسته کەیفی لەلایە! بۆ کێشک جێگا لێره باشتر هەر نییە! پیرەپیاوەت برد بۆ کوێ؟ ڕێنوێنیت کرد؟»

لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی خەریکی ڕاخستنی قاپووتەکەی بوو، وەڵامی دایەوە: «پیشانمدا. بەڵام هەرئێستا بەرازێکی گەورەم هەستاند و بە قەراغ چۆم و نێو قامیشەڵانەکەدا تێیتەقاند! ئەمه دەبێ هەر ئەوه بێ. تو گوێت له خشپەی نەبوو؟»

ئەرگۆشۆڤ لەگەڵ ئەوەی خۆی له قاپووتەکەیەوه دەپێچا گوتی: «خشپەیەکم گوێ لێبوو و خێرا تێگەیشتم که دەبێ خۆی بێ. من پێموایه له تۆ ترساوه.»

ئەرگۆشۆڤ تۆزێ خۆی ئەمبارەوبار کرد و گوتیشی: «ئێستا من دەمەوێ سەرخەوێک بشکێنم. بەریبەیانی خەبەرم کەوه. پێویسته ئاگامان له یەکتر بێ. من هێندێ دەخەوم و پاشان تۆ بخەوه من کێشک دەدێرم... باشه؟»

لووکاشکا وەڵامی دایەوە: «من؟ تۆ بخەوه، من خەوم نایه.»

شەوێکی تاریک و فێنک بوو. بای نەدەهات. تەنیا له لایەکی ئاسمانی کەهوو ڕەنگەوه ئەستێره دەدرەوشانەوه. له لایەکەی دیکەوه بەشێکی زۆری ئاسمان له ئاسۆی کێوەکان بەملاوه، گەواڵه هەورێکی بێسنوور دایپۆشیبوو. ئەم هەوره ڕەشه، که لەگەڵ کێوەکان باوەشیان لێکوەرهێنابوو، بەبێئەوەی شەوبایەک سریوەی باڵی بێ، به ئارامی دەهاتنه پێشێ. بەڵام لەو دوورانەوه وردەوردە لێوارەی گەواڵه هەورەکە له ئاسمانی پڕ ئەستێره و بێپایان جیا دەبۆوه. کازاخی لاو بەرەوڕووی خۆی جگه له ڕووباری تەرەک و پانتاییەکی دوورەدەست هیچ شتێکی دیکەی نەدەدی؛ پشتسەری و دەوروبەری هەمووی سەوزەڵانی و دەوەن و گژوگیا بوو. هێندێجار بەبێ هیچ هۆیەک ئەو گیاوگژانه دەجووڵانەوه و خشەخش ساز دەبوو. له لای خوارەوە، سەره لەرزۆکەکانیان به لێواری ڕووناکی ئاسمانەوه وەک لقەداری

بەردار دەهاتنە بەرچاو. لە پێشەوە، نزیک لاقی لووکاشکا کەنارەی چۆمەکە بوو کە لە خوار ئەوەوە، سێلاو لرفە و هاژەی دەهات. دوورتریش، بارستایی بزۆک و درەوشاوەی ئاوی چۆمەکە، بە شێوەیەکی یەکهاوی بە سەر ڕۆخی پڕ لە لم و خیزەلانیدا دەخوشی و شەپۆلی دەدا. لە دوورتریشەوە ئاو و ڕۆخ و هەور هەموو پێکەوە لە تاریکیدا ئاوێتە دەبوون. بە سەر ڕووبەری ئاوەکەوە چەند سێبەری پڕ جموجۆڵ ڕەش دەچوونەوە و دەتگوت بە سەر شەپۆلی ئاوەکەدا هەڵدێن، کە چاوی خووگرتووی کازاخ ئەوانی دەناسییەوە و دەیزانی دار و دەوەنی لە ڕیشە دەرهاتوون کە لافاوەکە ڕایاندەماڵێ. تەنیا جاروبارێک برووسکەیەک درزی دەخستە بارستایی گەواڵە هەورەکان، سینگی ئاوەکەی وەک ئاوێنەیەکی ڕەش و بریقەدار وەدیار دەخست و سنووری ڕۆخەکە و خورێنکی چۆمەکەی پیشان دەدا. لەو شەوە ئەنگوستەچاوەدا بە خشەخشی گیاوگژ و پرخوهۆڕی کازاخەکان و ویزەویزی مێشوولە و لرفە و هاژەی ڕووبارەکە و تەقەی تفەنگێک لە دوورەدەستەکانەوە، یان ترپەی داڕووخانی کەندەلانی ڕۆخەکە و خۆهەڵدانی ماسییەکی گەورە و شڵپە هەستاندن لە ئاوەکە و خشەخش و هاسکەهاسکی ئاژەڵێکی کێوی لە نێو لێڕەوارە چڕوپڕەکەدا، شووشەی ناسکی شەو دەچڕژا. جارێک کوندەگایانەیەک بەسەر چۆمی تەرەکدا فڕی و لە کاتی فڕیندا لەگەڵ دوو جار باڵلێدان جارێک سەری شاباڵەکانی بە یەکدا دەدا. کاتێک گەیشتە ژوورسەری کازاخەکان، نیوەخولێکی لێدا و بەرەو لای دارستانەکە لە شەقەی باڵی دا و لە کاتێکدا گەیشتە نزیک چڵووکی دارێک، دیسان ئەو باڵلێدانەی دووپات کردەوە، بەڵام ئەمجارەیان لە پەستا باڵەکانی لێکدەدا و بەر لەوەی لەسەر پیرەدار بییەک بنیشێتەوە، بە توندی یەک دوو خولی بە دەوری لکوپەلی دارەکە لێدا.

کازاخی بەئاگا و خەوبەزێن بە وردی گوێی بۆ هەموو ئەو دەنگانە شل دەکرد و چاوی زیت دەکردەوە، هەموو جارێک تفەنگەکەی توند لە دەستی دەگرت و پشووی لە سنگیدا ڕادەگرت.

بەم شێوەیە بەتڵێکی شەو تێپەڕی و شەو زرینگایەوە. هەورە ڕەشەکە وردەوردە لەلای ڕۆژئاواوە لەبەریەک ڕەوییەوە. لە پشت گەواڵە تەنکەکانیەوە ئاسمانی پڕ هەسارە و مانگیلەی بەراوەژوو کە بە ڕەنگی زێوینەوە لە سەر کێوەکە دەدرەوشایەوە، وەدیار کەوتن. لووکاشکا هەستی بە سۆزی سەرمایەک دەکرد. ناسایر خەبەری بۆوە. یەک دوو قسەی کرد و دیسان خەوی لێکەوتەوە. لووکاشکا لەشی داگیرابوو، هەستا چەقۆکەی لە ژێر کالانی خەنجێرەکەی دەرکێشا و دەستی کرد بە تاشینی شووڵکێک کە دەیویست بیکات بە شیشی تفەنگ. بیر و خەیاڵی چێچێنیەکان و ژیان و گوزەرانیان لەو شاخوداخە چڕ و هەڵدێرە لە مێشکیدا سووڕی دەخوارد و لە بیری ئەو دەستدرێژییانەدا بوو کە پاڵەوانانی ئەو هۆزە دەیکەنە سەر ماڵ و سامانی خەڵکی ئەمبەری ڕووبارەکە و تۆزە ترسێکیان لە کازاخەکانیان نییە؛ هەروەها ترسی ئەوەی بوو ئەوان لە لایەکی دیکەوە دزە بکەن و هەڵکوتنە سەر گوندەکە. پاشان ملی هەڵێنا و چاوی لە ڕووبەری چۆمەکە کرد، بەڵام هیچ شتێکی بەرچاو نەهات. لەگەڵ ئەوەی جاروبار چاوی لە ڕووبارەکە دەکرد لە کەنارە دوورەدەستەکەشی دەڕوانی کە لە ژێر تریفەی کزی مانگدا دیار بوو. وازی لە بیر و خەیاڵی چێچێنیەکان هێنا و لە بیری ئەوەدا بوو کاتی خەبەر کردنەوەی هاوڕێکانی بێت و خۆی بگەڕێتەوە بۆ گوندەکە. وەبیر دوونیای خۆشەویست و بیچکۆڵە کەوتەوە کە ئێستا لە گوندەکەیە و بە بێزارییەوە بە گۆمی بیر و خەیاڵدا ڕۆچوو. کازیوەی بەیانی ئاسۆی ڕۆژهەڵاتی زێوئاژن کردبوو. تەمومژێکی زێوین بە سەر ئاوی ڕووبارەکەوە دەدرەوشایەوە، بارە هەڵۆکان کە زۆر لەوێ دوور نەبوون، سیڕەیان دەهات و باڵیان بە یەکدا دەدا. کەڵەشێرێک لە لای ستانیتساوە دەنگی بەرز کردەوە و دوای خوێندنی دوور و درێژی کەڵەشێرێکی دیکە هەموو کەڵەشێرەکانی ئاوایی دەستیان کرد بە خوێندن.

لووکاشکا کە شووڵکەکەی بە جوانی تاشیبوو و دەتگوت لە گەرووی مارت دەرکێشاوە، هەستی کرد پێڵووی چاوی قورس بووە، بیری کردەوە:

«کاتی ئەوە هاتووە خەبەری بکەمەوە.» پاشان ڕووی لە هاوڕێکانی کرد و هەوڵیدا بە دیتنی لاقیان بیانناسێتەوە، بەڵام لە ناکاو گوێی لە شڵپەشڵپێک بوو لەوبەری ئاوەکەوە هات، هەستی ڕاگرت، جارێکی دیکە چاوی لە ئاسۆی زیوین و کەلی ڕۆژهەڵات کرد کە لووتکەی شاخەکان لە ژێر کەوانەی سەرەوخواری مانگدا بریقەیان دەهات، هەروەها چاوی لە بەستێنی چۆمی تەرەک و ڕۆخەکە و ڕەگی ئەو دارانە کرد کە ئێستا بە جوانی دیار بوون و بە سەر سنگی ئاوەکەوە ڕادەژان. هەستی کرد جووڵانەکە هی ئەوە و تەرەک بە ڕەگوڕیشە و ساقەتەی دارەکانیەوە لە جێی خۆی نابزوێ. بەڵام ئەو بیرە تەنیا چرکەیەکی خایاند. کۆلکەدارێکی ڕەشی گەورە سەرنجی ڕاکێشا. ئەو کۆلکەدارە بە شێوەیەکی سەیر و بەبێ ئەوەی بە لادا بکەوێ یان سەرەوبن بێ، ڕاست بە نێوەڕاستی چۆمەکەدا دەڕۆیشت. تەنانەت لووکاشکا پێی وابوو ئەم کۆلکەدارە بە پێچەوانەی گەڕیانی ئاوەکە دەڕوات و دەیهەوێ بە شێوەی کەشوتووش بەرەو ڕۆخەکە مل پێوە بنێ و بەرەو لای تەپکێکی لم دەڕۆیشت.

لووکاشکا ملی هەڵێنا و گوێقوڵاخ ڕاوەستا. کۆلکەدارەکە لە گردە لمەکە نزیک بۆوە، ڕاوەستا و بە شێوەیەکی سەیر جووڵایەوە. لووکاشکا هەستی کرد باسکێک دەبینێ کە لە ژێر کۆلکەدارەکە هاتۆتەدەرێ و لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوەتا خۆیەتی، ئەبرەکێکە کە خۆم بە تەنیایی دەیکوژم!» پاشان بە هێواشی تفەنگەکەی گرتە دەستی، هەنیشکی دایە سەر سندە گیایەک و خۆی ڕاستەوپاستە کرد. کۆلاسی تفەنگەکەی کێشا و زامنەکەی ترازاند، هەناسەی لە سینگیدا قەتیس کرد و سێرەی گرت.

لووکاشکا لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەو لە خەو هەڵناستێنم.» هەر لەو کاتەشدا دڵی وا بە پڕتاو لێی دەدا کە ڕاوەستا و هەستی بۆ کوتەکوتی دڵی خۆی ڕاگرت. لە ناکاو گوێی لە شڵپەیەک بوو، کۆلکەدارەکە دیسان بە سەر ئاوەکەدا خوشی و بەرەو لای ڕۆخەکە ڕۆیشت. لووکاشکا لەبەرخۆیەوە گوتی: «نابێ بێڵم ئەمەم لە دەست دەرچێ.» لەبەر تریفەی کزی مانگەشەو

سەری کەسێکی‌تر لە نێو ئاوەکەدا کەوتە بەرچاوی، تفەنگەکەی بە شانیەوە نا و سێرەی لە سەرەکە گرت. ئەو سەرە زۆر لە لوولەی تفەنگەکە نزیک بوو. لووکاشکا لە سەرووی تفەنگەکەوە چاوی لێکرد و دڵشادانە لە دڵی خۆیدا گوتی: «ڕاست خۆیەتی، ئەبرەکێکە!» هەنیشکی دادایەوە و تفەنگەکەی ئامادە کردەوە و جاسووسەی تفەنگەکەی کە لە سەری لوولەکە هەڵکەوتبوو زۆر بە زەحمەت دەبیندرا، دۆزییەوە، بە پێی نەریتی کازاخەکان، بەو شێوەی کە لە منداڵییەوە خووی پێ گرتبوو گوتی: «بە ناوی باوک و کوڕ[19]» و قامکی بە سەر پەلاپیتکەدا نا. تریشقەی باڕووت بۆ چرکەساتێک گیاوگژی کەنار ڕووبەری چۆمەکەی ڕووناک کردەوە. دەنگی وشک و گیان‌تاسێنی تەقەکە لەو دۆڵەدا دەنگی دایەوە و لە سینگی شاخ و ڕەوەزەکانی ئەوبەری ڕووبارەکەدا بوو بە زایەڵە. کۆلکەدارەکە ئیتر بە نێوەڕاستی ڕووبارەکەدا نەدەڕۆیشت، بەڵکوو لە سەر باری گەڕیانی ئاوەکە خولی دەخوارد و خەریکی هەڵچوون و داچوون بوو. ئەرگۆشۆڤ لەگەڵ ئەوەی دەستی بۆ چەکەی دەگێڕا و لە پشت کۆلکەدارێک دەهاتە دەرێ، دەنگی هەڵبڕی: «ها بیگرن نەهێڵن دەرچێ! من ناڵێم بیگرن؟!»

لووکاشکا ددانی لە ڕیچەوە برد و لە بن لێوەوە گوتی: «وست، بێدەنگ بە! ئەبرەکەکانن.»

ناسایر پرسی: «تەقەت لە کێ کرد؟ لە کێت هەڵکرد، لووکاشکا؟»

لووکاشکا وەڵامی نەدایەوە، بەڵکوو چەکەکەی پڕ کردەوە و لەگەڵ ئەوەشدا چاوی هەر لە کۆلکەدارەکە بوو کە بە سەر ئاوەکەوە خولی دەخوارد و شەپۆلی ئاوەکە ڕایدەدا. کۆلکەدارەکە دیسان بە کەناری پەپکە ڕملێکەوە گیرسایەوە و لە پشت ئەوەوە شتێکی گەورە کە بە سەر ئاوەکەوە گێژی دەخوارد وەدیار کەوت.

کازاخەکان دیسان پرسییان: «تەقەت لە کێ کرد؟ بۆ پێمان ناڵێی؟»

لووکاشکا دووپاتی کردەوە: «لە ئەبرەکەکان، مەگین پێم نەگوتن؟»

---

١٩ یانی خودا و عیسا مەسیح

- گاڵتە مەکە، حەتمەن تفەنگەکەت لە دەست دەرچووە!
لووکاشکا کە بە هۆی شڵەژاوییەوە دەنگی بە باشی دەرنەدەهات، هەستایە سەر پێ و گوتی: «من ئەبرەکێکم کوشت، تەقەشم لەو کرد.»
لەگەڵ ئەوەی تەپکە لمەکەی پیشان دەدان، گوتیشی: «پیاوێکم دی بە سەر ئاوەکەوە دەستی بە کۆلکەدارەکەوە گرتبوو، من پێکام، دەزانم کوشتم. چاوی لێکەن، نەتاندیوە بە سەر ئاوەکەوە؟»
ئەرگۆشۆڤ دەستی بە چاویدا هێنا و گوتی: «گاڵتە مەکە.»
لووکاشکا شانی گرت و ڕایتلەکاند و وەها شانی گوشی کە ئەرگۆشۆڤ ترسی ڕێنیشت. بە سەر ئەرگۆشۆڤدا گوڕاندی: «گاڵتەی چی؟ بە جوانی بڕوانە. چاو لەوبەری ئاوەکە بکە!»
ئەرگۆشۆڤ کە چاوی لە شوێنەکە دەکرد، تەرمێکی دی بە سەر ئاوەکەوە خول دەخوات، لە ناکاو ڕاوێژی ئاخاوتنەکەی گۆڕی و گوتی: «ئا، ئا، ڕاست دەکەی، حەتمەن هی دیکەشی لەگەڵە، هەر بەتەنیا نەبووە.»
پاشان تفەنگەکەی تاقی کردەوە و گوتی: «ئەوان یان هەموویان لەم دەوروبەرەن، یان لەم نزیکانە و لەوبەری چۆمەکە بۆسەیان ناوەتەوە. من پێموایە هەروایە و بۆسەیان ناوەتەوە.»
لووکاشکا پشتێنەکەی کردەوە و دەستی کرد بە داکەندنی کەرکە و جلەکانی. ئەرگۆشۆڤ دەنگی هەڵێنا: «ئەوا بۆ کوێ دەچی گەمژە؟ کاری وا نەکەی، زۆر مەترسیدارە. گوێ بگرە گیانت لە دەست دەدەی، ئەوەندە سەرەڕۆ مەبە. ئەگەر پێکابێتت، دڵنیا بە لە جێی خۆی جووڵە ناکا. تۆزێ باڕووتم بدەیە. پێتە؟ ناسایر، زوو بڕۆ بۆ پاسگا، بەڵام بە قەراغ چۆمەکەدا مەڕۆ، دەتکوژن، بە قسەم بکە باشە!»
ناسایر ڕقی هەستا و گوتی: «بۆ من؟ یانی بە تەنیا بچم؟»
لووکاشکا کەرکەی لە شانی خۆی داماڵی و ڕۆیشت بۆ قەراغ ئاوەکە. ئەرگۆشۆڤ کە خەریک بوو باڕووتی لە لوولەی تفەنگەکەی دەکرد، گوتی: «من پێت دەڵێم مەچۆ! ئەو ئیتر ناجووڵێ، من زۆر چاک چاوم لێیەتی. زۆری

نەماوە خۆر هەڵبێ. ڕاوەستە با کاری خۆمان بکەین، با لە پاسگاوە هێزی یارمەتیمان بۆ بنێرن، ناسایر زووکە بڕۆ بۆ پاسگا و یارمەتی بێنە. وا دیارە دەترسی؟ من پێت دەڵێم مەترسە.»

ناسایر گوتی: «لووکاشکا! هۆی لووکاشکا! لانیکەم پێم بڵێ چۆنت کوشت؟»

لووکاشکا لەوەی کە بە تەنیا خۆ بە ئاوەکەدا بدا پەشیمان بۆوە.

- زوو بچن بۆ پاسگا. من لێرە دەمێنمەوە. بە کازاخەکان بڵێن چەند کەس بنێرن بۆ یارمەتی. ئەگەر ئەوان لەم دەوروبەرە بن... دەبێ هەرچۆنێکە دەستگیریان بکەین.

ئەرگۆشۆڤ لە کاتی هەستانە سەرپێدا گوتی: «من پێت دەڵێم کە ئەوان ڕادەکەن، حەتمەن دەبێ دەستگیریان بکەین.»

ئەرگۆشۆڤ و ناسایر هەستان، چاویان لە یەکتری کرد و بەرەو پاسگا وەڕێکەوتن. بەڵام نەک بە کەناری چۆمەکەدا، بەڵکوو بە نێو دار هەڵووچەکاندا ڕۆیشتن کە دەچووەوە سەر توولەڕێی دارستانەکە.

ئەرگۆشۆڤ گوتی: «سەرنج بدە لووکاشکا! لێرە نەجووڵێی! چونکە لەوانەیە لێرەش سەرت ببڕن. زۆر وریا بە و خەوت لێنەکەوێ، ئەوە زۆر چاک لە گوێ بگرە.»

لووکاشکا وەڵامی دایەوە: «بڕۆ، خۆم دەزانم چی بکەم!»

دوای ئەوەی تفەنگەکەی تاقی کردەوە، لە پشت کۆلکەدارێکی گەورە خۆی حەشاردا.

لووکاشکا کە بە تەنیا مایەوە، چاوی لە تەپکە لمەکە بڕی و گوێی هەڵخست بۆ هاتن و فریاکەوتنی کازاخەکان. بەڵام چونکە مەودای نێوان پۆستەکە و پاسگا دوور بوو، بێئۆقرەیی زۆری ئازار دەدا. بیری کردەوە کە ئەو ئەبرەکانەی کە لەگەڵ کوژراوەکە بوون لە زووترین کاتدا هەڵدێن و لەو شوێنە خۆ ناگرن. هەروەک شەوی ڕابردوو هەڵاتنی بەرازەکە قەڵسی کردبوو، ئێستاش هەڵاتنی ئەبرەکەکان ڕقی هەستاندبوو، هێندێ جار چاوی

لە دەوروبەری خۆی دەکرد و هێندێ جاریش لە کەناری چۆمەکەی دەڕوانی. بەردەوام چاوەڕوان بوو کە پیاوێکی تر ببینێ و مەتەرێزێکی باشی بۆ خۆی دۆزیبۆوە و قامک لە سەر پەلاپیتکەی تفەنگ، ئامادە بوو بۆ تەقە کردن. بیری ئەوەی کە لەوانەیە بکوژرێ، بە هیچ شێوەیەک بە مێشکیدا نەدەهات.

# نۆ

وردەوردە وڵات ڕووناک بۆوە. تەرمی چێچێنیەکە کە بە تەپکە لمەکەوە گیرسابۆوە، جارجار شەپۆلی چۆمەکە جووڵەیەکی پێ دەکرد. ئێستا بە تەواوی دیار بوو. لە ناکاو لە نزیک لووکاشکا خشەخش و ترپەی پێیەک لە نێو دەوەن و گیاوگژەکانەوە هات و پەلی گزیچار و لقی کەرخنکێنەکان لەرینەوە. لووکاشکا زامنی چەکی ترازاند و گوتی: «بە ناوی باوک و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز.» هەر تەقەی کۆلاسی تفەنگە بەرز بۆوە، ئەو کەسەی دەهاتە پێشێ ڕاوەستا و گوتی: «هۆی کازاخەکان! مامە نەکوژن!»

ئەوە دەنگی مامەئیرۆشکا بوو کە بە دەنگی گڕ و لەسەرەخۆ قسەی دەکرد. مامەئیرۆشکا گیاوگژەکانی لادا و هات بۆ لای لووکاشکا. لووکاشکا گوتی: «بۆ ئاوا بە پارێزەوە هاتی، خۆ خەریک بوو بتکوژم!»

پیرەپیاو پرسیی: «تەقەت لە کێ کرد؟»

دەنگە گڕ و بەرزەکەی لە نێو دارستانەکەدا بووبوو بە زایەڵە و گەیشتە ئەوبەری ڕووبارەکە، بۆیە کوتوپڕ ئەو بێدەنگی و ڕازەی کە ئەو شەوە لووکاشکای گەمارۆ دابوو، لە نێو چوو. دنیا ڕووناکتر بۆوە و هەموو شتێک بە ڕوونی دەکەوتە بەرچاو.

لووکاشکا گوتی: «مامە، تۆ هیچت نەدی، بەڵام من ئاژەڵێکم کوشت.»

لووکاشکا ئەو قسەی کرد و زامنی تفەنگەکەی جێخستەوە و زۆر هێمنانە کە تا ئێستا هیچ کەس پێوەی نەدیبوو، هەستایە سەرپێ.

پیرەپیاو ئێستا ئیتر چاوی لە سەر ئەو تەرمە هەڵنەدەگرت کە شەپۆلی ئاوەکە بەرەو لێوارەکەی بردبوو.

ـ ئەو نەگبەتە کۆلکەدارێکی نابووە سەر پشتی و بە مەلە دەیویست لە چۆمەکە بپەڕێتەوە. کە دیتم خەریکە دێ بۆ ئەملایەوە... ڕاست هۆ لەو

شوێنە بوو، بڕوانە! پانتۆڵێکی شینی لە بەردایە و حەتمەن تفەنگیشی پێیە... دیتووتە؟

پیرەپیاو بە تینوتاوێکەوە گوتی: «ئەرێ دیتوومە.»

کوتوپڕ شتێکی جیددی و سەخت لە سەر نێوچاوانی وەدیار کەوت و وەک ئەوەی داخێکی لە دڵدا بێ، گوتی: تۆ جیگیتێکت کوشتووە!

ـ من لە بۆسەدا بووم، هەروەک ئێستا خەریک بوو دەمڕوانی. گوتم بڵێی ئەو تاپۆیە چی بێ بە سەر ئاوەکەوەیە و خەریکە دێتە پێشێ؟ تفەنگەکەم ئامادە کرد. پیاوێک دەردەکەوت و ون دەبۆوە. سەرم سووڕ مابوو؟ هەروەها کۆلکەدارێک، کۆلکەدارێکی گەورە بە سەر ئاوەکەوە بوو و بە پێچەوانەی گەڕیانی ئاوەکە دەڕۆیشت، دیتم لە نێوەڕاستی ئاوەکەوە لارەی دایە و بۆ لای ئێرەوە هات! من هەروا چاوم لێ دەکرد؛ سەرێک لە ژێر کۆلکەدارەکە هاتە دەرێ. تۆزێ سەرم هەڵێنا. گیاوگژەکان بەرچاویان گرتبووم. هەستامە سەر پێ، حەتمەن ئەویش منی دیتبوو. بایدایەوە و بەرەو تەپکە لمەکە ڕۆیشت. لە ئاوەکە هاتە دەرێ. چاوی لە دەوروبەری خۆی کرد. من لە دڵی خۆمدا گوتم: «بە هەڵە چووی، تازە لە دەستی من دەرباز نابی!» هەروا دەڕوانم (ئاخ! گەرووم وشک بووە!) تفەنگەکەم ئامادە دەکەم و سێرەی لێ دەگرم، لە جێی خۆم نابزووم و هەناسەم لە سینگمدا ڕادەگرم. ئەو تۆزێ ڕادەوەستێ و دیسان دەست دەکاتەوە بە مەلە کردن. کاتێک دەکەوێتە بەر تریفەی مانگەشەو، من پشتی دەبینم. «بە ناوی باوک و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز» قامک بە پەلاپیتکەدا دەنێم و لە پشت شینەدووکەڵی باڕووتەکەوە دەڕوانم؛ خەریکە لاقەفرتێ دەکا. گوێم لە ناڵەیەک دەبێ، لەگەڵ ئەوەی پێموایە ناڵەیەکم بیستووە، لە دڵی خۆمدا دەڵێم: «وەلحاسڵ دەبێ شوکری خودا بکەم کە کوشتم.» کاتێک شەپۆلی ئاوەکە بەرەو تەپکە لمەکە ڕایدا، بە جوانی دیتم. دەیویست هەستێتە سەر پێ، بەڵام توانایی نەبوو. جینگڵی دەدا. دیتم دیسان لاقەفرتێ دەکات و پاشان کەوت بە لادا. بە جوانی لێم دیار بوو. ئیتر نەدەجووڵایەوە، حەتمەن مردووە. ئێستاش ئەرگۆشۆڤ و

ناسایرم ناردووە بۆ پاسگا هێزی یارمەتی بێنن، نابێ بێڵین ئەوانی دیکەیان هەڵێن، دەبێ هەموویان بکووژین.
پیرەپیاو گوتی: «ئەوە تۆ دەڵێی چی؟ ئێستا کاکی خۆم، ئەوان دوور کەوتوونەوە...»
پیرەپیاو دیسان بە دڵێکی پڕ کەسەرەوە سەری لەقاند. لەو کاتەدا چەند پیاوی کازاخ، پیادە و سوارە بە هەرا و هوریا و ئاوزەنگی لێدان خۆیان کرد بە نێو گژوگیا و دەوەنەکاندا و لە نزیک ڕۆخی ڕووبارەکە وەدیار کەوتن. لووکاشکا هاواری کردن: هۆی! لۆتکەتان هێناوە یان نا؟ یەکێک لە کازاخەکان دەنگی هەڵبڕی: بژیی لووکاشکا! بیکێشە بۆ کەناری چۆمەکە!
لووکاشکا بێئەوەی چاوەڕوانی لۆتکە بێ، دەستی کرد بە داکەندنی جلەکانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا چاوی لە سەر دەستکەوتەکەی هەڵنەدەگرت. ملازم گوڕاندی: «ڕاوەستە، پەلە مەکە، ناسایر ئێستا گەمی دێنێ!»
یەکێکی تر لە کازاخەکان دەنگی هەڵبڕی: «گەمژە! ئەگەر زیندوو بێ چ دەکەی؟ ئەگەر خۆی مرداندبێ چی؟ خەنجەرێک لەگەڵ خۆت ببە!»
لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی پانتۆڵەکەی دادەکەند گوتی: «دەتهەوێ کڵاو لە سەری کێ بنێی!»
پاشان بە پەلە جلەکانی داکەند، خاچی خۆی گێشا و لوور بوو بو نێو ئاوەکە و شڵپوهۆڕی ساز کرد. خۆی کرد بە ژێر ئاوەکەدا و پاشان باسکە سپییەکانی لە پێش خۆیەوە وەک سەوڵ خستە کار و لەگەڵ ئەوەی پشتی خۆی بەرز کردبۆوە و لە سەر ئاوەکە ڕایگرتبوو هەوڵی دەدا ئاوەکە ببڕێ و بچێتە پێشێ. بە مەلە کردن ڕۆیشت بۆ لای تەپکە لمەکە. دەستەی کازاخەکان لە کەناری چۆمەکە ڕاوەستابوون و تێکڕا پێکەوە هاواریان دەکرد. سێ کەسی سوارکار بۆ پارێزگاری لەملا و ئەولای لووکاشکاوە دەڕۆیشتن. لە پێچی ڕووبارەکەوە گەمیەکە وەدیار کەوت. لووکاشکا هەڵات بۆ سەر تەپکە لمەکە و بە سەر کوژراوەکەدا داهاتەوە و پاشان سەری هەڵێنا، ئاوڕی دایەوە و هەر لەوێوە بە دەنگی بەرز هەرای کرد: بە تەواوی مردووە!

گوللەکە لە سەری کابرای چێچێن درابوو. کوژراوەکە پانتۆڵی شین و کراسێک و کەرکەیەکی لە بەردا بوو. تفەنگێکی ڕاست و چەپ لە شانی کردبوو و خەنجەرێک بە بەر پشتێنەیەوە بوو، لەسەر هەمووشیانەوە ئەو کۆلکەدارە گەورەی بە ڕەگوڕیشەوە لە کۆڵی بەستبوو کە سەرەتا لووکاشکای هەڵخەڵەتاندبوو.

کازاخەکان لە دەوری یەک کۆبوونەوە و یەکێکیان گوتی: «چاک کەوتە داوەوە!»

لەو کاتەدا تەرمی چێچێنیەکەیان لە گەمیەکە هێنادەرێ و لەسەر خیزەڵانی قەراغی چۆمەکە ڕایانکێشا، گیاوگژی خۆڕسکی خیزەڵان لە ژێر قورسایی تەرمەکەدا پێخوست بوون. دایان بە سەر پشتی ئەسپێکدا و بەرەو پاسگا گەڕانەوە. لە دالانی پاسگا یەکێک لە سەربازە کازاخەکان گوتی: «زۆریش جحێڵە!»

یەکێکی دیکەیان گوتی: «هێزەکانی ئێمە لە کوێ بە دوای دوژمندا دەگەڕێن؟ من پێموایە هەموویان لەوبەری چۆمەکەن. ئەگەر ئەم چارەڕەشە پێشەنگ نەبووبێ، ئاوا نەیاندەنارد بۆ نێو ڕووبارەکە. بەڵام دیارە ئەم چارەڕەشە شعووری نەبووە!»

لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی جلە تەڕەکانی دەگوشی و ئاوەچۆڕی دەکردن، ئاوە ساردەکە وەلەرزینی خستبوو و بە لێوەلەرەوە گوتی: «حەتمەن زۆر فێڵەباز بووە! ویستوویەتی لە پێش هەمووانەوە بێتە دەرێ. هەڵبەت پیاوی جیگیت هەر دەبێ وابێ! ڕیشی قۆڵە و تۆپیشی لە خەنە گرتووە.»

یەکێکی تریان گوتی: «چاو لە زیپوونەکەی بکەن! لە توورەکەی ناوەو بەستوویە بە پشتیەوە. ئاوا باشتر توانیویەتی مەلە بکات.»

ملازم کە خەنجەر و تفەنگی کوژراوەکەی بە دەستەوە بوو، گوتی: «گوێ بگرە لووکاشکا! تۆ خەنجەر و زیپوونەکە هەڵگرە بۆ خۆت؛ تفەنگەکەش من بە سێ سکە لێت دەکڕم!»

پاشان گوتی: «دیتووتە، قورقوشمی لەگەڵە!»

لەگەڵ ئەوەی فووی کرد بە لوولەی تفەنگەکەدا، گوتی: «ئەوە بۆ من یادگارییەکی باشە.»

لووکاشکا وەڵامی نەدایەوە. دیار بوو ئەو مامەڵەیە بە قازانجی نییە. بەڵام دەیزانی دەبێ مامەڵەکە یەکلایی بکاتەوە. نێوچاوانی گرژ کرد. زیپوونی چێچێنییەکەی دا بە زەویدا و گوتی: «دیتووتانە من تووشی چ حەیوانێک بووم! بریا زیپوونەکەی تۆزێ تازەش بوایە، بەڵام ئەم پڵاسە کۆنە کەڵکی نەماوە.»

کازاخێکی دیکە گوتی: «بۆ داربڕین و ئێزنگ شکاندنی نێو دارستانەکە خراپ نییە.»

لووکاشکا کە ڕقەکەی نیشتبۆوە و دەیویست دیارییەکە پێشکەش بە سەرۆکەکەی بکات، گوتی: «مۆسۆڤ! من دەمەوێ بڕۆمەوە بۆ ماڵێ.»

- باشە بڕۆ!

ملازم ڕووی لە کازاخەکان کرد و لەگەڵ ئەوەی دەستی بە تفەنگەکەدا دەهێنا و چاوی لێ هەڵنەدەگرت، گوتی: «کوڕینە! ئەم تەرمە لە پاسگاکە بەرنە دەرێ، پاشان کەپرێکی بە دار و چرپی بۆ دروست کەن و لە جێگایەکی فێنک داینێن. ڕەنگە هۆزەکەیان لە کوێستانەوە بێن و تەرمەکەیمان لێ بکڕن.»

کازاخێکی دیکە گوتی: «هێشتا هەوا زۆر گەرم نییە.»

یەکێکی دیکەیان گوتی: «ئەگەر چەقەڵێک بێت و لاشەکەی بخوات، چی بکەین؟ ئەوکاتە زەرەری ئەوەشمان لێ دەکەوێ. دەبێ کێشکچییەکی بە لاوە دابنێین. چونکە باش نییە کاتێک دێن بۆ کڕینەکەی، دڕندە تەرمەکەیان شپرزە کردبێ.»

ملازم ڕووی لە لووکاشکا کرد و لەگەڵ ئەوەی پێدەکەنی گوتی: «باشە لووکاشکا، کەوایە تۆ دەبێ پەقرەجێک[٢٠] بدەی بە هاوڕێکانت!»

---

٢٠ پێوانەی ئاوەکییە، بەرانبەری ١٢ لیتر، مەبەستی مەشرووبە.

کازاخەکان وەڵامیان داوە: «ئەوە نەریتێکە دەبێ پێڕەویی لێ بکەین. دیتت خودا چ یارمەتییەکی دای و بێ‌ئەوەی خۆت زەحمەت بدەی، پیاوێکی ئەبرەکت کوشت.»

لووکاشکا گوتی: «کەوایە خەنجەر و زیپوونەکەی لە من بکڕن. پارەیەکی باشیشم بدەنێ. من پانتۆڵەکەشی دەفرۆشم، بەزیاد نەبێ چ پانتۆڵێکە، من دەزانم بۆ بەرم نابێ، نازانم ئەم هەتیوە ڕیوەڵەیە لە کوێوە هات کەوتە داوم!»

کازاخێک سکەیەکی دایە و زیپوونەکەی لێ کڕی. بۆ خەنجەرەکەش قازاخێکی تر دوو پەقرەجی مەشرووب پێدا.

لووکاشکا گوتی: «کوڕینە، هەتا دەتوانن مەشرووب بخۆنەوە، جێژنی منە. ئەوی مایەوە، دەیبەم بۆ گوندەکە.»

ناسایر گوتی: «پانتۆڵەکە چی لێ دەکەی؟ بە قسەی من دەکەی لەتوکوتی بکە و چەند لەچکەی لێ دروست دەبێ بۆ کچان!»

کازاخەکان هەموو دایان لە قاقای پێکەنین.

ملازم گوتی: «بەسە، کەم پێبکەنن. زوو ئەو تەرمە لێرە بەرنە دەرێ. ئەم تەرمە بۆ لێرە لە بەردەست و پێدا بێ، زوو ڕایگوێزن.»

لووکاشکا بە سەر هاوڕێکانیدا کە هەموویان بە ڕقەوە چاویان لە تەرمەکە دەکرد، بە شێوەیەکی دەستوور پێدەرانە گوڕاندی:

- زووکەن کوڕینە! زوو لێرەی ببەنە دەرێ! ...

هەموو خێرا و گورجوگۆڵانە دەست بەکار بوون. دەتگوت ئەو، سەرۆکیانە. دوای ئەوەی تەرمەکەیان چەند هەنگاوێک کێشایە دەرێ، کازاخەکان لاقی کوژراوەکەیان بەردا، لاقە شلەکانی کەوتنە سەر زەوی و دوای ئەوەی تاوێک بەو شێوەیە مایەوە، ناسایر چوو بۆ لای تەرمەکە و سەرە بەلادا کەوتووەکەی بەرز کردەوە و چاوی لە سەروگوێلاکی خوێناوی و زامەکەی کرد و لە دەموچاوی کوژراوەکە ورد بۆوە. هەستا دەستی نایە

کەلەکەی و گوتی: «سەری کونێکی گەورەی تێبووە! ڕاست لە پشتەسەری دراوە. بەڵام دەموچاوی تێکنەداوە، بنەماڵە و خزمەکانی دەیناسنەوە.»

هیچکەس وەڵامی نەدایەوە و سەرلەنوێ بێدەنگی باڵی بە سەردا کێشان. ئێستا هەتاو لە سەرانی دابوو و تیریژی بەتینی بە سەر دەشت و چیادا بڵاو کردبۆوە. سەوزەڵانیی شێدار و پڕئاونگ و شەونمی بەرەبەیان دەترووسکانەوە. ڕووباری تەرەک بە نێوان دۆڵ و کەندەڵان و لێڕەوارەکەدا تێدەپەڕی و بە لرفە و هاژەی پڕ تەوژمی خۆی دارستانە چڕوپڕ و کڕەکەی لە خەوی قورسی شەوانە ڕاپەڕاندبوو. پۆڕ و سوێسکە بۆ سڵاو کردن لە بەیان لە هەموو لایەکەوە دەفڕین و دەنیشتنەوە. کازاخەکان بێدەنگ و جووڵە لە دەوری تەرمەکە کۆ ببوونەوە و چاویان لێدەکرد. ئەم تەرمە ڕەش داگەڕاوە، بە پانتۆڵی شین و تەڕ و قوڕاوییەوە کە لەسەر زگ ڕاکێشرابوو، جوانچاک و بەهێزی دەنواند. شان و باهۆی قایموقۆڵ و باسکی بە ماسوولکەی پتەوەوە پاڵ بە پاڵی جەستەی درێژ بووبوو. سەری خڕ و تازە تاشراوی پێستەکەی شینی دەنواند، جێگای گوللەکە خوێنی تێدا گیرسابوو و جەستەی بە لایەکدا خوار بووبۆوە. نێوچاوانی ساف و ڕەشهەڵگەڕاو بوو و ئەو شوێنەی کە تووکەکەی تاشرابوو بە جوانی دەبیندرا. چاوەکانی زەق بووبوونەوە و هێشتا تروسکەیان تێدا مابوو. گلێنەی چاوی هەڵگەڕابوونەوە و دەتگوت لەو سەرانە لە شتێکی باڵادەستتر لە هەمووان دەڕوانێ. لێوە قەیتانییەکەی کە لالغاوەی بۆ دواوە کشابوونەوە، لە ژێر سمێڵە سووره ڕێکوپێکەکەیدا بزەیەکی ناسک و پڕ لە خۆشەویستیی تێگەڕابوو. پشتی دەستی بە مووی بۆر داپۆشرابوو، قامکەکانی نووشتابوونەوە و نینۆخەکانی سووربوون.

لووکاشکا بۆ لەبەرکردنی جلوبەرگ پەلەی نەدەکرد. هەموو گیانی خووسابوو و ملی سوورتر و چاوانی گەشتر لە کاتی ئاسایی دەنواند و ڕوومەتە خڕ و پڕەکانی دەلەرزین. هەڵمێک لە لەشە سپیوسۆڵ و بەهێزەکەی هەڵدەستا کە بە زەحمەت دەبیندرا و لە هەوای وشکی بەیانیدا

بەرەو ژوور هەڵدەچوو. لەو کاتەدا کە دەتگوت هەستێکی باش و پڕ لە ستایش دەرهەق بە کوژراوەکە لە مێشکیدا بزووتووە، گوتی: «ئەمەش لە کراسی خۆیدا پیاوێک بووە!»

یەکێک لە کازاخەکان وەڵامی دایەوە: «بەڵێ ئەگەر تۆ دەکەوتییە چنگی ئەو، جا دەمزانی چۆن بە مەشکەت دەردێنیٚ!»

شووشەی بێدەنگی شکا و ئیتر کازاخەکان لەگەڵ یەک کەوتنە ئاخافتن. دوو کەسیان چوون بڕێکیان چرپیوچاڵ بڕی و هێنایان کەپرێکی پێ دروست بکەن. ئەوانی دیکەش بەرەو پاسگا ڕۆیشتن. لووکاشکا و ناسایر خۆیان ئامادە کرد تاکوو بەرەو گوند وەڕێبکەون.

نیو کاتژمێر دواتر، بە نێو لێڕەوارێکی چڕدا کە ڕووباری تەرەک کردبووی بە دوو بەشەوە، لووکاشکا و ناسایر بە هەڵەداوان و بە دەم قسە کردنەوە لە ماڵەکانی خۆیان نزیک بوونەوە. لووکاشکا لە ناکاو بە ناسایری گوت: «تۆ بە شێوەیەکی پەنامەکی بچۆ بۆ لای، بەڵام مەڵێ من تۆم ناردووە. تەنیا هەواڵێکم بۆ بێنەوە و بەس، ئەویش بزانە مێردەکەی لە ماڵێیە یان نا؟»

ناسایر گوێڕایەڵانە پرسی: «کەوایە من دەچم بۆ لای یانکا و ئەوکاتە دەتوانین تۆزێ بە خۆشی ڕایبوێرین.»

لووکاشکا وەڵامی دایەوە: «ئەگەر ئەمڕۆ بە خۆشی ڕاینەبوێرین، ئەی کەنگێ ڕایبوێرین!»

دوای ئەوەی گەیشتنە گوندەکە، دەستیان کرد بە خواردنەوە و کەیف و نەهەنگ و هەتا ئێوارەی خایاند. پاشان چوون خەوتن.

## ده

دوو ڕۆژ دوای ڕووداوەکە، دوو لیوا لە هەنگی پیادەی قەفقازیا هاتن بۆ نۆڤملنیسکایا تاکوو لەوێ نیشتەجێ بن. عارەبانەکان ئێستا کرابوونەوە و لە گۆڕەپانەکە ڕاگیرابوون. ئاشپەزەکان قوولکێکیان دروست کردبوو و لە هەردوو لاوە ئێزینگیان هەلچنیبوو و خەریکی لێنانی چێشتی کاشا[21] بوون. ئاجوودانەکان خەریکی دابەش کردنی دەرماڵەی چەکدارەکان بوون. مەیتەرەکان خەریکی داکوتانی سنگ بوون و دەیانویست ئەسپەکانی پێوە ببەستنەوە. ئەو ئەفسەرانەی ڕاسپێردرابوون کە خانوو بۆ خاوەن پلەوپایەکان و سەربازەکان بدۆزنەوە، وەک ئەوەی شاری خۆیان بێ، بە کۆڵان و شەقامدا دەسووڕانەوە و بەملا و بەولادا هەڵدەهاتن و خانوویان پیشانی ئەفسەر و سەربازەکان دەدا. لە بەرێکەوە تەپڵی سەوز ڕیز کرابوون، لە لایەکی دیکەشەوە عارەبانە و ئەسپەکان ڕاگیرابوون. لە بەرێکی دیکەشەوە مەنجەڵی پڕ لە شۆرباو لە سەر کوانوو قوڵتەقوڵت دەکولان. جەنابی ملازم و ڕائید و ئونزیم میخائیلۆڤیچ و ئاجوودانی سەبازخانەش لەو شوێنە بوون و سەرقاڵی کاری خۆیان بوون. ئەم ڕووداوانە لەو گوندە ڕوویان دەدا کە بڕیار درابوو ئەو دوو لیوایە لەوێ خێوەت هەڵدەن و بمێننەوە. سەربازەکان و زۆربەی ملازمەکان لە بیری ئەوەدا بوون کە بۆچی دەبێ لێرە خێوەت هەڵدەن؟ ئەم کازاخانە کێن؟ بڵێی ڕازی بن کە ئەو لیوایانە لەو گوندەی ئەوان بمێننەوە؟ ئەم کازاخانەش لە تیرەی ڕاسکۆڵینەکانن[22] یان نا؟ ئەوانە هیچی گرینگ نەبوون. سەربازەکان هەرکە لەو شوێنە دامەزران،

---

٢١ شۆرباوی گۆشت و برویش یان ساواری ڕەش، واتە گەنمی هەرزان

٢٢ ناوێکە کە بە شێوەی فەرمی بە مەسیحییەکانی دەڵێن.

شـەکەت و مانـدوو و بە سـەروگیانی تـۆزاوییەوە، وەک پلـووره هەنگێکـی هارووژاو کەوتنە نێو کۆڵان و گۆڕەپانی شار و هەراوهوریایان وەڕێخست؛ بەڵام لەوە ئاگادار نەبوون کە کازاخەکان بەو کارانە ناڕازین و زۆر تووڕەن. ئەوان دوو‌ـــدوو و سێ ـسێ بە کۆڵانەکانـــدا دەســـووڕانەوە و خەریکـــی قاقاکێشان و گاڵتە و گەپ بوون و قۆنداخی تفەنگەکانیان دەکێشا بە زەویدا و بەزم و هەرایـان وەڕێخسـتبوو. ئەو سـەربازانە دەسـتە دەسـتە خۆیـان دەکرد بە ماڵاندا، ڕەخت و فیشەکدانیان لە خۆیان دەکردەوە و جلەکانیان بە ڕەختاوێزەکانـدا هەڵدەواسـی، جانتـا و کۆڵەپشـتییەکانیان دەکـردەوە و لەگەڵ ژنان گاڵتەیان دەکرد. لە دەوری کوانووی چێشتلێنان، شـوێنی پێکگەیشـتنی سـەربازەکان، تـاقمێکی زۆر کـۆ بووبـوونەوە، زۆربەیـان قەنەیـان دەکێشـا و چاویـان لە دووکەڵـی کوانـووەکە دەکـرد کە بـۆ ئاسـمان بەرز دەبـۆوە و لەو سـەرە دەبـوو بە هەورێکـی سـپی، هێنـدێ جـاریش چاویـان لە سـکڵ و گـڕی ئێزینگەکان دەکرد کە وەکوو شووشـەی قاڵکراو دەلەرینەوە، گـاڵتە و گەپیـان دەکـرد و بە ژن و پیـاوە کازاخەکـان پێـدەکەنین کە بـارودۆخی ژیانیـان و هەڵسوکەوتیان بە شێوەی ڕووسەکان نییە.

سـەربازەکان بە سـەر هەمـوو ماڵەکانـدا دابەش کرابـوون و بووبـوونە سەرباری خەڵک و لە هەموو مـاڵێکەوە دەنگی قاقاکێشـانی ئەوان و هـاوار و گوڕەی ژنان دەهات کە بە ڕقهەستاوی پارێزگارییان لە ماڵ و ژیانی خۆیان دەکــرد و دەفــر و کەلــوپەلی خۆیـــان نەدەدا بەو ســـەربازە داگیــرکەرانە. منداڵەکان خۆیـان لە پشـت دایکیـان حاشـار دەدا و هەمـووان بە شـڵەژاوی و دڵەخورپەوە چاویان لە هەڵسوکەوتی ئەم سەربازانە دەکرد. لەگەڵ ئەوەی لە دایکیـان دوور نەدەکەوتـنەوە و دەسـتیان بە داوێنیـانەوە دەگـرت. چاویـان لەسەر ئەو سەربازە غەوارانەش هەڵنەدەگرت. کازاخە پیرەکان لە ماڵەکانیان دەهـاتنە دەرێ و بێـدەنگ و خەمبـار لە بەردەرگـا دادەنیشـتن و چاویـان لە هاتوچۆ و حیلک و هۆڕی سەربازەکان دەکرد. هەرکەسێک ئەو کازاخـانەی

لەو حاڵەدا بدیبایە دەیگوت: ئەمانە کەسانێکن کە بۆ هەموو کارێک ئامادە و تەیارن، بەڵام تێناگەن ئاکامی ئەو کارە بە کوێ دەگا.

ئۆلێنین کە لە سێ مانگ لەمەوبەرەوە، وەک خوێندکاری زانکۆی ئەفسەری لە هەنگی قەفقازیادا ناونووسیی کردبوو، لە یەکێک لە باشترین ماڵەکانی ئەو گوندەدا لەگەڵ ملازم ئێلیڤاسیلیڤیچ یانی لە لای ئۆلیتا جێگیر بووبوو. ئەو لە حەوشەی ئەو ماڵە، سواری ئەسپێکی بە ڕەسەن کاباردایی بووبوو کە لە گرۆزنی کڕیبووی. چەکسایەکی لە بەر کردبوو و دوای پێنج سەعات ڕێبڕین ئێستا گەیشتبووە ئەو ماڵە و لە حەوشە ڕاوەستابوو.

ژانۆ پێی گوت: «دیمیتری ئاندرێڤیچ، ئەوە چییە؟»

ئۆلێنین دەستی بە پشتی ئەسپەکەدا هێنا و بە کەیفسازی و ڕووخۆشی ڕووی لە ژانۆ کرد کە بە فیشەکلغەوە خۆی کرد بە ژووریدا، خێرا فیسق و فلاسقی کردەوە و قژئالۆز و شەتڵانی ئارەقە، شێواو و ناوچاوان گرژ گوتی: «چی، ژان ڤاسیلیڤیچ.»

ئۆلێنین بە تەواوی گۆڕابوو و دەتگوت مرۆڤێکی ترە. بە جێی ڕیشی تیفتیفەدراو، سمێڵێکی چکۆڵەی هێشتبۆوە و ڕیشیشی نەتاشیبوو. بە جێی ڕەنگی زەرد کە بە هۆی شەونخوونییەوە بوو، بناگوێ و ڕوومەتی سوور و نێوچاوانی کراوە دەهاتە بەرچاو و شادی لە سەرتاپای دەباری. بە جێی جلوبەرگی ڕەش و نوێ و خاوێن، چرکسایەکی سپی و چڵکن و چرچولۆچی لەبەر کردبوو و تفەنگەکەشی بە سەر ئەودا ڕاست و چەپ لە شان کردبوو. بە جێی بۆینباخێکی تازە و لایەدار، ملیوانەی بەشمیتێکی سووری لە بەرگن دروستکراو ملە تاوەنگازەکەی ڕێکگوشیبوو. بە شێوەی چرکسەکان، بەڵام زۆر نارێکوپێک جلوبەرگی لە بەر کردبوو. هەرکەسێک بیدیبایە لەڕێوە دەیزانی ئەو پیاوێکی ڕووسییە نەک جیگیت. جلەکانی لە هەموو بارێکەوە وەک چرکسییەکان دەچوو، بەڵام خۆی نەبووبوو بە چرکس. لەگەڵ ئەوەشدا قەڵافەتێکی ساغ و بەهێزی هەبوو و شادی و ڕەزایەت بە ڕوخسار و هەڵسوکەوتیەوە دیار بوو.

ژانۆ پێی گوت:
- ئەگەر بیڵێم حەتمەن ئێوە پێکەنینتان دێ! بەڵام خۆتان بچن لەگەڵ ئەو خەڵکە قسە بکەن. ئەوانە لەڕێوە دەرگاتان لە سەر دادەخەن و هیچ کارێکیشتان لە دەست نایە. مەحاڵە وشەیەک لە زاریان بێتە دەرێ.
ژانۆ ئەوەی گوت و پەقرەجێکی کانزای فڕێدا بۆ لای دەرگاکە و گوتی:
- دەیانگوت ئەمانە ڕووسی نین.
- دەبێ ئەمە لە سەرۆکی ستانیتسا بپرسین.
ژانۆ بە تووڕەیی‌یەوە وەڵامی دایەوە:
- گرنگ ئەوەیە من نازانم ئەم کابرایە لە کوێیە.
ئۆلێنین سەرسەرەکی چاوێکی لە ماڵەکە کرد و پرسیی: «کێ ئاوا خراپ هەڵسوکەوتت لەگەڵ دەکات؟»
ژانۆ سەری بەرز کردەوە و وەڵامی دایەوە: «پیاو هیچ تێناگا! دەڵێن ئاغا لە ماڵەوە نییە و نازانم بۆ کام کریگا[٢٣] چووە. پیرێژنەکەش جادووبازێکە مەگین خودا بزانێ... چۆن پیاو دەتوانێ لەو ماڵەدا بژی؟ من هیچ تێناگەم. بڕوام پێبکەن ئەوانە لە تورکەکان خراپترن. ئەو داخە پیاو دەکوژێ خۆیان بە مەسیحی دەزانن! تورکەکان زۆر لەوانە دەستودڵبازترن. "چووە بۆ کریگا!" یانی چی؟ ئەم کریگایە چییە کە ئەمانە ئاوا بە گەرمە باسی دەکەن و ئەمە چ ناوێکە لێیان ناوە؟»
ژانۆ ئەوەی گوت و پشتی لە ئۆلێنین هەڵکرد. ئۆلێنین بە گاڵتە پێکردن و بێ‌ئەوەی لە ئەسپەکەی دابەزێ، وەڵامی دایەوە: «کەوایە بە بڕوای تۆ، ئێمە لێرە بە ئاسوودەیی ناتوانین ڕایبوێرین؟»
ژانۆ کە بە هۆی بەرەوڕوو بوون لەگەڵ ئەم شوێنە و داب‌ونەریتی تازە بە تەواوی دنە درابوو، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لێبڕابوو لەگەڵ چارەنووسی خۆیدا هەڵکا، وەڵامی دایەوە: «تۆ خودا ئاگاتان لە ئەسپەکەتان بێ!»

---

٢٣ بە زمانی ناوچەیی وشەیەکە بە مانای شوێنێکی نزیک ڕۆخ کە بۆ ماسی‌گرتن بەنداوی لێ هەڵدەبەستن.

ئۆلێنین لەگەڵ ئەوەی لە ئەسپەکەی دادەبەزی، دیسان گوتی: «کەوایە تۆ دەڵێی تورکەکان لەمانە دەستودڵبازترن؟»

ژانۆ بە دەنگێکی گڕ و تووڕە گوتی: «هەر ئەوەمان مابوو، ئێستا واتان لێهاتووە گاڵتە بە من دەکەن؟»

ئۆلێنین لەگەڵ ئەوەی دیسان پێدەکەنی، گوتی: «ژانڤاسیلیڤیچ، خۆت تووڕە مەکە. لێگەڕێ با من چاوم بە خاوەنماڵەکە بکەوێ، جا دەبینی چۆن هەموو شتێک جێبەجێ دەکەم. ئەو کاتە لێرە بە ئاسوودەیی ڕایدەبوێرین. خەم مەخۆ!»

ژانۆ وەڵامی نەدایەوە، تەنیا چاوێکی قرتاند و بە ڕوانینێکی پڕ سووکایەتی چاوی لە ئاغاکەی کرد، پاشان سەرێکی لەقاند و لەگەڵی وەڕێکەوت. ژانۆ ئۆلێنینی بە ئاغای خۆی دەزانی و هەردووکیان سەریان سووڕدەما کە کەسێک دەیگوت ئەوان هاوڕێی یەکترن. هەروەها ئەوان بێئەوەی خۆیان تێبگەن، هاوڕێی یەکتر بوون. ژانۆ یازدە ساڵی تەمەن بوو کە لە گوندەوە هێنابوویان بۆ شار، ئەو کاتە ئۆلێنینیش هەر لەو تەمەنەدا بوو. کاتێک ئۆلێنین تەمەنی بوو بە پازدە ساڵان، کەوتە بیری ئەوەی کە ژانۆ فێری خوێندن و نووسین بکات و تەنانەت زمانی فەڕەنسیشی فێر بکات. ژانۆش زۆری ئەو کارە بە دڵ بوو. ئێستاش هەرکاتێ کەیفخۆش دەبوو چەند وشەی سەروپێشکاوی فەڕەنسیی لە دەم دەهاتە دەرێ و بە دوای ئەودا قاقایەکی گەوجانەی دەکێشا.

ئۆلێنین لە قاڵدرمەکان چووە سەرێ و پاڵی بە دەرگای داڵانەکەوە نا. ماریانکا بە کراسێکی سوورەوە کە بەرگی ماڵەوەی هەموو ژنانی کازاخە، داچڵەکی و ترساوانە خۆی بە دیوارەوە نووساند و بە قۆڵە فشوفۆڵە تورکییەکەی خۆی دەم و لووتی داپۆشی. ئۆلێنین کەلێنێکی بە دەرگاکە دا و لە تاریکوڕوونی ژوورەکەدا لایەکی دەموچاوی کچەکەی دی. ئۆلێنین بە کونچکاوییەکی خێرا و کەفوکوڵی گەنجانە، ڕوخساری جوان و کچانەی ماریانکای لە ژێر قۆڵی فشی کراسەکەدا هێنایە بەرچاوی خۆی و چاوی لە

چـــاوە ڕەشـــەکانی بـــڕی کە جـــوان و دڵڕفـــێن و ســـڵۆکانە بە تـــرس و کونچکاویەکی منداڵانەوە سەیری ئەوی دەکرد. ئۆلێنین لە دڵی خۆیدا گوتی: «خۆیەتی!» هەروەها بیری کردەوە: «ئێرە زۆری لەم شتانە لێیە.» پاشان ئۆلێنین دەرگای ژوورەکەی کردەوە. ئۆلیتکای پیر، کە ئەویش کراسی لە بەر کردبوو و لەگەڵ ئەوەی پشتی لە ئۆلێنین کردبوو، داهاتبۆوە و خەریکی گەسکلێدان بوو. ئۆلێنین کە چاوی پێی کەوت، بە خۆشیرینکردنەوە گوتی: «سڵاو دایە گیان! من بۆ نیشتەجێ بوون هاتووم بۆ ماڵی ئێوە ...»

ژنە بێئەوەی پشتی هەڵێنێتەوە، سەری بۆ لای ئەو وەرسووڕاند و بە قەلافەت و سەرنجێکی جیددییەوە کە هێشتا جوانیی پێوە دیار بوو، ڕووی لە ئۆلێنین کرد کە بەبێ ئیزن خواستن خۆی کردبوو بە ماڵەکەیدا، نێوچاوانی تێکنا و گوڕاندی: «بۆ نیشتەجێ بوون؟ ڕەنگە زۆر دڵت خۆش بێ! ئێستا نیشتەجێ بوونێکت پیشان دەدەم کە گەزگەز باڵا بکەی. برۆ بەرچاوم چۆڵ کە!»

ئۆلێنین پێشتر پێیوابوو سوپای بەهێزی قەفقازیا کە ئەو ئەندامی بوو، لە هەموو شوێنێک و بە تایبەت لەلای کازاخەکان خۆشەویستە و خەڵکی کازاخ ئەو وەک پێشـمەرگەیەکی گۆڕەپـانی شـەڕ وەردەگـرێ، بـۆیە ئەم جـۆرە هەڵسوکەوتە تووشی سەرسووڕمانێکی زۆری کرد. بەڵام بێئەوەی خۆی شلوێ بکات، ویستی بۆ پیرێژنەکەی ڕوون بکاتەوە کە کرێماڵی دەداتێ، بەڵام پیرێـژن نەیهێشـت ئەو قسـەکەی تەواو بکـات، بە هەرا و گوڕەگـوڕ قسەکەی بە ئۆلێنین بڕی: «ئێرە بۆ هاتوون؟ چیتان لە گیانی ئێمە دەوێ؟ تۆ پێم ناڵێی بۆ دەمتان لە جەرگی ئێمە ناوە؟ بۆرەپیاوی بێڕیش[٢٤]، ڕاوەستە با ئاغا بێتەوە، ئەو مەزڵەکەت پیشان دەدا! من پێویستم بە پارەی گڵاوی تۆ نییە. خەڵک ئێوە باش دەناسن. ئێوە بە دووکەڵی تووتن[٢٥] ماڵەکانمان پیس دەکەن و دارودیواری بە دووکەڵی نەفرەت دادەپۆشن. دەتانهەوێ پارەشمان

٢٤ بە پێی باوەڕی مەسیحییەکانی قەدیم، تاشینی ڕیش تاوان بوو.

٢٥ بە پێی باوەڕی مەسیحییەکانی قەدیم، تووتن گیای شەیتانە.

پێ بدەن؟ ئێمە دەزانین ئێوە چ ئافاتێکن! لە خودا داوا دەکەم تیر لە گۆی مەمکتان دا و بە گوللەی گەرمەوە بن! ...»

ئۆلێنین لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڕاستی سەیرە! ژانۆ ڕاست دەکات، سەد شوکر بە تورکەکان!» هەروا کە ئۆلیتکا دەمی هەڵماڵیبوو و جنێوی دەدا، ئەم سەری داخست و لە ماڵەکە چووە دەرێ. لەو کاتەدا کە لە ماڵەکە دەچووە دەرێ، ماریانکای دی کە بە دەسماڵێکی سپی بەر دەم و لووتی هەڵدابوو و تەنیا چاوی بە دەرەوە بوو، بە پێخاوسی لە قاڵدرمەکان هاتە خوارێ و لووتی بە لووتی ئۆلێنیندا تەقی. بە چاوی گەش و بزەتێزاوی لە ئۆلێنینی ڕوانی و خێرا لە پشت ماڵەکە خۆی شاردەوە.

ئاکاری منداڵانە و سرک، نیگای دوو چاوی پڕ لە گرشە و سلۆک لە پشت دەسماڵێکی سپییەوە دەرکەوت و لەگەڵ خەتوخاڵی دەموچاوی ماریانکا لەو چرکەساتەدا وەک تەزوو بە دڵی ئۆلێنیندا هات و کاری لە ڕۆحی کرد. ئۆلێنین بیری کردەوە: «دەبێ خۆی بێ.» ئۆلێنین کە ئێستا کەمتر لە بیری ماڵ و خانوودا بوو و بەردەوام چاوی بۆ ماریانکا دەگێڕا، چوو بۆ لای ژانۆ. ژانۆ کە هێشتا خەریکی کردنەوەی کەلوپەلەکانی بوو، تۆزێ پشووی هاتبۆوە بەرخۆی و حەسابۆوە، گوتی: «دیتووتە چ کچێکی سلۆکە! دەڵێی جوانووەماینی حەمایەت نەکراوە!»

پاشان بە دەنگێکی بەرز و دلێرانەوە گوتیشی: «Lafemme»[٢٦] و بە شێوەیەکی گەوجانە قاقای کێشا.

---

٢٦ وشەیەکی فەڕەنسییە یانی ژن.

# یازده

سەر لە ئێوارە، گەورەی ماڵی لە ماسیگرتن هاتەوە و هەرکە بۆی دەرکەوت بۆ کرێی ماڵەکەی پارە وەردەگرێ، ژنەکەی خۆی هێور کردەوە و ژانۆ چاوەڕوانییەکانی بەجێهاتن و دڵی حەسایەوە.

هەموو شتێک لە ماڵە تازەکەدا کەوتە سەر باری خۆی. خاوەنماڵ لەگەڵ بنەماڵەکەی بەشی گەرمی ماڵەکەیان بۆ خۆیان دانا و ملازمی لاو بە بڕی سێ سکە کرێی مانگانە بەشەکەی تری ماڵەکەی بەکرێگرت. ئۆلێنین دوانیوەڕۆ عەسرۆژەیەکی خوارد و خەوت. لای ئێوارە خەبەری بۆوە. دەموچاوی شۆرد و ڕیشی تاشی، پاشان جگەرەیەکی داگیرساند و لەبەر پەنجەرەیەک کە بەرەو کۆڵان دەکرایەوە دانیشت. هەواکەی بەرەو فێنکی دەچوو. سێبەری کەشوتووشی ماڵەکە، کە دەتگوت سەردەرانەکەی پێوە نەماوە، بە سەر خۆڵەمڕەی کۆڵانەکەدا کشابوو و سەرەکەی تری گەیشتبووە پەنا دیواری ماڵێکی تر. سەربانی گوێسوانە چرپیوچاڵی ماڵەکەی ڕووبەڕوو، بە لێواری داتەپیوەوە لە ژێر تیرێژی کلومنجڕی خۆری ئێوارەدا دەدرەوشایەوە. هەواکەی فێنکی کردبوو. گوند لە باوەشی بێدەنگیدا بوو. سەربازەکان لە شوێنی خۆیان نیشتەجێ بووبوون. مێگەل و گاڕان هێشتا بەرەو ئاوایی نەهاتبوونەوە و پیاوانی دەشتەوان لە کاروباری ڕۆژانە نەگەڕابوونەوە.

ئەو ماڵەی ئۆلێنینی لێ نیشتەجێ بوو لە ئەوسەری گوندەکە هەڵکەوتبوو. جاروبار لە شوێنە دوورەدەستەکانەوە، ئەوبەری ڕووباری تەرەک، شوێنێک کە ئۆلێنین لێوەی هاتبوو؛ دەنگی کزی تەقەیەک دەهاتە گوێ. ئەم دەنگانەیان تەقەی چێچێنەکان بوو یان لە دەشتی کۆمیکەکانەوە دەهات. سێ مانگەی هوردوو ئۆلێنین زۆر خۆشی ڕابواردبوو. ئێستا فێنکاییەکی خۆشی لە سەر

ڕوومەتـی هەسـت پێکـرد و جەسـتەی بەهێـزی خـۆی دوای مـاوەیەکی زۆر ڕێبڕین، پاکوخاوێن هـاتە بەرچاو. هەستی کرد تەواوی ئەندامەکانی لەشـی ئاسـوودەیی و هێمنـایەتی و وزەیەکـی تایبەتییـان وەرگرتـووە. ڕۆحیشـی ڕووناک و حەساوە بـوو. ژیانی دەرەوەی شـار و مەترسییەکانی ڕابردووی وەبیر هاتەوە. هەروەهـا وەبیری هـاتەوە کە لە کـاتی بەرەوڕوو بـوون لەگەڵ مەترسـییەکان بە شـانازی و سـەربەرزییەوە هەڵسـوکەوتی کـردووە و لە کەسـانی تـر کەمتـر نەبـووە و ئێسـتا لە مـاڵی قەفقـازێکی ئـازا و بەجەرگ وەرگیـراوە. بیرەوەرییەکـانی مۆسـکۆ ئیتـر زۆر دوور بـوون و ئاسـەواریان نەمـابوو. ژیـانی ڕابـردوو وەک خەون و خەیـاڵی لـێ هـاتبوو و ژیـانێکی نوێ یەکجـار نـوێ، کە هێشـتاش لەودا بە هەڵەچـوون بـوونی هەبـوو، دەسـتی پێکردبـوو. ئەو دەیتـوانی لێـرە، وەک پیـاوێکی غەوارە لە نێـو خەڵکـانێکی نەناسـدا، سـەبارەت بە خـۆی بیـروڕای نـوێی هەبـێ و ڕێگـای بـاش و لەبـار بـدۆزێتەوە. هەسـتی بە شـادی و خۆشـی دەکـرد. هەسـتێک کە بە هـۆی کەفوکوڵی لاوی سەری هەڵدابوو و هۆکارێکی تایبەتی نەبوو. هێندێ جار لە دەربیجەکەوە چـاوی لەو منـداڵانە دەکـرد کە فڕفڕەیـان بە دەسـتەوە بـوو و یارییان دەکرد، هێندێ جاریش لەو ژیان و ماڵە نوێیەی خۆی دەڕوانـی و بە خـۆی دەگـوت کە ژیـانی نـوێی خـۆی لەم گونـدە کـازاخ نشـینە بە خۆشـی ڕادەبوێرێ. هەروا چاوی لە ئاسمان و کێوەکان دەکرد و تەواوی بیـرەوەری و خەونەکانی لەگەڵ هەستێکی ڕەقوتەق دەرهەق بە ئەم سروشـتە، ئـاوێتەی مەزنایەتی و شکۆ دەکرد و ژیانی ئەو بە شێوەیەکی دیکە، جگە لەوەی کـاتی هـاتنەدەرێ لە مۆسـکۆ بیـری لـێ دەکـردەوە، دەسـتی پێکردبـوو. بەڵام ئەو بەختەوەرییەی ئامێزی بۆ کردبۆوە، بە لایەوە زۆر چاوەڕوان نەکراو بـوو. کێوەکان، لووتکە و لاپاڵ و تیرەشان و شـاخ و ڕەوەز و دار و دەوەنەکانیـان هەمیشە بۆ ئەو سەرچاوەی هەست و بیر و خەیاڵ بوون.

لەو کـاتەدا ئەو منـداڵانەی لە کـۆڵانەکە یارییـان دەکـرد دەسـتیان کـرد بە قریوە و هەرا و هوریا. منداڵەکان هەموویان پێکەوە دەیانقیژاند و دەیانگوت:

«چاوی لێ بکەن، ئەو کابرایە دێڵەسەگ ماچ دەکات! گۆزەی ئاو دەلێسێتەوە! مامە ئیرووشکا دێڵەسەگی ماچ کردووە! مامە ئیرووشکا خەنجەری خۆی خواردووە!...»

منداڵەکان تێکڕا پێکەوە دەیانقیژاند و شانیان لە یەکتر دەدا و بۆ دواوە دەکشانەوە. مامە ئیرووشکا تفەنگەکەی لە شان کردبوو و کۆتری بە نێوقەدیدا هەڵواسیبوو و لە ڕاو دەگەڕایەوە. هەرکە گوێی لە قیژە و هاواری منداڵەکان بوو، قۆڵی بە توندی ڕاوەشاند و چاوی لە پەنجەرەی هەردوو بەری کۆڵانەکە کرد و گوتی: «بەڵێ خەتای منە! خەتای منە! من دێڵەسەگەکەی خۆمم خوارد، بەڵێ خەتای منە! مامە ئیرووشکا هەروا ئەو قسانەی دووپات دەکردەوە و لەگەڵ ئەوەی ڕقی هەستابوو، وای دەنواند کە گوێی لەو هاتوهاوارانە نییە.

ئۆلێنین کە ئەو هەڵسوکەوتەی منداڵەکانی دی زۆری پێ سەیر بوو. بەڵام قەڵافەتی سەیر و پڕهۆشی ئەو پیرەپیاوە کە مامە ئیرووشکایان پێ دەگوت زیاتر تووشی سەرسووڕمانی کرد. ئۆلێنین سەری لە دەربیجەکە بردە دەرێ و گوتی: «هۆی پیرەپیاوی کازاخ، وەرە بۆ ئێرە بزانم!»

پیرەپیاو چاوێکی لە پەنجەرەکە کرد؛ لەگەڵ ئەوەی کڵاوەکەی لە سەرە تاشراوەکەی خۆی دادەگرت، گوتی: «سڵاو باوە گیان!»

ئۆلێنین وەڵامی دایەوە: «سڵاو مامە گیان! ئەم منداڵانە بۆ وا دەکەن، چییان لە تۆ دەوێ؟»

مامە ئیرووشکا هاتە بەر پەنجەرەکە و بە دەنگە گڕ و بەرزەکەی خۆی کە تایبەتی پیاوانی بەڕێز و بەساڵاچووە، وەڵامی دایەوە: «چبکەم، سەر دەخەنە سەرم، دەیانهەوێ ئازارم بدەن. هیچ نییە. منیش ئەو کارەیانم پێ ناخۆش نییە. لێیانگەڕێ با ئەو منداڵانە سەر بخەنە سەر مامی خۆیان! وا دیارە تۆ سەرۆکی هەموو سەربازەکانی، وایە؟»

ـ نا، من قوتابییەکی زانکۆی سەربازیم. تۆ ئەو کۆترانەت لە کوێ ڕاو کردووە؟

پیرەپیاو پشتەپانەکەی وەرسووڕاند کە سێ دانە کۆتری مێوەی پێوە هەڵواسیبوو. کۆترەکان لاقیان بە پشتێنەی پیرەپیاوەکەوە بەسترابوو و خوێنەکەیان بە ئاتەگی چەرکساکەیەوە گیرسابوو. ئیرووشکا وەڵامی دایەوە: «لە دارستان سێ دانە مێوەم گرتووە. تۆ کۆترە گایانەت دیوە؟ ئەگەر دەتەوێ دوو دانەیان دەدەم بە تۆ، هانێ!» پیرەپیاو ئەوەی گوت و دوو دانە کۆتری لە بەر پەنجەرەکە دانا و پاشان گوتی: «تۆش لەوە دەچێ ڕاوچی بی؟»

ـ بەڵێ، من لە سەحرا چوار دانە کۆترم ڕاو کردووە.

پیرەپیاو بە لەبزێکی گاڵتەئامێزەوە گوتی: «چوار دانە؟ ئەوە زۆر باشە! دەی، لەگەڵ شەڕاب خواردنەوە چۆنی؟ تۆ چیخیر دەخۆیەوە؟»

ـ ئەی بۆ ناخۆمەوە؟ من زۆرم حەز لە چیخیرە.

ـ چاکە! زۆر چاکە! کەوایە بۆم دەرکەوت تۆ مرۆڤێکی بەجەرگی! ئێمە پێکەوە دەبین بە هاوڕێ.

ئۆلێنین گوتی: «وەرە ژووری! وەرە با پێکەوە چیخیر بخۆینەوە.»

مامە ئیرووشکا وەڵامی دایەوە: «کەوایە قەیناکا، ئەم کۆترانە بۆ تۆ.»

پیرەپیاو بە ڕواڵەتیدا دیار بوو ئەو ئەفسەرە لاوەی کەوتۆتە بەر دڵ. بۆشی دەرکەوت دەتوانێ لە لای ئەو لاوە غەوارەیە بە خۆڕایی شەڕاب بخواتەوە و هەر بەو هۆیە دڵی نەرم بوو دوو دانە لەو کۆترانەی ڕاوی کردبوو، بیدا بە ئۆلێنین. دوای چەند چرکەیەک سێبەری مامە ئیرووشکا گەیشتە پشت دەرگای ماڵەکەی. لەوێ بوو کە ئۆلێنین چاوی بە قەڵافەتی زەبەلاح و بەهێزی ئەو پیرەپیاوە کەوت. لەگەڵ ئەوەی سەروچاوی سوورهوول و تاوەسووتی ئەو بە ڕیشی زۆر و سپی و چرچولۆچی دەموچاویەوە نیشاندەری تەمەنی زۆر و ئەرک و زەحمەتی لەڕادەبەدەر بوو؛ کەچی لاقولەتەر و دەستومەچەکی و شان و باهۆی وەک هی پیاوێکی گەنج و بەهێز دەچوو. سەرە تاشراوەکەی، شوێنی شکان و برینی قووڵی پێوە دیار بوو. ملە ئەستوورەکەی قوڵە و ئەستوور، دەتگوت گرێ دارە و

وەک ملـی جوانەگـایەکی بـوغە لە هەمـوو لایەکەوە لۆچوپـۆچی تێکەوتبـوو. دەسـتە زبـر و قەڵەشـیوەکانی دەتگـوت پەلـی کـۆتەرەی دار گـوێزن. مـامە ئیرووشکا لە کەرکەرۆکی دەرگاکە هاتە ژووریَ و بە هەنگاوی گورج و خێرا لە ئۆلێنین نزیک بۆوە. تفەنگەکەی لە شـانی دامـاڵی و لە سـووچێک داینـا؛ بە سەرنجێکی خێرا لە هەموو کەلوپەلەکانی نێو ژوورەکەی ڕوانی و بە جزمەی قایشەوە، بێ ترپە لە چەقی ژوورەکەدا ڕاوەستا. لەگەڵ ئەودا بۆنی چیخیر و ودکا و بارووت و خوێنی گیرسـاوی کۆتر و بۆدڕنی لەشـی پیرەپیـاو تێکەڵ بوون، کە هەوای ژوورەکەی قورس کرد.

مامە ئیرووشکا سڵاوی لە وێنەی عیسـا و مریەم کرد؛ دەسـتی بە ڕیشـی خۆیـدا هێنـا و دەسـتی ڕەش و گەورەی بـۆ تەوقە کـردن لە ئـۆلێنین نزیـک کردەوە و گوتی: «خۆشگێلدی! ئەوە بە زمانی تورکی یانی: بەخێر بێی!»

ئـۆلێنین دەسـتی بـرد تەوقەی لەگەڵ کـرد و گـوتی: «خۆشگێلـدی! منـیش دەزانم!»

مامە ئیرووشـکا لەگەڵ ئەوەی بە تەشـەرەوە سـەری دەلەقاند گوتی: «نـا! تـۆ هـیچ تێنـاگەی، تـۆ لەم زمـانە شـارەزا نیـی! گەوجە! کاتێـک پێـت دەڵـێن خۆشگێلدی، تۆ دەبێ لە وەڵامدا بڵێی: ئەڵڵا ڕازی بووسـوون، یـانی خـودات لێ ڕازی بێ! دەبێ ئاوا وەڵام بدەیتەوە. مامە گیان نەک خۆشگێلدی. قەیناکـا من هەموو ئەوانەت فێر دەکەم. ئێرە کەسێکی لێبوو بە ناوی ئێلی مووسەئیچ، کەسێک بوو لە تیرەی ئێوە، یانی ڕووس بوو. جا ئاغایەکی بە مـاڵم، مـن و ئەو پێکەوە بووینە هاوڕێ. ئەو پیاوێکی بەجەرگ بوو! مـن ئـارەق خـواردن و دزی و چەتەیی و ڕاوم فێر کرد.»

ئۆلێنین کە زۆری پیرەپیاوە کەوتبووە بەردڵ، گوتی: «ئەی چی فێـری مـن دەکەی؟»

ـ مـن تـۆ دەبەم بـۆ ڕاو، فێـرت دەکەم چـۆن ماسـی بگـری، چێچێنیەکـان پیشانی تۆ دەدەم، ئەگەر بتهەوێ لەگەڵ کچێکی جوانیش کەینوبەین سـازکەی

مـن بـۆت جێبەجـێ دەکەم؛ مـن وەک ئـاردی بەهـاروو وام!... زۆر شـتم لە دەست دێ، من مرۆڤێکی دڵتەڕ و بەگوڕم!

پیرەپیاو دەستی کرد بە پێکەنین و پاشـان گوتیشـی: «ئێستا مـامە گیـان، من دەمهەوێ دانیشم، زۆر ماندووم. خۆ بە پێوە ناگرم، کارگا؟»

ئۆلێنین پرسی: «کارگا؟ یانی چی، ئەو وشەیە یانی چی؟»

ـ یانی، باشە، بە زمانی گورجی. ئەم وشەیە تایبەتی منە و زۆریشـی حەز پێدەکەم. کارگا! کارگا، من ئاوا قسە دەکەم، کاتێک ئەو وشەیە بە دەممدا دێ، نیشاندەری ئەوەیە کەیفم سازە، دەی مامە گیان، ئێستا پێیان بڵێ با چیخیر بێنن. وا دیارە سەرناوێکیشت هەیە! چی؟ ئیڤان!»

پیرەپیـاو دەنگـی هەڵێنـا: «ئیڤـان؟» پاشـان گـوتی: مەگـین لە وڵاتـی ئێـوە سەربازەکان هەموو ناویان ئیڤان نییە؟ سەرناوی تۆش هەر دەبێ ئیڤان بێ، وا نییە؟

ـ وایە، ئیڤانە. پاشـان دەنگـی هەڵێنـا: «ژانـۆ! بـڕۆ چیخیـر لە خاوەنمـاڵەکە وەرگرە و بیهێنە.»

ـ ژانـۆ یـان ئیڤـان، جیـاوازی نییە؟ یـانی هەردووکیـان هەر یەکـن؟ بـۆ لە وڵاتی ئێوە بە هەموو سەربازەکان دەڵێن ئیڤان؟ پاشان پیرەپیاو دەنگی بەرز کـردەوە: «ئیڤـان، چیخیـر لە کـووپەیەک تـێکە، تـازە سـەرەکەی کـرابێتەوە. خاوەنی ئەم ماڵە باشترین چیخیری ئەم گوندەی هەیە. بۆ نیوەی چارەکێک لە سێ کۆپک زیاتریان مەدەیە، دەنا ئەو جادووکارە پیرە ـ بە دەنگێکی نزم و شێوە سرتە گوتی: خەڵکی ئێرە زۆر سەیرن، ئێوە بە مرۆڤ نـازانن. بۆ وێنە تۆ، ئەوان پێیان وایە تۆ لە تورک خراپتری. ئێوە، ئێوە ڕووسەکان هەمووتـان لادین و دڵڕەشـن؛ بەڵام مـن پێم وایە تـۆ لەخـۆڕا بـووی بە سـەرباز. چـونکە دیارە پیاوێکی باشی. دیارە تۆ هیچ تێناگەی. من حەقمە ئاوا بیـر بکەمەوە، وا نییە؟ ئێلـی مووسـەئیچ سـەرباز بـوو، زۆریـش کـوڕێکی بـاش و ڕۆحسـووک بـوو. بیـروڕای تـۆ چییە مـامە گیـان؟ هەر لەبەر ئەوەیە لێـرە خەڵکـی خـۆیی منیان خۆش ناوێ؛ بەڵام بۆ من هیچ جیاوازییەکی نییە و گوێم بە قسەی هیچ

کەس نابزوێ. من پیاوێکی دڵشادم و هەموو کەسێکم خۆش دەوێ. من ناوم ئیرووشکایە، بەڵێ ئاوا مامەگیان!»

پیرەپیاو ئەوەی گوت و بە مێهرەبانییەوە دەستی لەسەر شانی ئۆلێنین دانا.

# دوازده

ژانـۆ کە لەو مـاوەیەدا توانیبـووی هەمـوو کاروبارەکـان ڕاپەڕێنـێ و تەنانەت لە لای سەرتاشەکەی سەربازخانە ڕیشیشی بتاشـێ، بە نیشـانەی نیشـتەجێ بـوونێکی درێژخـایەن دەرەلینگـی پـانتۆڵەکەی لە پۆسـتاڵەکانی هێنـابووە دەرێ و زۆر دڵخـۆش و بەکەیـف بـوو. ئەو بە وردی چـاوی لە مامە ئیرووشکا دەکرد و بێ ئەوەی حەز بە دیتنی بکات، وەک ئـاژەڵێکی نامۆ لێی دەڕوانـی و کە گەیشـتە نێـو ژوورەکە، چاوی لە تەرکەکەی کرد کە پێڵاوەکـانی مـامە ئیرووشـکا پیسـی کردبـوو، لە ژێـر ئەسـکەملەکە دوو بتریـی خـاڵیی هەڵگـرت و چـوو بـۆ لای خـاوەنی مـاڵەکە. هەرکە چـاوی بە ژنـی خاوەنمـاڵ کەوت بڕیـاری دا زۆر لەســەرەخۆ و بە مێهرەبـانییەوە لەگەڵـی بەرەوڕوو بـێ، گـوتی: «سـڵاو، خـانمە بەڕێزەکـان! ئەربـابەکەم ناردوومی بۆ لای ئێوە چیخیرتان لێ بکڕم. تکایە برێکم پێ بفرۆشن.»

پیرێـژنەکە وەڵامـی نەدایەوە. کـچەکەی کە لە بەر ئـاوێنەیەکی تـورکی ڕاوەسـتابوو و خەریکـی بە سـەردا دانـی لەچـکەیەک بـوو، بـێ ئەوەی قسەیەک بکات، چاوی لە ژانۆ کرد، بەڵام متەقی نەکرد. ژانۆ لەگەڵ ئەوەی خرینگەی لە پارە بڕۆنزەکانی گیرفانی دێنا گوتی: «بـۆچی شـەڕابمان پـێ نافرۆشن خانمە بەڕێزەکان، من پارەی شەڕابەکە دەدەمە خزمەتتان، تەنیا حەز دەکەم لەگەڵ ئـێمە بە مێهرەبـانی بجـووڵێنەوە، بـا ئـێمەش بە ڕێـز و مێهرەبانییەوە لەگەڵ ئێوە هەڵسوکەوت بکەین، لەوەش چـاتر ئیدی چیتـان دەوێ؟

پیرێژنەکە لە ناکاو پرسیی: «زۆرتان دەوێ؟»

- نیوە چارەکێک.[27]

پووره ئۆلیتا ڕووی لە کچەکەی کرد و گوتی: «بڕۆ پێی بدە. هەر لەو چلیکەی بۆ تێکە کە تازە هەڵمان پچڕیوە کچم.

کچە کلیلەکە و دۆلکەیەکی هەڵگرت و لەگەڵ ژانۆ چووە دەرێ. لەو کاتەدا ئۆلێنین ڕووی لە ئیرووشکا کرد و لەگەڵ ئەوەی ماریانکای پیشان دا کە بە بەر پەنجەرەکەدا تێدەپەڕی، گوتی: «تکات لێدەکەم پێم بڵێ ئەم ژنە کێیە؟»

پیرەپیاو چاوێکی داگرت و قۆڵی ئۆلێنینی گرت، کێشای بۆ لای خۆی و گوتی: «پەلە مەکە!» پاشان ملی بۆ لای پەنجەرەکە خوار کردەوە و لەگەڵ نەرمە کۆخەیەک گوتی: «ئەها، ئەها! ماریانکا! مەبەستت ماریانکا چکۆلە، ماریانکا دەڵێی مامە گیان؟» پاشان لەگەڵ ئەوەی چاوی لە چاوی ئۆلێنین بڕیبوو گوتیشی: «ماریانکا گیان! چاو لە من بکە، لەگەڵ تۆمە ماریانکا!»

کچە بێ ئەوەی سەری وەرسووڕێنێ، لەگەڵ ئەوەی بە توندی دەڕۆیشت و دەستی ڕادەوەشاند، بە شێوەی ژنانی کازاخ، یانی شۆخ و وریا و ڕووکراوە، بە بەر پەنجەرەکەدا تێپەڕی. تەنیا ئاوڕێکی سلۆکانەی لە پیرەپیاو دایەوە و چاوە ڕەش و خومارەکەی ترووسکەی هات. مامە ئیرووشکا دیسان دەنگی هەڵبڕی: «منت خۆش بوێ، بەختەوەر دەبی!» چاوێکی قرتاند و سەرنجی بۆ چرکەساتێک لە سەر چاوی ئۆلێنین گیرسایەوە و دیسان ڕووی دەمی لە ماریانکا بوو، گوتی: «من پیاوێکی شیرینم. ئەوەش کچ نییە، فریشتەیە! ئەرێ، دەڵێی شازادەیە!»

ئۆلێنین چاوی لە مامە ئیرووشکا کرد و گوتی: «زۆر جوانە، پێی بڵێ بێت بۆ ئێرە.»

پیرەپیاو گوتی: «نا! ئەو کچە دیاری کراوی لووکاشکایە. لووکاشکا، کازاخێکی گەنج و پاڵەوانە. دوێنێ یەکێک لە ئابرەکەکانی کوشتووە. من

---

٢٧ مەبەست لە نیوە چارەکێک، لە جلیکێکە نەک لە بترییەک

کچێکی لەو جوانترت بۆ پەیدا دەکەم؛ خەمت نەبێ. دەبێ کچێکت بۆ بدۆزمەوە وەک پەنیری تەڕ وا بێ. لەشی وەک لۆکەی کانیاو نەرمونیان بێ. دڵینا بە ئەوەی بەڵێنم پێداوی جێبەجێی دەکەم؛ کچێکت بۆ ساز دەکەم وەک مانگی چاردە وابێ.»

ئۆلێنین گوتی: «ئەوە دەڵێی چی پیرەپیاو، ئەوە گوناهە.»

پیرەپیاو بە لەبزێکی لێبڕاوانە وەڵامی دایەوە: «گوناهـ؟ جا بۆ گوناهە. چاولێکردنی بەژنوباڵای کچێک بۆ گوناهە؟ ڕابواردن لەگەڵی گوناهە؟ خۆشویستنی گوناهە؟ یانی ئێوە ئەو ڕوانگەیەتان هەیە؟ نا مامە گیان، ئەوە نەک گوناهـ نییە، بەڵکوو زۆریش خێرێکی گەورەیە. خودا تۆی خوڵقاندووە کچانیشی خوڵقاندووە. هەموو کارەکان لە دەستی ئەودایە، مامە گیان. کەوایە دڵنیا بە سەیر کردنی کچان گوناهـ نییە. چونکە خودا بۆیە کچی خوڵقاندووە کە پیاو خۆشی بوێ و لەگەڵی ڕابوێری، خودا کچی بۆ خۆشیی دنیا ئافراندووە. من ئەوە بیر و باوەڕمە، مامە گیان.»

ماریانکا لە حەوشەکە تێپەڕی و خۆی کرد بە خەڵوەتییەکەدا کە پڕ بوو لە چلیکی شەڕاب. دۆعایەکی ئاسایی کە لە بەری بوو، خوێندی. چوو بۆ لای یەکێک لە چلیکەکان و ئاوگەردانێکی تێ هەڵێنجا. ژانۆ لە بەر دەرگای خەڵوەتییەکە ڕاوەستابوو و لەگەڵ ئەوەی چاوی لە بەژنوباڵای کچە دەکرد، بزەیەک نیشتبووە سەر لێوی. بە بڕوای ئەو زۆر ناحەز و پێکەنینی بوو کە کراسەکەی ماریانکا لە دواوە قۆپچەکانی داخرابوون و لە پێشەوەش فش بووبۆوە؛ لەوەش پێکەنینی تر بە بڕوای ئەو ئەوە بوو کە ماریانکا چەند دانە سکەی نیوە ڕۆبڵیی بە گەردنیدا هەڵواسیبوو. بیری کردەوە کە ئەم کارە لە ڕووسیا باو نییە و لەوێ ئەگەر کچێک بەو شێوەیە خۆی بڕازێنێتەوە هەموو پێی پێدەکەنن. پاشان لە دڵی خۆیدا گوتی: «La Fille’ commc c’cst tre’s biem»[٢٨] ئەمە دەبێ بە ئاغاکەم بڵێم.»

---

٢٨ ڕستەیەکی فەڕەنسییە، یانی «چەندە کچێکی باشە.»

لە ناکاو کچە دەنگی هەڵێنا: «بۆ دەڵێی داهۆڵی لەوێ چەقیوی؟ غەوارەی بێ شەرەف، تاریک مەکە! زووکە، دۆلکەکە بدە بە من!»

پاشان دۆلکەکەی پڕ کرد لە شەڕابی سووری تازە و دای بە ژانۆ، لەگەڵ ئەوەی دەستی کێشایەوە دواوە گوتی: «پارەکەی بدە بە دایکم.»

ژانۆ قاقایەکی کێشا و بە ڕوویەکی خۆشەوە لەگەڵ ئەوەی بە لاترساکە بەستن دەڕۆیشت و لاقی تێکەڵ دەهات، ڕۆیشت و بە دەم ڕۆیشتنەوە گوتی: «ئێوە خانمەکان بۆ ئەوەندە تووڕەن؟»

کچە لەگەڵ ئەوەی خەریک بوو سەری کووپەکەی دەنایەوە بە پێکەنینەوە گوتی: «بۆ ئێوە ئەوەندە چاکن؟»

ژانۆ ئاوڕی دایەوە بە لەبزێکی لێبڕاوانە و پڕ لە دڵنیاییەوە گوتی: «من و ئاغاکەم زۆر پیاوی چاکین، ئێمە ئەوەندە باش و مێهرەبانین لە هەر جێگایەک ماڵمان گرتبێ، خەڵکی لێمان ڕازی بوون. هۆیەکەشی ئەوەیە ئاغا لە بنەماڵەیەکی خانەدانە.»

کچە ڕاوەستا تاکوو بە جوانی گوێی لە قسەکانی بێ.گتێکی گرت و پاشان گوتی: «ئاغاکەت ژنی هێناوە؟»

ژانۆ بە لەبزێکی قورساخانە وەڵامی دایەوە: «نا! ئاغاکەم گەنجە و بوخچەی نەکراوەیە. هۆیەکەشی ئەوەیە خەڵکانی خانەدان قەت ناتوانن بە گەنجی زەماوەند بکەن.»

کچە لێوی خۆی گەست و گوتی: «قسەیەکی جوانە، کابرا هێندە زەبەلاحە بە قەد کەڵێکی لێ هاتووە، کەچی بۆ زەماوەند کردن هێشتا گەنجە! دەی ئاغاکەی تۆ سەرۆکی هەمووتانە؟ باشە من نازانم بوونە ئەفسەر چ قازانجێکی هەیە؟»

ـ ئاغاکەی من خوێندکاری فێرگەی سەربازییە و هێشتا نەبووە بە ئەفسەر، بەڵام پلەوپایەی ئاغاکەم زۆر لە ژێنراڵ و کەسانی پایەبەرز باڵاترە. نەک سەرهەنگەکەمان، بەڵکوو تێزاریش ئاغاکەم دەناسێ.

ژانۆ ئەم ڕستەیەی زۆر بە غورووورەوە دەربڕی و پاشان گوتیشی: «ئێمە وەک خەڵکانی دیکە نین لە بن تەپڵەگوێنی دەرپەڕیبێنتین. باوکی ئێمە سێناتۆرە. ئەو زیاتر لە هەزار مووژیکی[٢٩] هەیە و پارەی هەزار ڕۆبڵی بۆ ئێمە دەنێرێ و زۆری ئێمە خۆش دەوێ. خۆ گەورەیی بە پلەوپایەی سەربازی نییە، ملازمی وامان هەیە ئەسپی لە گیرفانیدا سەوزەڵێ دەڵێ. تۆ دەڵێی بوونە ئەفسەر چ قازانجێکی هەیە؟...

کچە قسەکەی ژانۆی بڕی و گوتی: «بڕۆ دەرێ باشە، دەمەوێ دەرگاکە داخەم.»

ژانۆ شەڕابەکەی هێنا بۆ ئۆلێنین و گوتی: « La fille c'est tre's fouli»[٣٠] پاشان بە پێکەنینێکی گەوجانەوە لە دەرگاکە چووە دەرێ.

---

٢٩ مووژیک: ڕەعیەت لە ڕووسیای کۆن

٣٠ ڕستەیەکی فەڕەنسییە، یانی «ئەو کچە زۆر جوانە.»

# سێزده

لەم نێوانەدا کەڕەنای بێدەنگی و خەوتن لە گۆڕەپانەکە لێدرابوو. خەڵکی لە کار دەگەڕانەوە. لە کۆڵان و گۆڕەپانی گوندەکەدا ئاژەڵەکان دەیانبۆڕاند و لاقەبرغەیان تێک دەکوتا و تەپوتۆزیان ساز کردبوو. کچان و ژنان بە کۆڵان و حەوشەکاندا هاتوچۆیان دەکرد و ماڵاتەکانیان دادەکردە تەویلە و گەوڕەکان. هەتاو بە تەواوی لە پشت کێوە دوورەدەست و پڕ بەفرەکان ئاوا بووبوو. تەنیا تارماییەکی کەهوو زەوی و ئاسمانی داگرتبوو. لە سەرووی دارستانە تاریکەکانەوە، ئەستێرە تازە هەڵاتبوون و سریوەیان دەهات. وردەوردە بێدەنگی گوندەکەی داگرت.

ماڵات لە سەر گێڕ و گەوڕەکاندا سرەوتبوون. ژنانی کازاخ لە ماڵەکان هاتبوونە دەرێ و لە کۆڵان دانیشتبوون و تووی گوڵەبەڕۆژەیان دەترووکاند. ماریانکاش دوای ئەوەی گامێش و دوو مانگاکەی دۆشی، چوو بۆ نێو پۆلێک لەو ژنانە.

ئەو دەستەیە لە چەند ژن و کچ و کازاخێکی پیر پێک هاتبوو. باسی ئەبرەکە کوژراوەکەیان دەکرد. کازاخی پیر بۆی باس دەکردن و ژنان پرسیاریان لێ دەکرد. یەکێک لە ژنەکان پرسیی: «حەتمەن خەڵاتێکی باش دەدەن بە لووکاشکا.»

ـ ئەرێ. وەک باسی دەکەن بڕیار وایە نیشانێکی خاچی بۆ بنێرن.

ـ مۆسۆڤ زۆر خراپی هەڵسوکەوت لەگەڵ کردووە، یانی تفەنگەکەی لێ ساندووە. بەڵام لە کیزلیار سەرۆکەکان ئەو هەواڵەیان پێگەیشتووە.

ـ ئەو مۆسۆڤە چ پیاوێکی بێ شەڕەفە! کچێکی گەنج کوتی:

ـ لووکاشکاە چکۆل هاتۆتەوە، من وام بیستووە.

ـ چوون بۆ لای ئیانکا (ئیانکا بێوەژنێکی کازاخ بوو کە بە دزییەوە مەیخانە و قەحبەخانەیەکی بەڕێوە دەبرد) ڕایبوێرن؛ ئەو و ناسایر پێکەوە چوون. ڕەنگە تا ئێستا پێکەوە نیوە کووپەیەکیان خواردبێتەوە.

ژنێکی تر هەڵیدایە: «ئەو گەنجە بەجەرگە نێوچاوانەکەی هێناویەتی! بەڕاستی کوڕێکی ئازا و بەجەرگە! زۆریش کوڕی چاکە. لە زیرەکیدا هیچ کەسی ناگاتێ! ڕاست وەکوو باوکی وایە! سیریاکی پیر، باوکی لووکاشکا، ڕاست وەکوو ئەم وا بوو، کاتێک باوکی کوژرا تەواوی گوندەکە فرمێسکی بۆ ڕشت و ماتەمبار بوو... چاویان لێکەن، ئەو سێ تاپۆیەتان دیوە، دڵنیام ڕاست ئەوانن؛ ئەو کەسەی قسەی دەکرد چەند کەسی کازاخی پیشان ژنەکانی دیکە دا کە بەرەو لای ئەوان دەهاتن و گوتیشی: «ئەرگۆشۆڤیشیان لەگەڵدایە! چاویان لێ کەن چۆن مەستیان کردووە!»

لووکاشکا و ناسایر و ئەرگۆشۆڤ کە نیوە کووپەیەکیان هەڵقوڕاندبوو، بە لاتراسکە بەستن بەرەو لای ژنەکان دەهاتن. هەرسێکیان، بەتایبەت کازاخی پیر، زیاتر لە کاتی ئاسایی سوور هەڵگەڕابوو. ئەرگۆشۆڤ لاقی تێکەس دەهات و لەتری دەدا، بە دەنگی بەرز قاقای دەکێشا و مست و سیخورمەی لە لاکەلاکەی ناسایر دەکوتا. لەو کاتەدا کتوپڕ دەنگی هەڵبڕی: «هۆی، چەتیوانە! بۆ گۆرانی ناڵێن؟ زووکەن تێ چریکێنن با ئێمە خۆشی ڕابوێرین.»

ژنەکان بە جێی سڵاو گوتیان: «ئەوە چییە؟ بۆ وەسەرتان کردووە نایبڕنەوە؟»

ژنێک گوتی: «گۆرانی بڵێن؟ مەگین جێژنە گۆرانی بڵێین؟ تۆ کووپەیەکت شەڕاب هەڵداوە خۆت گۆرانی بڵێ؟»

ئەرگۆشۆڤ پێکەنی و قۆڵی ناسایری کێشا تۆزێ خۆی ئەمبارەوبار کرد و گوتی: «تۆ برۆ بۆ ئەوێ! منیش گۆرانی دەڵێم، من دەزانم چبکەم؟»

ناسایر گوتی: «هۆی کچە جوانەکان، مەگین خەوتان لێ کەوتووە؟ ئێمە بۆ ڕێزگرتن لە لووکاشکا هاتووین. لە پاسگاوە هاتووین جێژن و میوانی بە بۆنەی ئەو سەرکەوتنە گەورەی لووکاشکاوە ڕێک بخەین.»

لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی لەو پۆلە ژنە نزیک دەبۆوە، کڵاوە کەڵپۆسەکەی لە سەری داگرت و بەرەو ڕووی ژنەکان ڕاوەستا. ڕوومەت و لاملی سوور هەڵگەڕابوو و خۆی قیت کردبۆوە و بە ویقارٍ و ئارامی قسەی دەکرد، بەڵام لەو ئاخافتنە هێمن و پڕویقارەدا وزە و ژیانێکی زیاتر شەپۆلی دەدا و زۆر لەگەڵ هەڕوگیف و چەنەوەری ناسایر جیاواز بوو. بە دیتنی لووکاشکا جوانووە ئەسپێکت وەبیر دەهاتەوە کە کلکی هەڵدێنێ و دەحیلێنێ و وەها لە جێی خۆی دەچەقێ وەک ئەوەی بە عەرزییەوە مێخکوت کرابێ. لووکاشکا لە هەمبەر ئافرەتەکاندا بێ جووڵە ڕاوەستابوو و بریقە و بزە لە چاو و لێوی نەدەبڕا، کەمی قسە دەکرد و هێندێ جار چاوی لە هاوڕێکانی دەکرد و هێندێ جاریش لە کچەکان. کاتێک ماریانکا هات بۆ نێو ژنەکان، لووکاشکا بە شێوەیەکی ئاسایی و لەسەرەخۆ، کڵاوەکەی لە سەری داگرت، چەند هەنگاو چووە دواوە و بەرەڕووی کچە ڕاوەستا؛ لەگەڵ ئەوەی لاقێکی تۆزێ لە دواوەترەوە دانابوو، هەردوو قامکە کەڵەی دەستی لە بەر پشتێنەکەی هەڵەقاندبوو و چوار قامکەکەی دەستە چەپی لە سەر مشتووی خەنجەرەکەی دەجووڵاندەوە. ماریانکا لە وەڵامی سڵاوەکەی ئەودا بە هێواشی سەری دانەواند، پاشان لە سەر زەوی دانیشت و مشتێکی تووی گوڵەبەڕۆژە لە گیرفانی باخەڵی دەرهێنا. لووکاشکا بەبێ ئەوەی سەری داخا، چاوی لە ماریانکا دەکرد و تووی دەترووکاند. لەگەڵ هاتنی ماریانکا هەمووان بێدەنگ بوون. بەڵام ژنێکی کازاخ بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی: «دەی پێمان بڵێ، تۆ هاتوویەوە زۆر لێرە بمێنیتەوە؟»

لووکاشکا قۆڕساخانە وەڵامی دایەوە: «هەتا بەیانی لێرە دەبم.»

پیرەپیاوێکی کازاخ کە لە نێو ژنەکاندا دانیشتبوو گوتی: «وەلحاسڵ هیوادارم هەمیشە شاد و دڵخۆش بی! من زۆرم ئەو کارەی تۆ بەدڵە. هەرئێستا باسی ئەوەمان دەکرد.»

ئەرگۆشۆڤ مەستانە و بە پێکەنینەوە گوتی: «منیش هەر ئەوە دەڵێم!»

پاشان لەگەڵ ئەوەی ئاماژەی بە سەربازێک کرد کە لەوێوە تێپەڕی، گوتی: «میوانەکان چەندە زۆر بوون! ڤۆدکای سەربازەکانی شتی چاکە، زۆرم حەز لێیە پیکێک هەڵدەم.»

یەکێک لە ژنەکان گوتی: «سێ دێویان بۆ ئێمە ناردووە! پیرەپیاو چووە بۆ فەرمانگە، بەڵام پێم وا نییە لەوێ هیچ کارێکی هەبێ.»

ئەرگۆشۆڤ گوتی: «ئاخ، ئاخ، کەوایە بارودۆخەکە ئاڵۆزە؟»

ژنێکی دیکە هەڵیدایە: «حەتمەنماڵەکەیان بە دووکەڵی توتن قانگ داوی، وا نییە؟»

ــ لە حەوشەکە ئەوەندەی حەزیان لێیە با جگەرە بکێشن، بەڵام لە ژوورەکاندا هەقیان نییە و ڕێگەیان پێ نادەین؛ تەنانەت ئەگەر سەرکردەکەشیان بێت ناهێڵین لە ژوورەکەدا جگەرە بکێشێ. لەوەش خراپتر، ئەوانە لەوانەیە دزیش بکەین. ئاساییشە، سەرۆک ئەو زۆڵانەی لە لای خۆی ڕانەگرتووە.

ئەرگۆشۆڤ دیسان گوتی: «وا دیارە ئەم کارەت بە دڵ نەبووە!»

ناسایر، لەگەڵ ئەوەی وەک لووکاشکا لاقێکی کێشایە دواوە و وەک ئەو کڵاوەکەی لە سەری داگرت، گوتی: «وەک دیارە، کچان ئەرکی ئەوەیان کەوتۆتە سەر شان جێگاوبان بۆ سەربازەکان ڕاخەن و چیخیر و هەنگوینیان بدەنێ.»

ئەرگۆشۆڤ دای لە قاقای پێکەنین و لە ناکاو ئاوقای نزیکترین کچ بوو کە دانیشتبوو و باوەشی پێداکرد.

ـ وا نییە؟ دەی پێم بڵێ وا نییە؟

کچە هاواری لێ هەستا و گوتی: «بۆرەکەی منجڕ بەرم دە! شەرتبێ بە ژنەکەت بڵێم.»

ئەرگۆشۆڤ گوتی: «دەی پێی بڵێ! ناسایر ڕاست دەکا، حەتمەن دەستوورێک هاتووە؛ ئەو خوێندەوارییی هەیە و دەتوانێ بخوێنێتەوە. بابەتەکە ڕاست وایە.»

پاشان ئەرگۆشۆڤ ویستی کچێکی نزیکی خۆی ماچ بکات. ئۆستینکا بە دەموچاوی خڕ و سپی و سۆڵەوە، لەگەڵ ئەوەی دەستی هەڵێنابوو بە زللە لە ئەرگۆشۆڤ بدا، هاواری کرد: «بڕۆ دواوە بێ شەڕەف!»

ئەرگۆشۆڤ چووە دواوە و لاتراسکەی بەست، خەریک بوو بکەوێ.

ـ دیتووتە، دەڵێن کچ زەعیفەیە و توانای نییە! خەریک بوو ملم بشکێنێ.

ئۆستینکا قیژاندی: «ئاوات لێدەکەم هەتیوە نەگبەتە! وا دیارە شەیتان لە پاسگاوە پەلکێشی کردووی بۆ ئێرە!» لەگەڵ ئەوەی ڕووی لێ وەرگێڕابوو، دیسان بە دەنگی بەرز گوتی: «مەگین تۆ لەگەڵ ئەو ئابرەکە بەرەوڕوو نەبووی؟ ئاخ، داخی بە جەرگم، بریا بیخنکاندبایەی، تۆی ناچیزە حەیفە زیندوو بی.»

ناسایر بە پێکەنینەوە گوتی: «ئەگەر بمردایە لە حەیبەتا دیقت دەکرد!»

ـ ئەرێ، بە سەری بابم، تۆشیان لەگەڵ ئەودا بکوشتایە مێشێکم میوان نەبوو.

ئەرگۆشۆڤ گوتی: «دیتووتە، گوێی مەدەیە! گوتت لە حەیبەتا دیقی دەکرد، ها؟»

لووکاشکا، لەو ماوەیەدا بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ چاوی لە ماریانکا بڕیبوو. دیار بوو ئەو تێڕامانەی کچەی پەشۆکاندووە.

لووکاشکا لە ماریانکا نزیک بۆوە و گوتی: «دەی، ماریانکا، وا دیارە ملازمێک لە ماڵی ئێوە جێی خۆش کردووە.»

ماریانکا وەک هەمیشە، لەڕێوە وەڵامی نەدایەوە، بەڵام چاوی لە لووکاشکا زەق کردەوە. لووکاشکا ڕوخساری بە بزەیەک کرابۆوە. وەک

ئەوەی لەو کـــاتەدا بابەتێـــک لە نێوانیانـــدا ڕووی دابـــێ و پێوەنـــدیی بە قسەکانیانەوە نەبووبێ. دایکی ماریانکا پەڕییە نێو قسەکانیان و گوتی: «بەڵێ، ئاغا زۆر پیاوی چاکە. ئێمەش دوو ژوورمان هەیە. بەڵامماڵی فۆمۆشکین کە یەکێک لە ئەفسـەرەکان لەوێ دایکوتـاوە، تـاقە ژووریکیـان هەیە؛ ئەو مـلازمە خۆی و کەلوپەلەکانی بەرێکی ژوورەکەیـان داگیر کـردووە و خێزانـی مـاڵێ نـازانن قـوڕی کـوێ بـکەن بە سـەر خۆیانـدا. هـیچکەس شـتی وای نەدیـوە، هۆردوویەک سـەرباز بـڕژێنە گوندێک و خۆیـان بە سـەر ماڵاندا بسـەپێنن و ژیان لە خەڵکی تاڵ کەن. ئێمەش دەسـەڵاتی هیچمـان نییە. نازانم ئەو خـودا غەزە لێگرتووانە لە کوێوە هاتن و دەیانهەوێ چ بەڵایەکمان بە سـەر بێنن؟»

یەکێک لە کچەکـان گـوتی: «پێم وایە دەیـانهەوێ پردێـک لە سـەر چـۆمی تەرەک دروست بکەن.»

لەو کـاتەدا کە ناســایر لە ئۆســتینکا نزیـک دەبـۆوە گـوتی: «بەڵام مـن بیســتوومە دەیــانهەوێ خەنــدەکێک هەڵکەنــن و تەواوی ئەو کچــانەی تێــدا زیندەبەچاڵ بکەن کە جوابی کوڕان نادەنەوە.»

دیسان قەشمەرانە خۆی بادا و ئەتوارێکی نواند کە هەموو دایـان لە قاقـای پێکەنین. لەو کاتەدا کە ئەرگۆشۆڤ ژنێکی کازاخی ماچ دەکرد، ناسایر ڕووی لە ماریانکا کرد و گوتی: «دەی، ماریانکا! تۆ بۆ ئەو ماچ ناکەی؟ هەرکەس بە نۆرەی خۆی!»

ئەرگۆشـۆڤ لەگەڵ ئەوەی پیرێــژنەکەی مــاچ دەکــرد و ئەویــش خــۆی ڕادەپسکاند و نەیدەهێشت، گوتی: «نـا، نـا، ئەم پیرێژنەی خـۆم زۆر کەوی و مێهرەبانترە لەو کچە سرک و قوشقییانە.»

پیرێــژن بە پێکەنیــنەوە گــوتی: «کچــێ مەهــێڵن، ئەو نەگــبەتە خەریــکە بمخنکێنێ!»

لەوسەری کۆڵانەوە ترپەی چەند هەنگاو هات و هەموویان بێدەنگ بـوون. سـێ سـەرباز بە کڵاوخـوود و تفەنگەوە دەچـوون قەڕەوڵـی پۆسـتی گـوردان بگـۆڕن. سەردەسـتەکەیان کە سـوارێکی پیـر بـوو، چـاوێکی پـڕ لە ڕقـی لە

کازاخەکان کرد. پاشان سەربازەکانی خۆی بە جۆرێک تێپەڕاند. لووکاشکا و ناسایر دەبوو بکشێنە دواوە، چونکە لە چەقی کۆڵانەکەدا ڕاوەستابوون، ناسایر تۆزێ کشا دواوە، بەڵام لووکاشکا تەنیا تۆزێ خۆی خوار کرد و لە جێگای خۆی جووڵەی نەکرد؛ لەگەڵ ئەوەی بە چاوێکی پڕسووکایەتییەوە لە سەربازەکانی دەڕوانی، دەنگی هەڵبڕی: «بنیادەم تێدەپەڕێ، بکشێنە دواوە!!»

سەربازەکان زمانیان نەگەڕا و هەروا کە بە شێوەیەکی ڕێکوپێک لاقیان بە تەرکی پڕخاکوخۆڵی کۆڵانەکەدا دەدا، تێپەڕین.

ماریانکا پێکەنی و پاشان هەموو کچ و ژنەکانی تر بە دوای ئەودا دایان لە قاقای پێکەنین.

ناسایر گوتی: «ئەمانە چ جلوبەرگێکی باشیان لە بەردایە. وەک ئەو قەشانە بە ڕێدا دەڕۆن کە عەبایان لە بەردایە!» پاشان وەک ئەوان دەستی کرد بە هەنگاونان و لاسایی کردنەوەیان. دیسان هەموویان لە قاقای پێکەنینیان دا.

لووکاشکا بە ئارامی لە ماریانکا چووە پێشێ و لێی پرسی: «بۆ ڕێگاتان بەو ملازمە داوە؟!»

ماریانکا تۆزێ بیری کردەوە و گوتی: «ئەو لەو ژوورەدایە کە تازە دروستمان کردووە.»

لووکاشکا لە پەنای ماریانکا دانیشت و گوتی: «پیرە یان جحێڵ؟»

ماریانکا وەڵامی دایەوە: «مەگین من لێم پرسیوە؟ من چووم شەڕابی بۆ بەرم، دیتم لە بەر پەنجەرەکە لەگەڵ مامە ئیرووشکا دانیشتووە. پیاوێکی زەردەڵە. هێندەی کەلوپەل پێ بوو عارەبانەیەکی پڕ کردبوو.»

ئەوەی گوت و سەری داخست. لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی زیاتر لە کچە نزیک دەبۆوە و هەروا چاوی لە چاوی بڕیبوو. گوتی: «زۆرم پێخۆشە کە مۆڵەتم لە پاسگا وەرگرتووە.»

ماریانکا بە شیلەبزەیەکەوە گوتی: «دەی، ئێستا لێرە زۆر دەمێنیەوە؟»

ـ هەتا سبەینێ بەیانی.

پاشان لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی دەستی بۆ لای کچە درێژ کرد گوتی: «تۆزێ توو گوڵەبەڕۆژەم بدەیە.»

ماریانکا قاقایەکی کێشا و قردیلەی بەرۆکی ترازاند و گوتی: «هانێ، هەمووی دەرهێنە.»

لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی تووی لە باخەڵی کچە دەردەهێنا و بە چاوی پڕ بریقە و لێوی بزە تێزاوەوە زیاتر خۆی بۆ لای خوار دەکردەوە، بە سرتە گوتی: «بڕوام پێ بکە هێندەت وەدوا کەوتووم ئیتر بڕستم لێ بڕاوە و لە تاوت ئاراوقارام لێ هەڵگیراوە.»

دیسان بە سرتە چەند شتی دیکەی پێ گوت.

ماریانکا لە ناکاو لەگەڵ ئەوەی خۆی دەکێشا دواوە، بە دەنگی بەرز گوتی: «من نایەم، قسەی وا مەکە.»

لووکاشکا لەسەرەخۆ گوتی: «تەنیا دەمەوێ دوو قسەت لەگەڵ بکەم. وەرە پێشێ، ماریانکاە وردیلە!»

ماریانکا بە نیشانەی ناڕەزایەتی سەری لەقاند، بەڵام هەروا بزەی لە سەر لێو بوو.

لەو کاتەدا دەنگێک گوتی: «ماریانکا! هۆی ماریانکا! دایکم دەڵێ بێ شێو بخوا.» ئەم دەنگە دەنگی برا چکۆلەی ماریانکا بوو کە بە هەڵاتن دەهات بۆ لای کوڕەکە و بانگی ماریانکای دەکرد.

ـ ئێستا دێم. تۆ بڕۆ چاوەکەم. تۆ بڕۆوە خۆم دوایی دێمەوە.

لووکاشکا هەستا، کڵاوەکەی لە سەری داگرت و لەگەڵ ئەوەی وای دەنواند کە گوێی لە ڕۆیشتنی ماریانکا نییە، بەڵام هەر لەو کاتەدا کە بزەیەکی لە سەر لێو بوو، گوتی: «منیش دەبێ بڕۆمەوە بۆ ماڵێ، وا دیارە ئەوە باشترە.»

لووکاشکا ئەوەی گوت و بە کۆڵانی پشت ماڵەکەدا ڕۆیشت و لە چاو ون بوو. بەڵام هەوا لەم ماوەیەدا، بە تەواوی تاریک داهاتبوو و شەو باڵی بە سەر گوندەکەدا کێشابوو. ئەستێرەی پڕشنگدار بە ئاسمانی تاریکەوە

دەدرەوشـانەوە. کۆڵانەکـان بێدەنگ و تاریـک بـوون. ناسـایر لە لای ژنەکـان مـابۆوە و هەروا دەنگـی قریشـکە و قاقایـان دەهـات. بەڵام لووکاشـکا دوای ئەوەی لە کۆڕەکە دوور کەوتەوە، لەسـەرەخۆ و بێ ئەوەی تەپەی لاقی بێ، پشـتی وەک پشـیلە کۆم کردبـۆوە و لەگەڵ ئەوەی خەنـجەرەکەی بە دەسـتی گرتبوو، بەڵام هەروا بە نێوقەدیەوە تەقەی دەهـات، لە ناکـاو دەسـتی کـرد بە هەڵاتـن، بەڵام نەک بەرەو لای مـاڵەکەی خـۆی، بەڵکـوو بەرەو مـاڵی مـلازم دووهەم. بەو شـێوەیە لە دوو کۆڵان تێپەڕی و کە بە کۆڵانێکی باریکدا بـای دایەوە، ئاتەگی چەرکساکەی بە لادا کرد و لە ژێر سێبەری کەپرێک لە سـەر زەوی دانیشـت. بیـری بـۆ لای ماریانکـا فـڕی و لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: «دەی، دەی! کچی ملازم حەز بە گاڵتەوگەپ ناکا، چەتیوە بەدزاتە، تۆزێ ڕاوەستە!» تـرپەی پێـی ژنێـک کە دەهـاتە پێشـێ خـوورداری کـرد. گـوێی شـل کـرد و لەبەرخۆیەوە پێکەنی. ماریانکا سەری داخستبوو و بە هەنگاوی ورد و خێرا، ڕاست بەرەو لای ئەو دەهـاتە پێشـێ و بە دارەدەسـتەکەی خـۆی لە لاجـامەی پەرژینەکەی دەدا. لووکاشـکا لە جێـی خـۆی هەسـتا. ماریانکـا داچڵەکـی و لە جێی خۆی ڕاوەستا.

ـ ئاخ! ئەوە تۆی، نابار! خۆ زراوم چوو. مەگین نەچووی بۆ مـاڵی خۆتـان؟ پاشان دای لە قاقای پێکەنین.

لووکاشکا بە دەستێکی کچەکەی لە باوەش گرت و بە دەسـتەکەی دیکەی دەموچاوی ناسکی گرت.

ـ ئەوەی دەمویسـت پێتـی بڵـێم... ، بە خـودا.... ـ دەنگـی دەلەرزی و زمـانی گۆی نەدەکرد. ماریانکا وەڵامی دایەوە: «دیسـان دەسـتت کـرد بە چەنەوەری، بەم شەوە تاریکە... دایکم چاوەڕوانمە. بڕۆ بۆ لای گراوەکەی خۆت.»

خـۆی لە باوەشـی لووکاشـکا ڕاپسـکاند و چەنـد هەنگـاو هەڵات. هەرکە گەیشتە بەردەرگای گەوڕەکەی خۆیان، ڕاوەسـتا و ڕووی لە لووکاشـکا کـرد. لووکاشـکایش کە بە دوایـدا هەڵـدەهات، لە بەری دەپاڕایەوە کە تـۆزێ سـەبر بکات و گوێی بۆ بگرێ.

ـ باشه، باڵندەی شەوگەڕ، دەتەوێ چیم پێ بڵێی؟ ئەوەی گوت و دیسان دەستی کرد بە پێکەنین.

ماریانکا؛ سەرکۆنەم مەکە، باشە چی دەبێ ئەگەر من لەگەڵ کەسێک هاوڕێ بم؟ بە زیاد نەبێ ئەم حاڵە! تۆ تەنیا شتێکم پێ بڵێ، ئەو کاتە من تۆم ئەوەندە خۆش دەوێ ئامادەم گیانی خۆمت فیدا بکەم و تۆ هەرکارێک بڵێی بە گیان و دڵ ئەنجامی دەدەم؛ گوێ بگرە ـ لووکاشکا دەستی کرد بە گیرفانی پانتۆڵەکەیدا و خرینگەی لە سکەکانی هێنا و درێژەی بە قسەکانی دا: «ئێمە ژیانێکی خۆشمان دەبێ. هەموو خەڵکی دڵیان خۆشە و ڕایدەبوێرن، منیش! چ خۆشەییەکم لە تۆ دیوە؟ دەی پێم بڵێ چ خۆشییەک ماریانکا گیان!»

کچە هیچ وەڵامێکی نەدایەوە، هەروا کە ڕاوەستابوو بە تەکانێکی خێرا تووڵکەکەی دەستی شکاند و لەتوکوتی کرد. لە ناکاو لووکاشکایش مشتی توند قووچاند و بە توندی ددانی بە سەر یەکدا نا، لەگەڵ ئەوەی نێوچاوانی گرژ کردبوو، دەستی ماریانکای گرت و گوتی: «من لە ڕادە بەدەر چاوەڕوانیم کێشا و ئیتر ئۆقرەم لێ هەڵگیراوە! پێت وایە من تۆم خۆش ناوێ؟ باشە هەر کارێکی پێت خۆشە لەگەڵ منی بکە.»

لە ڕواڵەتی ئارام و دەنگی ماریانکادا هیچ گۆڕانێک بەدی نەهات؛ بەبێ ئەوەی دەستی لە دەستی لووکاشکا دەرکێشێ، ئەوی تۆزێک لە خۆی دور خستەوە و گوتی: «لە کۆڵم بەوە لووکاشکا، من کچم، بەڵام ئەوە بزانە، من ئازاد نیم، ئەگەر تۆ منت خۆش دەوێ، ئێستا پێت دەڵێم چبکەی. دەستم بەردە، بیری خراپیش لە مێشکت دەرکە. من شووت پێدەکەم، بەڵام چاوەڕوانی ئەوە مەبە بەر لە زەماوەند خۆم گەوج بکەم.»

ماریانکا ئەم قسانەی دەکرد، بەڵام ڕووی وەرنەدەگێڕا. لووکاشکا کە لە ناکاو لەو حاڵەتە پەشۆکاوییە هاتبووە دەرێ و ئارام بووبووەوە، لەگەڵ ئەوەی پێدەکەنی و خۆشەویستی و دڵنەرمی بە ڕوخسارییەوە دیار بوو، لە نزیکەوە

چاوی لە چاوی کچە بڕی و گوتی: «چی، شووم پێدەکەی؟ خۆ زەماوەند بە دەست ئێمە نییە. تۆ خۆشەویستەکەم، سەرەتا خۆشت بوێم، ماریانکا گیان.»

ماریانکا خۆی لە باوەشی توند کرد و بە توندی لێوی لووکاشکای ماچ کرد و لەگەڵ ئەوەی توند بە سینگی خۆیەوە دەگوشی بە سرتە گوتی: «ئەیەڕۆ براکەم!» پاشان لە ناکاو خۆی لە باوەشی لووکاشکا دەرباز کرد و هەڵات، بێ ئەوەی ئاوڕ بداتەوە خۆی کرد بە ژووریدا. سەرەڕای داواکەی لووکاشکا کە لە بەری پاڕابۆوە، تۆزێ سەبر بکات کە ئەوەی لە دڵیدایە پێی بڵێ، ماریانکا ڕانەوەستا.

- بڕۆ، زوو بڕۆ! تۆ خودا بڕۆ! بڕوانە پێم وایە ئەو کرێنشینە نارەسەنەمان خەریکە لە حەوشە پیاسە دەکات.

لووکاشکا لە دڵی خۆیدا گوتی: «ژنی ملازم! ماریانکا شووم پێدەکا! ڕاستە شووم پێدەکا، بەڵام تۆ منت خۆش بوێ!»

لووکاشکا لە لای ئیانکا ناسایری دییەوە. دوای ئەوەی ماوەیەک پێکەوە خواردیانەوە، چوون بۆ لای دۆنیا و سەرەڕای بێ وەفایی ئەو شەوەی لە لای ئەو تێپەڕ کرد.

# چاردە

ئەو کاتەی ماریانکا خۆی کرد بە ماڵی خۆیاندا، ئۆلێنین لە حەوشە پیاسەی دەکرد و گوێی لێبوو کە گوتی: «بڕوانە پێم وایە ئەو کرێنشینە نارەسەنەمان خەریکە لە حەوشە پیاسە دەکات.» ئۆلێنین ئەو ڕۆژە تەواوی دانی دوانیوەڕۆی لە سەر پلیکانەکان و لەگەڵ مامە ئیرووشکا ڕابواردبوو. مێزێک و سەماوەرێک و هێندێ شەراب و مۆمێکی دایساوی دانابوو. پەرداخێک چایی لە بەردەم، جگەرەیەک بە لێوەوە، گوێی لە هەقایەتی پیرەپیاو گرتبوو کە لە سەر پلەیەکی خوارترەوە دانیشتبوو. لەگەڵ ئەوەی هەواکەی ئارام بوو، مۆمەکە بە خێرایی دەتوایەوە و شۆڵە لەرزۆکەکەی هێندێ جار کۆڵەکەی نزیک قاڵدرمەکان و هێندێ جاریش پەرداخەکان و جاری واش بوو سەری تاشراو و سپیی پیرەپیاوی ڕووناک دەکردەوە. پەپوولەکان لە دەوری مۆمەکە هەڵدەسووڕان و زرووقەی باڵیان دەپرژاند و خۆیان لە مێز و پەرداخەکان دەدا، هێندێ جار بە دەوری گڕی مۆمەکەدا دەسووڕانەوە و هێندێ جاریش لە تاریکیدا دەمانەوە. ئۆلێنین و ئیرووشکا بە هەردووکیان چۆڕەیان لە دۆڵکەکە بڕیبوو. هەر جارێک کە ئۆلێنین شەرابی دەکردە پەرداخەکەی ئیرووشکاوە، ئەو پەرداخەکەی لە پەرداخی ئۆلێنین دەدا و بەبێ وەڕەزی و ماندوو بوون درێژەی بە قسەکانی دەدا. ئەو باسی ژیان و ڕابردووی کازاخەکانی دەکرد و سەربردەی باوکی کە پیاوێکی زەبەلاح و بەناوبانگ بوو، دەگێڕایەوە و دەیگوت کە باوکی بە تەنیا بەرازێکی دە پوودی[31] دەدا بە کۆڵیدا و لە یەک کۆڕدا دوو چلیک چیخیری دەخواردەوە. ئەو باسی سەردەمێکی دەکرد کە لەگەڵ گیرچیک بووبووە

---

٣١ پوود: سەد و شەست کیلۆ

هاوڕێ و له کاتی تەنەوە کردنی نەخۆشی بڵفەتەدا، پێکەوە ڕادەیەکی زۆریان کەپەنک و قاپووت بۆ ئەوبەری تەرەک ناردبوو. ئەو دەیگوت جارێکیان له کاتی ڕاودا، هەر بەیانی زوو دوو بزنەکێوی ڕاو کردووە. سەربردەی گراوە شۆخوشەنگەکەی خۆی دەگێڕایەوە کە چۆن لەبەر خاتری ئیرووشکا دەهات بۆ پاسگا و نەیدەتوانی دوورییەکەی تامڵ بکات؛ تەواوی ئەو سەربردە و بەسەرهاتانەی هێندە بە تام و چێژەوە دەگێڕایەوە کە ئۆلێنین دەتگوت خۆی لەوێ بووە و بە چاوی خۆی دیتوویەتی. ئیرووشکا دەیگوت: «بەڵێ! کەسی مامی، تۆ له کاتی لاویدا منت نەدیوە. بریا ئەو کاتە بتدیبایەم تاکوو بۆ دەرکەوێ من کێم و چکارەم. ئەمڕۆ ئیرووشکا له کار کەوتووە؛ بەڵام ئەو کاتە لە تەواوی لیواکەدا باس هەر باسی ئیرووشکا بوو.» "ئەم ئەسپە ڕەسەنە و ئەم شمشێرەی دەستکردی گۆدرا[32] بۆ کێ باشە؟ بچین بۆ لای کێ شەڕاب بخۆینەوە؟ لەگەڵ کێ خۆشی ڕابوێرین؟ کێ بنێرین بۆ چیا کە ئەحمەدخان بکووژێ؟ هەمیشە هەر ئیرووشکا. کێ لە لای کچان خۆشەویستە؟ هەمیشە هەر ئیرووشکا." هۆیەکەشی ئەوە بوو کە من جیگیتێکی حیسابی بووم. ئەوەندەی دەمتوانی شەڕابم دەخواردەوە و دزیم دەکرد. لە شاخەکان ڕەوەی ئەسپم دەدزی، ئاوازم دادەنا... و بە کاری هەمووان دەچارام. ئەمڕۆ ئیتر لەو جۆرە کازاخانە لە هیچ کوێیەک بوونی نییە. پیاو هەر ئەوەندەیە دیق ناکا. ئەمڕۆ قەدوباڵای خەڵک لەوەندە بەرزتر نابێ (ئیرووشکا دەستی بە ئەندازەی بەرزایی مێزێک هەڵێنا.) ئەم بستەباڵایانە، پیاو پێکەنینی دێ، هەر دەڵێی پۆلێ پۆستاڵت له پاڵ یەکدا ڕیز کردووە. کاتێکیش چاویان لێدەکەی، هەموو بە تروپۆز و لەخۆڕازین. کاتێک شەڕابیش دەخۆنەوە وەک پیاوان سەرخۆش نابن، بەڵکوو تەنیا کەللەی خۆیان گەرم دادێنن، بەڵام من؟ من ئیرووشکای چەتە بووم؛ هەموو خەڵکی دەیانناسیم، نە هەر له گوندەکان، بەڵکوو لە تەواوی ناوچە و شاخ و هەوارەکان دەیانناسیم. شازادەکان لەگەڵ من هاوڕێ بوون و دەهاتن بۆ

---

٣٢ گۆدرا: باشترین شمشێر و خەنجەری قەفقاز لە شاری گۆدرا دروست دەکرا.

سەردانم. من لەگەڵ هەمووان هاوڕێ بووم. لەگەڵ تورکەکان تورک بووم، لەگەڵ ئەرمەنی ئەرمەنی و لەگەڵ سەرباز سەرباز بووم و لەگەڵ ئەفسەرەکان ئەفسەر. بۆ من هیچ جیاوازییەکی نەبوو، تەنیا شتێک کە گرینگ بوو پێکهاتنی کۆڕی شەڕاب خواردنەوە بوو. ئێستا پێم دەڵێن دەبێ خۆت لە دابونەریتی خەڵکی بەدوور بگری! پێم دەڵێن لەگەڵ سەربازەکان مەخۆوە و لەگەڵ تورکەکان نان مەخۆ.»

ئۆلێنین لێی پرسی: «کێ ئەو قسانە دەکا؟»

ـ قەشەکان ئیتر. بە پێچەوانە ئەگەر گوێ بە قسەی مەلا و قازییەکانی تورک بدەی، دەڵێن: "ئێوە کافرن. بۆ گۆشتی بەراز دەخۆن؟" دەی هەرکەسێک بۆخۆی ئایینێکی هەیە. بە بڕوای من هەموو ئایینەکان وەکوو یەک وان و جیاوازییەکی ئەوتۆیان نییە. خودا بۆیە ئەم هەموو ئایینەی داناوە کە مرۆڤەکان ئاسوودە بن. جارێ تاوان بوونی نییە. بۆ وێنە بڕوانە ئاژەڵەکان، ئەوان لە لەوەڕگەی تورکەکانیش و لە لەوەڕگەی ئێمەش دەلەوەڕێن. لە هەرکوێ بن، ماڵیشیان لەوێیە. ئەوەی خودا بیدا دەیخۆن. کەچی ئەم کازاخانەی ئێمە لەسەر ئەو باوەڕەن کە گۆشتی ئەو ئاژەڵانەی لە لەوەڕگەی تورکەکان لەوەڕابێتن حەرامە. من پێموایە ئەمانە هەمووی درۆیە.

ئۆلێنین گوتی: «چی درۆیە؟»

ــ دەی هەر ئەوەی قەشەکان دەیڵێن. دەزانی چی مامە گیان! من هاوڕێیەکم بوو ملازم بوو و لە چرۆلنایا دەژیا و کابرایەکی خۆشگوزەران بوو، ڕاست وەک خۆم وا بوو؛ ئەو بە دەستی چیچێنیەکان کوژرا. ئەو دەیگوت هەموو ئەو قسانە قەشەکان خۆیان دەیسازێنن. دەیگوت پیاو دەمرێ و لە ژێر گڵدا دەڕزێ و گیاوگژ لە سەر قەبرەکەی دەڕوێن و ئیتر هەموو شتێک تەواو دەبێ و دەبڕێتەوە.

پیرەپیاو بە پێکەنینەوە گوتی: «مێشکێکی سەیری هەبوو.»

ئۆلێنین لێی پرسی: «تۆ چەند ساڵت تەمەنە؟»

ـ خودا دەزانێ! نزیکەی حەفتا ساڵ. ئەو کاتەی تسارین[33] حوکوومەتی دەکرد، من زۆر منداڵ نەبووم. خۆت حیسابی بکە بزانە هەتا ئێستا دەبێتە چەندە. پێم وایە حەفتا ساڵ دەبێ. وا نییە؟

وایە. بەڵام تۆ زۆر بەگوڕ و دڵتەڕی.

ـ بەڵێ! دەبێ شوکری خودا بکەم. من زۆر لەش ساغ و بەدەماخم. هیچ کوێم نایێشێ. تەنیا گرفتێکم هەیە، ئەویش ئەوەیە ژنێکی جادووباز منی تەلەسم کردووە کە ...

ـ چۆن؟

ـ چاک، هەر ئاوا، تەلەسمێک کە ...

ئۆلێنین پرسیی: «دەی، کاتێک تۆ مردی گیاوگژ لە سەر گۆڕەکەت دەڕوێ؟»

ئیرووشکا دیار بوو نەیدەویست بە ڕوونی بیروڕای خۆی دەربڕێ. تۆزێ بێدەنگ بوو پاشان لەگەڵ ئەوەی پێدەکەنی و شەڕابی بۆ ئۆلێنین تێدەکرد، دەنگی هەڵبڕی: «تۆ خۆت چۆن بیر دەکەیەوە؟ هانێ پیاڵەیەکی تر هەڵدە.»

---

٣٣ تسارین بە مانای ژنی تێزار و مەلەکەیە و لێرەدا مەبەست لە کاترینی دووهەمە.

# پازدە

ئیرووشکا لەگەڵ ئەوەی هەوڵی دەدا وەبیری بێتەوە باسی چییان دەکرد، گوتی: «باسی چیمان دەکرد؟ ئەهـا! بڕوانە من ئـاوام، ئەریّ! مـن ڕاوچیم، لە تەواوی ئەم نـاوچەیە ڕاوچییەکـی دیـکەی وەک منـی لـێ نییە، هەر ئـاژەڵ و پەلەوەریّکت بـوێ بـۆت پەیـدا دەکەم و پیشـانت دەدەم، دەزانـم هەر شـتێک شوێنەکەی کوێیە. من چەند دانە سەگم هەیە، دوو تفەنگ و چەند دانە تۆڕی ماسـی گرتنیشـم هەیە، هەروەهـا بازێـک و جەلـلەیەک داوم هەیە؛ وەلحاسـڵ شـوکر بۆ خـودا، ئەوەی پێویسـتە هەمە. ئەگەر تۆ ڕاوچییەکی کـارامە بی و پۆز و هەوات نەبیّ، هەموویانـت پیشـان دەدەم. مـن ئەو پیـاوەم، تێگەیشـتی، ها؟ من شوێنگێڕێکم هەر جێ پێی ئاژەڵ ببینم، دۆزیومەتەوە. لەوەدا پسپۆڕم و زۆر باشـیش لە ڕاو دەگەم. دەزانـم لە کـوێ لان دەگـرێ و لە کـوێ ئـاو دەخواتەوە و لە کوێ دەلەوەڕێ. مـن شـەوانە حەشـارێک سـاز دەکەم و هەر لە هەوڵی ئێوارەوە هەتا بەیانی لە بۆسـەدا دەمێنمەوە. مـانەوە و خەوتـن لە ماڵێ چ کەڵکێکی هەیە؟ مەگین پیاو لە ماڵێ گیانی داگیرێ و لە پەستا شەڕاب بخواتەوە. لە ماڵەوە ژنان هەرا و هەنگەمە سـاز دەکەن و منداڵان بە قیژەقیژ مێشـکی سـەری پیـاو دەبەن. بەڵام لەوێ، تـاریکوڕوونی ئێـوارێ دەچـیە بۆسـەوە و شـوێنێکی بـاش هەڵدەبژێری، چەنـد باڵندە ڕاو دەکەی و ئەوکـاتە وەک ڕاوچییەکی بـاش و کـارامە لە جێی خـۆت جووڵە نـاکەی و لە بۆسـەدا دەمێنـیەوە. تـۆ دەزانـی شـەوانی دارسـتان چەنـدە خۆشـە. چـاو لە ئاسـمان دەکەی، لە ڕووی گەڕانی ئەستێرەکانەوە تێدەگەی چەندەی شـەو تێپەڕیوە و چەندەی مـاوە. چاوێک لە دەوروبەری خـۆت دەکەی؛ دارەکـان دەجووڵێنەوە، هەروا مراقیـب دەمێنـیەوە، لە ناکـاو گوێـت لە خشـپەیەک دەبـێ، بـۆت دەردەکەوێ بەراز دەیەوێ هێرشـت بـۆ بێنـێ. لە لای سـەرەوە دەنگێـک

دەبیستی، وا دیارە بەچکە هەڵۆکان سیڕەیان دێ و لە لای گوندەوە دەنگی کەڵەشێر و قاز دێتە گوێ. ئەگەر دەنگی قاز بێت، هێشتا نیوەشەو نەبووە. من بە باشی لە هەموو ئەوانە تێدەگەم. کتوپڕ لە شوێنێکەوە تەقەی تفەنگ دێ. تۆ دەست دەکەی بە بیر کردنەوە. تۆ لە خۆت دەپرسی: کێ تەقەی کرد؟ کازاخێک بووە وەک من، کە بۆسەی بۆ ئاژەڵێک ناوەتەوە؟ نیچیرەکە پێکراوە و کەوتووە یان بریندار بووە و بەلەسەی نێو دارستانەکە بووە و لەوێ خوێنی لە بەر دەڕوا. من ئەو جۆرە ڕاوەم پێ خۆش نییە! نا، کەیفی پێ ناکەم! ئەوە چ فایدەیەکی هەیە پیاو نێچیرەکە خەسار بکا؟ گەمژە، گەمژە! یان گەوجانە بیر دەکەیتەوە و لە دڵی خۆتدا دەڵێی: یەکێک لە ئەبرەکەکان کازاخێکی کوشتووە. ئەو بیر و خەیاڵانە مێشکت دادەگرێ. جارێک من لە قەراغ چۆمەکە دانیشتبووم، دیتم لانکەیەک بە سەر ئاوەکەوەیە. زۆر لانکەیەکی باش بوو، تەنیا یەکێک لە کەمەکانی شکابوو. خەیاڵ هەڵیگرتم: بڵێی ئەم بێشکەیە هی کێ بێ؟ شکی تێدا نییە ئەم سەربازە نەگبەتییانەی ئێوە کە هاتوون بۆ گوندەکە، ژنانی چێچێنیان ڕفاندبێ و یەکێک لەو دڕندانە کۆرپەیەکی کوشتبێ. لاقی منداڵەکەی گرتبێ و بە توندی کێشابێتی بە دیواردا! پاشان بێشکەکەی بە دەم ئاودا دابێ. ئاکاری ئەوان هەروایە! ئاخ، ئەو دڵڕەقانە لە مرۆڤایەتی بەدوورن! ئەم بیر و خەیالانە لە مێشکمدا شەپۆلیان دەدا و لە ناخەوە هەڵدەقرچام. من پێم وایە ئەوان ئەو لانکەیان بە ئاودا دابوو، ژنانیان بە قژ ڕاکێشاوەتە دەرێ و ئاوریان لە ماڵەکە بەرداوە و جیگیت خۆشی دەستی داوەتە تفەنگ و هاتووە بۆ تالان و بڕۆی ئێمە. تۆ هەروا لە بۆسەدا دانیشتووی و بیر دەکەیتەوە، بەڵام کاتێک دەنگێک دەبیستی، بۆت دەردەکەوێ ڕەوەیەک بە نێو لێڕەوارەکەدا تێدەپەڕن و تۆ دڵت دەکەوێتە کوتەکوت. ئێوە لە بەرخۆتانەوە دەڵێن: ئاژەڵە خۆشەویستەکان، وەرنە پێشێ! ئاژەڵەکان کەوتوونە هاسکەهاسک. تۆش هەروا لە سەر زەوی خۆت ڕاکێشاوە و لە جێی خۆت نابزووی، دڵت کەوتۆتە کوتەکوت و بە توندی لێدەدا. بەهاری ڕابردوو، ڕەوەیەک وەک

هەورێکی ڕەش کتوپڕ پەیدا بوون. من گوتم: «بە ناوی خودا و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز» و دەمویست قامک بنێم بە پەلاپیتکەدا کە لە پڕ دایکەبەراز بە کوودەڵەکانی گوت: «وەی ڕۆ، بێچووڵەکانم، بنیادەمێک لێرە خۆی مەڵاس داوە!» لە ناکاو هەموویان بەرەو نێو دارەکان تێیان تەقاند. منیش بە خەیاڵی خۆم پێم وابوو تەواوی ئەو ڕەوەیە ڕاو دەکەم.

ئۆلێنین گوتی: «دایکەبەرازەکە چۆن بە کوودەڵەکانی گوت بنیادەمێک لێرەیە؟»

- تۆ چۆن بیر دەکەیەوە؟ پێت وایە ئەو ئاژەڵە ئەقڵی نییە؟ نا، ئەو زۆر لە مرۆڤ وریاترە، لەخۆڕا پێی دەڵێن بەراز. ئەو هەموو شتێک تێدەگا. بۆ وێنە بڕوانە: مرۆڤێک شوێن بەرازێک دەکەوێ و جێگا پێکەی بۆ نادۆزرێتەوە و هیچ نابینێ، بەڵام بەراز کە بە شوێن تۆدا بێ، لەڕێوە بۆنی تۆ دەبیستێ و خوداحافیز! کەوایە بەرازیش ئەقڵی هەیە. چونکە تۆ بۆنی خۆت نابیسی، بەڵام ئەو هەستی پێدەکا. تەنیا جیاوازییەکە لەوەدایە: تۆ دەتەوێ ئەو بکووژی بەڵام ئەو دەیهەوێ گیانی خۆی ڕزگار بکا و لە نێو ئەو دارستانەدا بژی. تۆ بیروڕای خۆتت هەیە و ئەو بیروڕای خۆی. ئەو بەرازە، بەڵام لەگەڵ تۆ بەرامبەرە. ئەویش خوڵقاوی دەستی خودایە. ئاخ ئارام بە! مرۆڤ چەندە گەمژەیە! - پیرەپیاو چەندجار دووپاتی کردەوە - گەمژە، گەمژە! پاشان سەری بە خوزدا گرت و بیر و خەیاڵ هەڵیگرت.

ئۆلێنین وەک پیرەپیاو خەیاڵ هەڵیگرت. دەستی لە دواوە هەڵپێکا و لە پلیکانەکان هاتە خوارێ و بێ ئەوەی زمانی بگەڕێ لە حەوشەکەدا دەستی کرد بە پیاسە کردن. کاتێک گەڕایەوە بۆ لای ئەو، ئیرووشکا سەری هەڵبڕی و چاوی لەو پەپوولانە بڕی کەوا بە سەر شۆڵەی مۆمەکەدا دەخولانەوە و دەکەوتن بە سەریدا و گوتی: «گەمژ! گەمژە! دەچی بۆ کوێ؟ ئاخ! گەمژە! گەمژە!»

پاشان هەستا و بە قامکە ئەستوور و زبرەکانی پەپوولەکانی دوور دەخستەوە و لەگەڵ ئەوەی هەوڵی دەدا بە قامکە گەورەکانی باڵی

پەپوولەکـــان بگـــرێ و لە پەنـــجەرەکەوە فڕێیـــان داتە دەرێ، بە دەنگێکـــی میهرەبان و تێکەڵ بە ئامۆژگارییەوە گوتی: «بێچارەی گەمژە! خۆت بۆ ئاور تێبەردەدەی. تۆ دەتهەوێ بمری و من دڵم پێت دەسووتێ.»

ئیرووشـــکا مـــاوەیەکی زۆر بەم شـــێوەیە چەنەوەری کـــرد و شـــەڕابی خـــواردەوە و باســـی هەمـــوو شـــتێکی کـــرد. ئـــۆلێنین بە درێژایـــی و پانـــایی حەوشـــەکەدا دەهـــات و دەچـــوو. لە ناکـــاو سرتەســـرتێک لە پشـــت دەرگـــای گەوڕەکەوە تووشـی سەرسووڕمانی کرد. ئۆلێنین بە زەحمەت هەناسـەی لە سینگیدا کۆ کردەوە، قاقای پێکەنینی ژنێک، دەنگی پیاوێک و شـەقەی مـاچێکی بیست. لەگەڵ ئەوەی گیاوگژی تەرکی حەوشـەکەی پێشـێل دەکرد، کشـایەوە بـۆ ئەوبەرەی دیـکەی حەوشـەکە، بەڵام دوای تاوێـک دەنـگەکە لە حەوشـەوە هـات. کازاخێـک بە چەرکسـای تـۆخەوە، کە مەنگـۆڵەی سـپی بە کـڵاوەکەیەوە بوو (ئەو کەسە لووکاشکا بوو)، بە سـەر تەیمانەکەدا وەسـەر کەوت، هەر لەو کـاتەدا ژنێکـی بـاڵابەرز کە لەچکەیەکـی سـپی بە سـەردا دابـوو بە بەردەمـی ئۆلێنیندا تێپەڕی. بە خەیاڵیدا هـات کە شێوەی بە ڕێدا ڕۆیشـتنیماریانکا و ترپەی هەنگـاوی ئەوە بە گـوێی ئۆلێنیندا دەچرپێنـێ: «نە تـۆ لەگەڵ مـن و نە من لەگەڵ تۆ، هیچکام پێکەوە خـاڵی وێکچوونمـان نییە.» ئـۆلێنین هەتـا سـەر پلیکانەکان چاوی تێبڕی و تەنـانەت لە پەنجەرەکەوە دیتـی کە لەچکەکەی لە سـەری کـردەوە و لە سـەر ئەسـکەملێک دانیشـت. لە ناکـاو هەسـتێکی پـڕ لە داهێزران و تەنیایی، ئاوات و هیوایەکی نادیار و ئێرەیی بە پیاوێکی بەرپیوار، خۆی لە ڕۆح و گیانی ئاڵاند.

دوایین تروسـکەی چـرای مـاڵان لە گونـدەکە کوژابـوونەوە. گونـد، لە ژێـر خێوەتی بێدەنگیدا بـوو. بەرازە مێوەکـان و تارمـایی سـپیی ئاژەڵەکـان لە نێـو گەوڕەکانـدا و ســەربانی مــاڵان و ســپیدارە بەرزەکــان، دەتگــوت هەمووییــان خەوێکی قورس دایگرتوون. تەنیا قیڕەقیڕی بۆقەکـان بـۆ سـاتێک نەدەبڕایەوە و لە ڕۆخــی دوورەدەســتی چــۆمەکەوە، دەهــاتە گــوێ. لە لای ڕۆژهەڵاتەوە مەودای نێوان ئەستێرەکان زۆر دەبوو و هەموویـان لە باوەشـی گزنگێکدا کە

سـات لە دوای سـات ڕوونـاکتر دەبـۆوە خەریـک بـوون بـزر دەبـوون. لە ژوورسـەری ئـۆلێنین و ئیرووشـکا ئەسـتێرەکان زیـاتر خزابـوونە پاڵ یەک و پڕسـریوەتر دەهـاتنە بەرچـاو. پیرەپیـاو سـەری کردبـووە سـەر باسـکی و وەنەوزی دەدا. کەڵەشێرێک لە حەوشەی ڕووبەڕوویـانەوە خوێندی. ئۆلێنین، نوقمی بیر و خەیاڵ، بە نێو حەوشـەکەدا پیاسـەی دەکرد. دەنگی ئاوازێک کە لە چەند زار دەهاتە دەرێ هاتە گوێی. چووە لای تەیمانەکە و گوێی شل کرد. دەنگی لاوانی کازاخ بە شێوەیەکی دڵبزوێن تێکەڵ دەبوون و بە هـۆی وزەی خۆیـانەوە دەتگـوت دەنگێکـی بەهێـزە و لە گەروویەکـی زوڵاڵەوە دێـتە دەرێ. پیرەپیاو لەگەڵ ئەوەی چاوی هەڵێنا گوتی: «دەزانی کێیە گۆرانی دەڵێ؟ ئەوە لووکاشکای جیگیتە. ئەو چیچینێکی کوشـتووە و ئێسـتا زۆر دڵخۆشـە. ئـاخەر بڵێ بۆچی دڵخۆشی؟ بێشعوور! بێشعووری گەمژە!»

ئۆلێنین پرسی: «تۆ، تۆش تا ئێستا کەست کوشتووە؟»

پیرەپیـاو دەنگـی هەڵبـڕی: «لاپرەسـەن! ئەوە پرسـیارە لـێم دەکەی؟ ئەوە قسـەیەک نییە بکـرێ وەڵامـی بـدەیتەوە. لەنێـوبردنی ژیـانی مرۆڤێـک هەروا کارێکی ئاسان نییە. ئاخ، نا! خوداحـافیز مـامە گیـان، مـن ئیتـر زۆرم شـەڕاب خواردۆتەوە و مڕ بووم.»

لەگەڵ ئەوەی لە جێی خۆی هەڵدەستا گوتی: «سبەینێ دەچین بۆ ڕاو؟»

- هەمیشە وەرە.

- وریا بە. زووتر لە خەو هەستی دەنا جەریمە دەکرێی.

ئۆلێنین وەڵامی دایەوە: «مەترسە، من لە تۆ زووتر هەڵدەستم.»

پیرەپیـاو ڕۆیشـت. گۆرانییەکە بێدەنگ بـوو. تـرپەی پێیەک کە ئـاهەنگێکی دڵبزوێنی هەبوو هاتە گوێ. دوای تاوێک گۆرانی سـەرلەنوێ لەو بێدەنگییەدا بوو بە زایەڵە، بەڵام ئەم جارەیان دوورتـر بـوو و دەنگی گڕی ئیرووشـکاش لەگەڵیانـدا بـوو. ئـۆلێنین هەناسـەیەکی هەڵکێشـا و لە دڵـی خۆیـدا گـوتی: «چ خەڵکێکن، چ ژیانێکی باشیان هەیە!» پاشان گەڕایەوە بۆ نێو ژوورەکەی.

# شازده

مامە ئیرووشکا کازاخێکی پیر و خانەنشین و بێوەپیاو بوو. بیست ساڵ لەمەوبەر ژنەکەی چووبووە ڕیزی گرووپی ئۆرتۆدۆکسەکان و بەجێی هێشتبوو و شووی بە ئاجوودانێکی ڕووسی کردبوو؛ ئیرووشکا عەولادی نەبوو. کاتێک دەیگوت کە سەردەمی لاوی تاقانە گەنجی گوندەکە بووە، لە ڕاستیدا شاتوشووت نەبوو. تەواوی چەکدارانی لیواکەیان ئازایەتی و نەبەزیی ڕابردووی ئەویان لە بیر مابوو. ویژدانی ئەو بەرپرسی چەندین قەتڵ بوو، لە چێچێنەکانیش و ڕووسەکانیش. ماوەیەک لە کوێستانەکان ژیابوو، لە لای ڕووسەکان بە تاوانی دزی کردن دوو جار زیندانی کرابوو. زۆربەی ژیانی خەریکی ڕاو بوو و لە لێڕەوارەکەدا ڕایبواردبوو؛ ئەو لە کاتی ڕاو و لە نێو دارستانەکەدا چەندین ڕۆژ بە لەتەنانێک قنیاتی کردبوو و خواردنەوەی تەنیا ئاوی سارد بووبوو. بەڵام بە پێچەوانە لە ئێستانیستا لە ئێوارەوە هەتا بەیانی بە عەیش و نۆش ڕایدەبوارد. کاتێک کە لە لای ئۆلێنین گەڕایەوە، ماوەی دوو کاتژمێر خەوت؛ پاشان بەر لە هەڵاتنی خۆر ماوەیەک لە نێو جێگاکەیدا مایەوە و کەوتە بیری ئەو کەسەی کە شەوێ ناسیبووی و لە هەموو بارێکەوە وەردی کردەوە. ساکارییەکەی ئۆلێنینی زۆر بە دڵ بوو، (ساکاری، بەو مانایەی کە بەرگریی لە شەڕاب خواردنەوەی نەکردبوو). کەسایەتیی ئۆلێنینیش کەوتبووە بەر دڵی. لە خۆی پرسی: "بۆچی هەموو ڕووسەکان ساکار و ساماندارن؟ بۆچی لەگەڵ ئەوەدا هەمویان خوێندەوارن، کەچی هیچکام زیرەک نین و هیچ تێناگەن؟" لە خەیاڵی خۆیدا هەموو ئەمانەی وەرد کردەوە و هەروەها ئەوەی دەیتوانی لە ئۆلێنینی هەڵکرێنێ لەبەرخۆیەوە لێکی دایەوە. ماڵەکەی مامە ئیرووشکا گەورە و قەدیمی بوو، بەڵام نەبوونی ژن لە ماڵەکەیدا بە باشی هەست پێدەکرا. سەرەڕای ئەوەی

کازاخەکان زۆر گرنگی بە پاکوخاوێنی دەدەن، ئەم ماڵە زۆر پیس و شپرێو بوو. لە سەر مێزێک زیپوونێکی خوێناوی و لەتێک کولێرەناسکە و لە سووچێکی ژوورەکە قشقەڕەیەکی چکۆڵەی پەڕوپۆ داماڵدراوی لەتوکوت کراو داندرابوو کە بۆ چێشتەی هەڵۆ ئامادەی کردبوو. لە سەر ئەسکەملێک جووتێ جزمە، تفەنگێک، خەنجەرێک، کۆڵەپشتییەک، چەند کوت جلوبەرگی تەڕ و چەند مەشغەڵ لە سەر یەک کەڵەکە کرابوون. لە سووچێکی تر کووپەیەک ئاوی پیس و بۆگەن و چەند جووت پێڵاوی تر داندرابوون؛ هەر لەوێ قەرابیتەیەک و تەپکەیەک وەبەرچاو دەکەوت. لە چەقی ژوورەکە تۆڕێک و چەند کۆتر و سوێسکەی کوژراو کەوتبوون، لە دەوری مێزەکەش جووجەڵەیەک کە پەتێک لە لاقی گرێدرابوو و سەرەکەی تری بە پێچکەی مێزەکەوە بەسترابوو بە دەوری خۆیدا هەڵدەسووڕا و جرووکەجرووکی ژوورەکەی داگرتبوو. لە سەر وەجاخە کوژاوەکە قابلەمەیەک پڕ لە تراوێکی شیرین وەبەرچاو دەکەوت. لە سەر تاقەیەک هەڵۆیەک دەیقیژاند و هەوڵی دەدا خۆی لەو بەندە ڕزگار بکات کە لە لاقی گرێدرابوو، بازێکی چاوزیتیش بێدەنگ لە سووچێک ڕاوەستابوو و بە لاچاوێک لە جووجەڵە مریشکەکەی دەڕوانی و هەرجارەی سەری بە لایەکدا خوار دەکردەوە. مامە ئیرووشکا لە سەر چرپایەکی نەوی کە لە نێوان دیوار و وەجاخەکەدا هەڵکەوتبوو، بە کراسێکەوە لە سەر پشت ڕاکشابوو. پووزی لاقە بەهێزەکەی بە لێواری وەجاخەکەوە نابوو و بە قامکە خەریتەکانی توێخی دەستی لێدەکردەوە کە چڕنووک و دەندووکی تیژی بازەکە بریندراری کردبوو، چونکە ئەو بازەکەی بەبێ دەستەوانە کەوی دەکرد. نێو ژوورەکە و بەتایبەت لە دەوری پیرەپیاو، بۆنێکی توند و تێکەڵ هەواکەی قورس کردبوو و ئەو بۆنە هەمیشە لەگەڵ پیرەپیاو بوو بەڵام ئەوەندە ناخۆش نەبوو کە جاڕزکەر بێ. لەو کاتەدا دەنگێک گوتی: «ئۆئیدە ـ ما، (یانی: لە ماڵێی؟)»

دەنگەکە لە پەنجەرەکەوە هات و لە ژوورەکەدا دەنگی دایەوە، ئیرووشکا لەڕێوە تێگەیشت دەنگی لووکاشکای دراوسێیەتی. پیرەپیاو دەنگی هەڵێنا:

«ئۆئیده، ئۆئیده! بەڵێ وەرە ژووری. هاوڕێ بەڕێزەکەم، لووکاشکا مارک چ کارێکت بە مامەیە؟ دەتەوێ بچی بۆ پاسگا؟»

بازەکە بە دەنگی بەرز و گڕی خاوەنەکەی باڵی لێک دەدا و بەنەکەی لاقی کێشا.

پیرەپیاو لووکاشکای خۆشدەویست و سەرەڕای ئەو سووکایەتییەی لە لایەن بەرەی گەنجانی کازاخەوە پێی دەکرا، بەڵام لووکاشکای بەری لەو گەنجانە دەزانی و بە چاوێکی پڕ لە ڕێزەوە لێی دەڕوانی. جگە لەوەش لووکاشکا و دایکی وەکوو جیرانێکی دڵسۆز زۆر جار شەڕاب و چێشت و خواردنی جۆراوجۆریان بۆ دەبرد و پێیان لێ نەدەبڕی. مامە ئیرووشکا کە لە تەواوی ماوەی ژیانیدا مرۆڤێکی ڕۆحسووک و مێهرەبان بوو، بەردەوام هەستەکانی خۆی بەم شێوەیە لێک دەدایەوە: «دەی چاکە بە هەردوو لا دەکرێ و دەستێک بە تەنیا تەقەی نایە؛ ئەوان بەشی خۆیان ماڵ و سامانیان هەیە. من نێچیر و گۆشتی ڕاو بۆ ئەوان دەنێرم، ئەوانیش منیان لە بیر ناچێ. ئەمجارەیان، ئەوان گۆشتی سوورەوەکراو و نانەناسکەم بۆ دەنێرن.»

پیرەپیاو گوتی: «سڵاو مارک! زۆر خۆشحاڵم بە بینینت.»

پاشان بە تەکانێکی خێرا لاقی ڕووتی بە لێواری تەختەکەدا شۆڕ کردەوە و بازی دا خوارێ و دوو هەنگاو بە نێو ژوورەکەدا ڕۆیشت. چاوێکی لە لاقە خواروخێچەکانی خۆی کرد و دای لە قاقای پێکەنین، پاژنەی لاقی دوو سێ جار کوتا بە تەرکی ژوورەکەدا و هەنگاوێکی دیکەی هەڵێنایەوە، بە بزەیەکەوە لە لووکاشکای پرسی: «پێت چۆنە؟ خۆ خراپ نییە؟»

لووکاشکا هێندە پێکەنی لەوانەبوو ژان بکا. پاشان پیرەپیاو گوتیشی: «دەی تۆ دەچی بۆ پاسگا؟»

- من ئەو شەڕابەی بەڵێنم پێدابووی، بۆم هێناوی.

پیرەپیاو گوتی: «مەسیح ئاگادارت بێ!» پاشان چامباری[٣٤] و بەشمیتەکەی کە بە سەر زەویدا دەکێشرا، هەڵیگرت و لە خۆی پێچا.

---

٣٤ چامباری: پانتۆڵی فش و دەلینگ‌زل

پشتێنەکەی لە نێوقەدی توند کرد، بە پەرداخێکی شکاو ئاوی بە دەستی خۆیدا کرد و بە چامبارییەکی کۆنە دەستی وشک کردەوە، بە لەتە شانەیەک ڕیشی داهێنا و ڕاست لە بەردەمی لووکاشکا ڕاوەستا و گوتی: «ئامادەم!»

لووکاشکا پەرداخێکی هەڵگرت، وشکی کردەوە و پڕی کرد لە شەڕاب، لە سەر کورسییەک دانیشت و پەرداخەکەی لە بەردەمی مامە ئیرووشکا ڕاگرت. مامە ئیرووشکا بە شێوەیەکی پڕشکۆ و ڕێزدارانە لە لووکاشکای وەرگرت و گوتی: «بە خۆشیت! سپاس بۆ باوک و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز! هیوادارم کامەران بی و بە ئاواتی دڵت بگەی و خاچەکەی مەسیح سایەی سەرت بێ.»

لووکاشکایش بەو شێوەیە دۆعایەکی خوێند و پیکێک شەڕابی هەڵدا و پەرداخەکەی لە سەر مێزەکە دانا. پیرەپیاو هەستا بڕێکی ماسیی سوێرکراو هێنا، لەسەر کەرکەرۆکەی دەرگاکەی دانا و بە دارێک هێندێکی کوتا هەتا نەرم بۆوە، پاشان بە دەستە زبر و قەڵەشیوەکانی خستیە سەر تاقە دەورییەکی شین کە لەماڵەکەیدا بوو، فەرمووی لە لووکاشکا کرد و بە شێوەیەکی لووت بەرزانە گوتی: :من هەموو شتێکم هەیە، تەنانەت هەموو جۆرێ هۆردووڤر[٣٥]، شوکر بۆ خودا.» پاشان پرسیی: «دەی مۆسۆڤ خەریکی چییە؟»

لووکاشکا بۆی باس کرد کە چۆن ملازم تفەنگەکەی لە چنگ دەرهێناوە و ئێستا لووکاشکا دەیویست بیروڕای مامە ئیرووشکا لەو بارەیەوە بزانێ. پیرەپیاو گوتی: «بۆ تفەنگێک کێشەی لەگەڵ ساز مەکە. ئەگەر تفەنگەکە نەدەی بە ئەو، نابێ بە هیوای پاداش بی.»

ـ پاداش؟ مەگین کازاخێک کە هێشتا خزمەتی سوارکاریی ئەنجام نەداوە پاداشی پێدەدەن؟ خۆشت دەزانی تفەنگ ئەمڕۆ نرخێکی باشی هەیە. تفەنگێکی باش بە هەشتا سکە دەستاودەست دەکا.

---

٣٥ ئۆردووڤر: Hors- doevre وشەیەکی فەڕەنسییە یانی خواردنێکی ئیشتیابزوێن کە بەر لە خواردنی سەرەکی دەیخۆن. بەرەچێشت.

ـــ هەیهـــوو، لەوە گەڕێ! مـــن جارێکیـــان لەگەڵ کەســـێکی یووزباشـــی بەشەڕهاتم. دەیویست ئەسپەکەم لێ بستێنێ و دەیگوت ئەسپەکەتم بدەیە، منیش نیشانەی ملازمیت بۆ وەردەگرم. من ئەسپەکەم پێ نەدا، بۆیە هیچم وەگیر نەکەوت.

- بەڵام من چارم چییە؟ من دەبێ ئەسپێک بکڕم و ئەو جۆرەی بیستوومە ئەسـپ لەوبەری ڕووبـارەکە لە پەنجـا سـکە کەمتـر نیـیە و دایکـم هێشـتا شەڕابەکەی خۆی نەفرۆشتووە.

پیرەپیاو گوتی: «ئێمەومانان، وەک ئێوە ئەرکمان لە سەر شان نەبوو. کاتێک مامە ئیرووشکا لە تەمەنی تۆدا بوو، هەمیشە چەند ئەسپی تابۆنی لە نۆقانییەکـان دەدزی و لە چـۆمی تەرەکـی دەپەڕانـدنەوە. هێنـدێ جـاریش ئەسپێکی باشمان بە بتڵێک ئارەق یان بۆرکایەک[36] دەگۆڕییەوە.»

لووکاشکا لێی پرسی: «بۆ ئەوەندە هەرزان؟»

پیرەپیاو بە سووکایەتییەوە گوتی: «گەمژە، مارکی گەمژە! هیچ کارێکی دیکەمـان پێ نەدەکرا، کاتێـک پیـاو شـتێک دەدزێ بـۆ ئەوەیە ئیتـر ڕژدی و نینۆک وشکی وەلانێ. ئێوە حەتمەن هیچ کات نەتاندیوە کە چۆن ڕەوە بە تالان دەبەن؟ وا دیارە هیچ قسەیەکت بۆ گوتن نییە.

- جا چت عەرز کەم، مامە گیان؟ هەڵبەت ئێمە وەک ئەو پیاوانەمان پێ ناکرێ.

پیرەپیـاو لەگەڵ ئەوەی گـاڵتەی لەگەڵ کـازاخی لاو دەکـرد، گـوتی: «بـێ شـعوور، بێ شـعوور! وەک ئەو پیاوانەتـان پێ نـاکرێ! جا دیـارە کاتێک لە تەمەنی تۆدا بووم وەک ئێوە کازاخێکی خوێڕی نەبووم.»

لووکاشکا گوتی: «کەوایە ئێوە چۆن بوون؟»

پیرەپیـاو بە نیشـانەی سـووکایەتی سـەری ڕاوەشـاند و گـوتی: «مـامە ئیرووشـکا لە دەسـت هـیچ شـتێک سـکاڵای نەدەکـرد و هەر بـۆیەش تەواوی چێچێنەکان لەگەڵم هاوڕێ بوون. هەرکاتێک یەکێک لەوان بێت بۆ لام، لەڕێوە

---

٣٦ بۆرکا: قاپووتێکە لە بەرگن دروست دەکرێ و تایبەتی کازاخەکانە.

به ڤۆدکـا میوانـداریی لـێ دەکەم و بە شـێوەیەکی دڵسـۆزانە هەڵسـوکەوتی لەگەڵ دەکەم، هێندەی دەرخوارد دەدەم هەتـا سـەرخۆش دەبێ. لە لای خۆم دەیخەوێنم و پاشان منیش دەچم دەبمە میوانی ئەو و دیاری و پێشکەشی بۆ دەبەم. بەڵێ زوو پیاوان بەو شێوەیە ڕەفتاریان دەکرد، نە وەک ئێستا. پاشان پیرەپیـــاو هەروا بە لەبزێکـــی پڕســـووکایەتییەوە لەگەڵ ئەوەی لاســـایی تووتروکانـدنی کازاخەکـانی دەکـردەوە، درێـژەی بە قسـەکانی دا و گـوتی: بەڵام ئێستا، گەورەترین ڕابواردن ئەمەیە کە تۆوی گوڵەبەڕۆژە بتروکێنن و تێخوڵەکەشی ئاوا بە دەم فڕێ دەدەن.»

لووکاشکا گوتی: «دەزانم وایە!»

ـ ئەگەر تـۆ دەتـهەوێ کـازاخ بـی، جیگیـت بە، نە ژنـانیلەیەکی خـوێڕی و تووتروکێن. کەسێکی تووتروکێن ئەسپی خۆی دەکڕێ و پارەکەی دەدات و ئاژەڵەکە لەگەڵ خۆیدا دێنێتەوە.

هەردووکیان ماوەیەک بێدەنگ بوون.

ــ لە ڕاسـتیدا، مـامە، مـانەوە لە گونـد یـان لە پاسـگا زۆر نـاخۆش و جـاڕزکەرە. پیـاو بچـێ بـۆ کـوێ تۆزێـک سـەیران بکـا و ڕاببـوێرێ؟ خەڵکـی شەرمەون بوون. بۆ وێنە چاو لە ناسایر بکە. ڕۆژی ڕابردوو، ئێمە لە ئائوول بووین؛ قیریخان پێشنیاری کرد بچین بۆ لای نۆقانییەکان بۆ هێنـانی ئەسـپ؛ بەڵام هیچکەس ڕێی دانەگرت. بە تەنیا چیت پێدەکرێ؟

ـ دەی مـامە گیـان تـۆ چـۆنی بـۆ دەچـی؟ پێت وایە مـن لە کـار کەوتـووم! هێشتا هەروا بەگوڕم! ئەسپێکم پێ بدە بزانە چۆن لە چاوتروکانێکدا خۆم دەگەینمە لای نووقانییەکان.

ـ بۆ لەخـۆڕا قسـەی زیـادی بکەیـن؟ پێم بڵـێ بزانم چۆن لەگەڵ قیریخـان هەڵسوکەوت بکەم؟ ئەو دەڵێ: تەنیا ئەسپێک هەتـا نزیک تەرەک بێنە و لەوێ ئیتر ئەگەر ڕەوەیەکیش بێ، من جێگات بۆ دابین دەکەم. بەڵام ئەو قیریخـانە سیخوڕێکی زیرەکە، دەکرێ پیاو بڕوای پێ بکا؟

ـ بەڵێ، دەکرێ بڕوا بە قسەکانی بکەی. بنەماڵەکەی هەموویان کەسانێکی باشن. باوکی هاوڕێی وەفاداری من بوو. تۆ تەنیا گوێ لە من بگرە. من هیچکات بۆ ڕێگای خراپ ئامۆژگاریت ناکەم، بۆ ئەوەی بە تەواوی لێی دڵنیا بی، سوێندی بدە؛ ئەگەر ویستت بۆ جێگایەک لەگەڵی بچی، هەمیشە دەمانچەیەکی ئامادە لە گیرفانت بنێ، بەتایبەت کاتی بەش کردنی ئەسپەکان. جارێکیان چێچێنێک خەریک بوو من بکووژێ و ڕووداوەکەش بەم شێوەیە بوو: من بۆ ئەسپێک داوای دە سکەم لێ دەکرد. ئەویش نەیدەویست بیدا و لێم وە تەماح کەوت. باوەڕ و متمانە شتێکی باشە، بەڵام قەت بەبێ تفەنگەکەت مەخەوە.

لووکاشکا بە وردی گوێی بۆ پیرەپیاو گرتبوو و دوای تاوێ بێدەنگی گوتی: «مامە، ڕاستم پێ بڵێ! من پێم وایە تۆ تەلەسمێکت پێیە کە هەموو کارێکت بۆ جێبەجێ دەکات.

ـ تەلەسم؟ نا، بەڵام باشە، من فێرت دەکەم. تۆ کوڕێکی باشی و مامی خۆت لە بیر ناکەی. ئێستا فێرت بکەم یان نا؟

ـ بەڵێ مامە گیان، فێرم بکە.

ـ ڕەققە[37] دەزانی چییە؟ ئەوە بزانە! ڕەققە شەیتانی ڕاستەقینەیە.

ـ بەڵێ وایە.

ـ چاکە، بچۆ کونەکەی هەڵکۆڵە و لە دەوراندەوری کونەکەی تۆڕ دابنێ، بۆ ئەوەی نەتوانێ لێوەی تێپەڕێ، ئەو دێتەوە کە ئەوە دەبینێ دەست دەکا بە گەڕان و دوای سووڕانەوەیەکی زۆر خێرا دەگەڕێتەوە: ئەو تەلەسمی کردنەوەی دەرگا داخراوەکان دەدۆزێتەوە و لەگەڵ خۆیدا دەیهێنێ و تۆڕەکەی پێ کون دەکا و دەچێتە ژوورێ. تۆ سبەینێ بەیانی وەرەوە بۆ لای کونەکەی و چاوی لێ بکە. ئەو جێگایەی تۆڕەکە کە دڕاندوویە، تەلەسمەکەیە. هەڵیگرە و بۆ هەرکوێ چووی، لەگەڵ خۆتدا بیبە. ئیتر بۆ تۆ

---

٣٧ ڕەققە: کیسەڵی ناو ئاو

هــیچ قوفـڵ و بەربەســتێک مانــای نــابێ و هەمــوو دەرگــا داخراوەکــان لە بەردەمتدا دەکەونە سەر پشت.

ـ مامە پێم بڵێ، تۆ خۆت ئەو کارەت تاقی کردۆتەوە،؟

ـ تـاقیم کـردۆتەوە؟ نـا، تـاقیم نەکـردۆتەوە، بەڵام کەسـانێکی زۆر بـاش ئەوەیان پێ گوتووم و من لە گوێم گرتووە. من تەنیا جادوویەک کە هەمە ئەوەیە هەرکاتێک سواری ئەسپ دەبم، دۆعای «سڵاو لە ئێوە» دەخوێنم و تا ئێستا هیچ کەس ئازاری پێ نەگەیاندووم.

ـ دۆعای «سڵاو لە ئێوە» چییە مامە گیان؟

ـ چۆن ئەوە نازانی! ئاخ! ئەوەش گەنجی ئەمڕۆ! دۆعاکە ئەمەیە، جا گوێ لە مامی خۆت بگرە، من دەیخوێنم و تۆش بە دوای مندا دووپاتی بکەوە:

***«سڵاو لە ئێوە ئەی دانیشتووانی سەهیۆن***

***ئەمە شای تۆیە.***

***ئێمە سواری ئەسپەکان دەبین.***

***سۆفۆنی هاوار دەکا.***

***زەکەریا دەدوێ.***

***باوکی من ماندریچ!***

***کە خۆشەویستیت لە دڵدایە،***

***کە خەڵکت خۆش دەوێ!»***

پیرەپیـاو دیسـان دووپـاتی کـردەوە: «کە خۆشەویسـتیت لە دڵـدایە، کە خەڵکت خۆش دەوێ. دەی، ئێستا تێگەیشتی؟ جوان و بێ هەڵە بیخوێنەوە با گوێم لێ بێ.»

لووکاشکا بە توندی قاقای کێشا:

ـ هەر بۆیە تا ئێستا تۆیان نەکوشتووە؟ لەوانەیە ڕاستیش بێ.

ـ تـۆ زۆر زیـرەک و بەهۆشـی! ئەوەی گـوتم بە جـوانی فێـری بە و بیخوێنەوە، ئیتر هیچکات ئازار و زیانت پێ ناگا. تۆ «ماندریچ»ی خۆت بخوێنە و ئیتر ئاسوودە و خـاترجەم بە. ـ پیرەپیـاو خۆشـی دای لە قاقـای

پێکەنین. ـ بەڵام سەبارەت بە نووقانییەکان، ئەوە لە گوێ بگرە لووکاشکا، بۆ ئەوێ مەچۆ!

ـ مامە، بۆ نەچم؟

ـ سەردەمەکە فەرقی کردووە و خەڵکیش ئیتر وەک قەدیم نین، ئێوەش لە ڕاستیدا سێبەری کازاخەکانن، ئەو کاتە ئەم هەموو ڕووسە ڕژاونەتە ئێرە، سزات دەدەن! ڕاستت دەوێ، بیر لەو شتانە مەکەوە و وازی لێ بێنە. ئەو کارانە بۆ ئێوە نابێ! سەردەمی ئێمە، لەگەڵ گیرچیک...

پیرەپیاو دەیویست دیسان چیرۆکی دوور و درێژ دەست پێ بکاتەوە کە لووکاشکا لە پەنجەرەکەوە چاوی لە دەرێ کرد، قسەکەی بە مامە ئیرووشکا بڕی.

ـ مامە، خۆر بە تەواوی لە ئاسۆ وەسەر کەوتووە. دەبێ بڕۆم. تۆش جارجار سەرێکمان لێ هەڵێنە.

ـ مەسیح ئاگادارت بێ! من دەبێ بچم بۆ لای ئەو کوڕە ئەفسەرە. من بەڵێنم پێ داوە لەگەڵ خۆمدا بیبەم بۆ ڕاو. پێموایە کوڕێکی باشە.

# حەڤدە

لووکاشکا لە ماڵی مامە ئیرووشکاوە ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان. کاتێک هاتە دەرێ، تەمومژێکی چڕ لە زەویی شێدار و بە ئاونگ خووساو بەرز دەبۆوە و تەواوی گوندەکەی داگرتبوو. ئاژەڵ و پەلەوەر لە هەموو لایەکەوە دەنگیان دەهات. کەڵەشێرەکان بە تینوتاو دەیانخوێند و لەم سەرەوسەری گوندەکەوە بۆ یەکتریان دەگێڕایەوە. هەوا بەرەو ڕووناکی دەچوو و وردە وردە خەڵک لە ماڵەکانیان دەهاتنە دەرێ. لووکاشکا کە لە ماڵەکەیان نزیک بۆوە، پەرژینی دەوری ماڵەکە بە شەونمی بەرەبەیان خووسابوو و پلیکان و درگای کراوەی ماڵەکەی بە ڕوونی دیت. لە حەوشەی ماڵێ، لە نێو تەمومژدا، زرمەی بیورێک دەهات کە خەریکی شکاندنی ئێزنگ بوو. لووکاشکا چووە حەوشە. دایکی لە بەر کوانووەکە ڕاوەستابوو و ئێزنگی پێوەدەنا. خوشکە چکۆڵەکەی هێشتا لە پێخەفەکەی نەهاتبووە دەرێ. دایکی بە مێهرەبانییەوە لێی پرسی: «دەی، کوڕم، بیستوومە شەڕت کردووە؟ دوێشەو لە کوێ بووی؟»

لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی تفەنگەکەی لە کالان دەردەکێشا کە تاقیی بکاتەوە، بە پێچەوانەی ویستی خۆی وەڵامی دایەوە: «لە گوندەکە.»

دایکی سەری ڕاوەشاند.

لووکاشکا هێندێ باڕووتی کردە لوولەی تفەنگەکەیەوە؛ لە نێو دەفرێکی باڕووتدا چەند گوللەی دەرهێنا و دەستی کرد بە پڕکردنی فیشەک و هەر لەو کاتەدا گوللەیەکی چکۆلەی کە پەڕۆیەکی تێ پێچابوو لە نێوەڕاستی گوللەکانی دیکەدا دانا. پاشان پەڕۆی دەوری فیشەکەکانی لێکردەوە و دوای ئەوەی تاقیی کردنەوە کیسەکەی لە جێگای خۆی دانایەوە.

ـ دایە، من داوام کردبوو هەگبەم بۆ پینە بکەی. کردووتە؟

ـ ئەرێ! لاڵەی خوشکت دوێنێ عەسر خەریک بوو شتێکی پینە دەکرد. تۆ دەبێ بگەڕێیەوە بۆ پاسگا؟ من تۆم هەر نەدی.

لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی باڕووتی دادەگرتەوە وەڵامی دایەوە: «بەڵێ، خۆم ئامادە دەکەم و دەگەڕێمەوە. لاڵە لە کوێیە؟ چۆتە دەرێ؟»

ـ ئەرێ، ڕەنگە چووبێ بۆ کۆکردنەوەی ئێزنگ. زۆر لە بیری تۆدایە و دەیگوت من ئیتر براکەم نابینمەوە. ئەو بە دەست و دەموچاو ئاوا ئاماژەی دەکرد، قامکەکانی لێک دەدا و پاشان لە سەر دڵی خۆی دادەنا و ئەم کارە: یانی من خەم دەخۆم. پێویستە بانگی بکەین؟ سەبارەت بە ئابرەکەکە هەموو شتێکی زانیوە.

لووکاشکا گوتی: «بەڵێ، بانگی بکە. من هێندێک پیوی بەرازم هەبوو، بیهێنە دەمەوێ شمشێرەکەم چەور کەم.»

دایکی لووکاشکا چووە دەرێ و دوای چەند ساتێک خوشکە لاڵەکەی لووکاشکا بە قاڵدرمەکاندا وەسەرکەوت و تەپوکوتی ساز کرد. ئەو کچە شەش ساڵ لە لووکاشکا گەورەتر بوو. ئەگەر دەموچاوی خڕی وەکوو هەموو کەڕولاڵەکان بزۆک و پڕ جووڵە نەبووایە، لەگەڵ لووکاشکا دەتگوت سێوێکن کراون بە دوو لەتەوە. کچە کراسێکی زبری پینەپینەی لە بەردا بوو؛ لاقوقولی پێخاوس و چڵکن بوو و لەچکەی شینی کۆنەی بە سەردا دابوو. شان و مل و دەستی وەک هی پیاوان، پڕ لە دەمار و ماسوولکە بوو. بە جلوبەرگ و تەواوی شتەکانیدا دیار بوو کە کاری دژواری پیاوانەی لە ئەستۆیە. کچە باوەشێک ئێزنگی هێنابوو، لەبەر کوانووەکە داینا. پاشان بە بزەیەکی پڕشادییەوە کە چرچولۆچی خستە هەموو دەموچاوی، چوو بۆ لای براکەی، دەستی خستە سەر شانی و بە دەست و دەموچاو و تەواوی جەستەی ئاماژەیەکی خێرای بە براکەی کرد. براکەی لەگەڵ ئەوەی سەری دەلەقاند گوتی: «باشە، باشە، بژیی ستیڤان! کارەکەت زۆر جوانە و هەموویت پینە کردووە. دەستت خۆش بێ! هانێ ئەوەش بۆ تۆ!» لووکاشکا دوو لەتکە کولێرەناسکەی لە گیرفانی دەرهێنا و دای بە خوشکەکەی.

لاڵە سوور هەڵگەڕا و لە خۆشیانا بە شێوەیەکی شێتانە قیژاندی، کولێرەناسکەکانی هەڵگرت و لەگەڵ ئەوەی ئاماژەی بە لایەکی کولێرەکان دەکرد، قامکە ئەستوورەکانی لە سەر مژۆڵ و ڕوومەتی خۆی دادەنا و خێراخێرا ئاماژەی دەکرد. لووکاشکا لە ئاماژەکانی تێدەگەیشت و بە پێکەنینەوە سەری دەلەقاند. کچە بە براکەی گوت: شیرینی بۆ کچەکان ببە، دەیگوت کچەکان ئەویان خۆش دەوێ و بە تایبەت یەکیان، واتە ماریانکا، لە هەموویان باشترە و ئەویش لووکاشکای خۆش دەوێ. ئەو بۆ پیشان دانی ماریانکا بە سەر و دەست و چاوی ئاماژەی بە ماڵی ماریانکا دەکرد و لێوی دەجووڵاندەوە و سەری بە هەموو بارێکدا دەگێڕا. بۆ ئەوەی بڵێ «ئەو تۆی خۆشدەوێ» دەستی لە سەر سنگی دادەنا، پاشان دەستی خۆی ماچ دەکرد و حاڵەتی کوژاندنەوەی شتێکی لە خۆی دەگرت. دایکی چووە ژوورێ و کە دیتی لاڵە سەبارەت بە شتێک دەدوێ، پێکەنی و سەری ڕاوەشاند. کچە کولێرەناسکەکانی پیشان دایکی دا و سەرلەنوێ لە خۆشیانا قیژاندی. دایکی لووکاشکا گوتی: «من بە ئۆلیتام گوتووە کە بۆ خوازبێنیی ئەو دەنێرم. ئەویش بەڵێنی پێدام.»

لووکاشکا چاوی لە دایکی کرد بەڵام هیچی نەگوت.

ـ بەڵام، دایە گیان دەبێ زووتر شەڕاب بفرۆشی. من پێویستم بە ئەسپێکە.

ژنەکە دیار بوو نایەوێ کوڕەکەی خۆ لە کاروباری ماڵی هەڵقوتێنێ، گوتی: «کاتی خۆی بێ، دەچم چلیکەکان ئامادە دەکەم. هەرکاتێک ڕۆیشتی توورەکەیەکی چکۆلەم لە دالانەکە داناوە لەگەڵ خۆت ببە. ئەوەم بە ئەمانەت وەرگرتووە، هەتا توربێنەکەی خۆت پینە دەکەم. جارێ ئەوە لەگەڵ خۆت ببە بۆ پاسگا. یان ئەگەر حەزت لێبوو لە ساکواکەتی[38] بنێ، هەرکات پێویستت بوو دەریهێنە.»

لووکاشکا لە وەڵامی دایکیدا گوتی: «زۆر باشە، ئەگەر قیریخان لەوبەری چۆمەکەوە هات، پێی بڵێ بێ بۆ پاسگا، چونکە بەم زووانە دەستم لە کۆڵ

٣٨ ساکوا: کیسەیەکی گەورەیە کازاخەکان لە پشتی زینی قایم دەکەن. پاشکۆ

ناکاتەوە و منیش ئیشم پێیەتی.» پاشان دەستی کرد بە پێچانەوەی کەلوپەلی پێویست.
ـ دەی، لووکاشکا گیان! باشە ئەگەر هات دەینێرم بۆ پاسگا؛ بەڵام پێم بڵێ دوێشەو لە ماڵی ئیانکا خەریکی ڕابواردن بوون؟ من شەوێ هەستام سەری ئاژەڵەکان بدەم دەنگێکم گوێ لێبوو، پێم وایە تۆ بووی گۆرانیت دەگوت.
لووکاشکا وەڵامی نەدایەوە و خۆرجینەکەی لە شانی کرد و لە ژوورەکە چووە دەرێ؛ زیپوونەکەی لە خۆی پێچا، دەستی دا تفەنگەکەی و لە نێو دەرگانەی حەوشەکەدا ڕاوەستا و گتێکی گرت، پاشان لەگەڵ ئەوەی دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە پێوەدا گوتی: «خوداحافیز دایە گیان! چلیکێک شەڕابم بە ناسایردا بۆ بنێرە. بەڵێنیم بە هاوڕێکانم داوە؛ ناسایر لای قاوەڵتوون لێرەوە تێدەپەڕێ.»
ژنە لەگەڵ ئەوەی لە تەیمانی حەوشەکە نزیک بووبۆوە، گوتی: «مەسیح ئاگادارت بێ کوڕە خۆشەویستەکەم! خودا ئاگادارت بێ! بە سەرچاو، شەڕابیشت بۆ دەنێرم؛ لەو کووپەیەی هەڵدەگوێزم کە تازە سەرەکەییم هەڵپچڕیوە.» لەگەڵ ئەوەی تۆزێ بە سەر تەیمانەکەدا خۆی خوار کردبۆوە گوتیشی: «ڕاوەستە بزانم.»
لووکاشکا ڕاوەستا.
ـ دوێشەو لێرە خەریکی خۆشگوزەرانی بووی، زۆر چاکە، گوێی مەدەیە! گەنجی و تەمەنت ئەوە دەخوازێ. بەڵام ئەوە بزانە تۆ شانسێکی گەورەت هەبوو. ئەوانە هەمووی بە جێی خۆی. بەڵام لەوێ، ڕۆڵە گیان لەوێ، ئاگات لە خۆت بێ... بەتایبەت ڕێزی فەرماندەرەکەت لە چاودا بێ! ئەو کارە پێویستە، شەڕابەکەش بە سەر چاو. هەرکاتێ فرۆشتم پارەکەی دادەنێم کە ئەسپێکی پێ بکڕی، خوازبێنیشت بۆ دەکەم.
لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی نێوچاوانی وێک هێنابوو وەڵامی دایەوە: «باشە، باش!» کچەش بۆ ئەوەی بوونی خۆی ڕابگەیێنێ، قیژاندی. ئەو ئاماژەی بە دەست و سەری دەکرد. ئەو کارە یانی: «سەری تاشراوی چێچێن.» پاشان

بـرۆی وێـک هێنـا و وەک ئەوەی بە تفەنـگەوە سـێرەی گرتبـێ، جـارێکی تـر قیژاندی و دەستی کرد بە لۆرەلۆر و خێراخێرا سەرودەستی دەجوولاندەوە. ئەو بەو کارانەی بە لووکاشکای دەگوت کە دیسان پیاوێکی چێچێنی بکوژێ. لووکاشکا تێگەیشت، پێکەنی و بە هەنگاوی سـووک لەگەڵ ئەوەی تفەنگەکەی شانی ڕاستەوپاستە کرد، لە نێو تەمومژی چڕی بەیانیدا لە چاو ون بوو.

دایکـی بە بێـدەنگی لە بەردەرگـای گەوڕەکە ڕاوەسـتا. پاشـان گەڕایەوە ژووری و خۆی بە کاروباری ناوماڵەوە سەرقاڵ کرد.

# هەژدە

لووکاشکا چوو بۆ پاسگا، مامە ئیرووشکاش لەو کاتەدا بە فیتوو سەگەکانی خۆی بانگ کرد و لە حەوشە خەڵوەتییەکەوە خۆی کرد بە ماڵی ئۆلێنیندا. (ئیرووشکا کاتێک دەچوو بۆ ڕاو، حەزی نەدەکرد ژن بێتە سەر ڕێگاکەی.) ئۆلێنین هێشتا لە خەودا بوو، تەنانەت ژانۆش کە تازە خەبەری بووبۆوە، هێشتا هەڵنەستابوو و لە نێو پێخەفەکەیدا چاوی بە دەوروبەری خۆیدا دەگێڕا تاکوو بزانێ کاتی هەستانە یان نا. کاتێک ئیرووشکا تفەنگ لە شاندا و بە جلوبەرگی ڕاوەوە چووە ژووری، دەرگاکەی کردەوە و دەنگی گڕ و زلی هەڵێنا: «ئەی هاوار، زووکەن، ڕاپەڕن! چێچێنەکان هاتوون! ئیڤان، سەماوەرەکە هەڵکە! زوو هەستە! هەی ڕاستەوە نەبی، تۆ هێشتا لە نێو نوێنداى! زووکە زوو، بەڵێ دابی وڵاتی ئێمە هەروایە. هەستە پیاوی ئازا، هەستە! کچان هەموو هەستاون. لەو پەنجەرەیەوە بڕوانە، چاوی لێکە یەکیان دەچێ بۆ ئاو و تۆ هەیشتا خەوتووی!

ئۆلێنین خەبەری بۆوە و لە قەرەوێڵەکەی هاتە خوارێ. بە دیتنی پیرەپیاو و دەنگی بۆڕی بەو بەیانییە، هەستی بە شادی و حەسانەوەیەکی تایبەت کرد و دەنگی هەڵێنا: «ژانۆ، زووکە زوو!»

ـ ئاوا دەتەوێ بچی بۆ ڕاو؟ خەڵکی خەریکن ناشتایی دەخۆن و تۆ هێشتا لە خەودای؟

پاشان ئۆلێنین بە سەگەکەی گوت: «هۆی لیام! بۆ کوێ هەڵدێی؟» پاشان وەک کەسانێکی زۆر لە ماڵەکەدا بن دەنگی هەڵێنا: «ئەی تفەنگەکەت کوا؟ ئامادەت کردووە؟»

ئۆلێنین باوێشکێکی دا و گوتی: «ئەرێ، خەتای منە. تازە وای لێهات، ببوورە. ژانۆ، باڕووت و جزدانی پارەکەم!»

پیرەپیاو دەنگی هەڵبڕی: «جەریمە دەکرێی!»

ژانۆ بە پێکەنینەوە گوتی: «Du the’ voulez vous»[39]

پیرەپیاو دەستی کرد بە پێکەنین و لەگەڵ ئەوەی بێخی ددانە زەردەکانی دیار بوو، دەنگی هەڵێنا: «تۆ لە ئێمە نیی! نارەسەن، تۆ وەک ئێمە قسە ناکەی!»

ئۆلێنین لەگەڵ ئەوەی خەریکی لە پێ کردنی جزمە گەورەکانی بوو، بە گاڵتەوە گوتی: «بۆ جاری یەکەم دەبێ بمبووری.»

ئۆلێنین وەڵامی دایەوە: «قەیناکا چونکە یەکەم جارە نۆبەخشت بێ، بەڵام جارێکی تر ئاوا درەنگ لە خەو هەستی، دەبێ دۆلکەیەک چیخیر جەریمە بدەی. کاتێک هەواکەی گەرم بکات، خۆ بزنەکێوی لە سەر تۆ ڕاناوەستێ.»

ئۆلێنین ئەوەی دوێشەو پیرەپیاو گوتبووی دووپاتی کردەوە: «تەنانەت ئەگەر لە سەریشمان ڕاوەستێ، لە ئێمە زیرەکترە، هەڵبەت تۆ بە سەریدا ناسەپێنی.»

ئیرووشکا کە لە پەنجەرەکەوە چاوی لە دەرێ دەکرد، گوتی: «پێبکەنە، سەرەتا بیکووژە، قسە هەڵگرە بۆ دوایی! دەی زووکە، زوو! ئەها، ئەوەش ئاغا خەریکە دێ بۆ لای تۆ. چاکیش خۆی جوان کردووە، زیپوونێکی نوێی لەبەر کردووە، بۆ ئەوەی تۆ نەزانی ئەفسەرە. ئاخ، لەم خەڵکە، لە دەست ئەم خەڵکە!»

لەو دەمەدا ژانۆ خۆی کرد بە ژووریدا و گوتی کە خاوەنماڵ دەیهەوێ چاوی بە ئۆلێنین بکەوێ و بۆ ئەوەی هۆی ئەو دیدارە لە ئاغاکەی تێگەیێنێ بە دەنگێکی زایەڵەدار گوتی: «L’argent»[40]

ملازم دووهەم کە چەرکسای نوێی لەبەر کردبوو و نیشانەی ئەفسەریی لە سەر شانی دابوو، بە جزمەی بۆیاغ کراوەوە (شتێک کە لە لای کازاخەکان زۆر دەگمەنە)، بە پەلە و دەم بە پێکەنین خۆی کرد بە ژووریدا، هەروا کە لە

---

٣٩ یانی: چایی دەخۆنەوە؟ لە دەقی سەرەکیشدا بە زمانی فەڕەنسییە.

٤٠ وشەیەکی فەڕەنسییە یانی: پارە. لە دەقی سەرەکیشدا فەڕەنسییە.

نێو ژوورەکەدا بوو و خۆی دەلەقاند، سڵاوی لە ئۆلێنین کرد و بەخێرهاتنی پێ گوت. ملازم دووهەم ئیلی ڤاسیلیویچ، کازاخێکی خوێندەوار بوو، کە سەفەری کردبوو بۆ ڕووسیا، لە بنەماڵەیەکی خانەدانەدا لە دایک بووبوو و ئێستا بەڕێوەبەری قوتابخانە بوو. ئەو دەیویست خۆی وەک بنەماڵەیەکی ڕێزدار و خاوەن شکۆ پیشان بدات بەڵام سەرەڕای ئەوە، لە ژێر پەردەیەکی ناسکی بڕوابەخۆیی و شاتوشووتدا، ئەویش بە ئاشکرا مامە ئیرووشکایەکی تر بوو؛ ئەوەش لە ڕوخساری سەوزە و دەستوپل و لووتە سوورەکەیدا بە ڕوونی دیار بوو. ئۆلێنین داوای لێکرد دانیشێ. ئیرووشکا لەبەری هەستا و کڕنۆشکێی بۆ کرد، کە لە ڕوانگەی ئۆلێنینەوە ئەو کڕنۆشە زیاتر وەک گاڵتە و بە گەوج زانین دەچوو. دەستی بە سینگیەوە گرت و گوتی: «سڵاو ئیلی ڤاسیلیویچی خۆشەویست.»

ملازم دووهەم بە ئاستەم سەرێکی لەقاند و گوتی: «سڵاو مامە! تۆ ئێستا لێرەی؟»

ملازم دووهەم پیاوێکی چل ساڵان بوو، ڕیشێکی نووک تیژی لە بەرچەنەی دانابوو. قەڵافەتێکی ویشک و ڕەقەڵە و لەباری هەبوو کە بە پێی تەمەنی هێشتا تەڕ و تازەی دەنواند. ئێستا کە هاتبوو بۆ لای ئۆلێنین لەوە دەترسا لە بەرچاوی ئەو وەک کازاخێکی ئاسایی بنوێنێ، بۆیە حەزی دەکرد زۆر خێرا گەورەیی خۆی بنوێنێ و ئەو لاوە غەوارەیە لە شانوشکۆی خۆی تێگەیێنێ. ملازم دوای چاکوچۆنی لەگەڵ ئیرووشکا لەگەڵ ئەوەی ئاماژەی بە ئەو دەکرد، ڕووی لە ئۆلێنین کرد و بە بزەیەکەوە گوتی: ***«ئەوە نمروودی میسریی ئێمە و ڕاوچیی گەورەی ئاغایە.»***[41]

---

٤١ ملازم دەیویست بە شێوازی پەخشانی بەرز و شاهانە بڵێ: «ڕاوچیی مەزنی حەزرەتی باری.» بەڵام بە هەڵە وشەیەکی گوت کە هاوواتای ئاغایە.

مامه ئیرووشکا لەگەڵ ئەوەی چاوی لە پوورشنییە[٤٢] خووساوەکانی خۆی دەکرد، سەری بە شێوەیەکی بیرمەندانە لەقاند و وەک ئەوەی ڕێز بۆ زانست و شارەزایی ملازم دابنێ، لە بەرخۆیەوە دووپاتی کردەوە: «نمروودی میسری! شتی چۆن لە جیکەڵدانەی دەردێنێ؟!»

ئۆلێنین گوتی: «ئێستا دەمانەوێ بچین بۆ ڕاو.»

ملازم دووهەم خۆی ئەمبارەوبار کرد و گوتی: «چونکە جەنابت پیاوێکی خانەدان و نەجیبزادەی و منیش لە سەر ئەو باوەڕەم کە ئێمە خاوەنی پلەوپایەی ئەفسەریین، کەوایە بەو ئاکامە دەگەم کە ئێمە دەتوانین وردەوردە وەک هەموو کەسانی شەریف و نەجیب لە مەبەستی یەکتری حاڵی بین و لە یەک تێبگەین. (لێرەدا گتێکی گردت و بە بزەیەکەوە چاوی لە ئۆلێنین و ئیرووشکا کرد) بەڵام ئەگەر جەنابت حەزت لەو بابەتە بێ، هەڵبەت منیش ڕەزایەت دەدەم، چونکە ژنەکەی من لە عەشیرەتەکەماندا وەک ژنێکی گەمژە ناسراوە و ڕواڵەتەن دوێنێ نەیتوانیوە لە فەرمایشەکانی ئێوە تێبگا. چونکە دیوەخانەکەی من بەبێ تەویلە لەوانەیە مانگانە بە شەش سکە بیدەم بە ئاجوودانێکی هەنگ. بەڵام ئەگەر کەسانێک بیانهەوێ بە خۆڕایی ماڵەکەم لێ داگیر بکەن، بەو بیانووەی لە بنەماڵەیەکی خانەدانن، زۆر باش لە دەستم دێ دەریان بکەم. بەڵام ئەگەر سەرنجت دابێ، چونکە خۆشم ئەندامی شاندی ئەفسەرانم، دەتوانم زۆر باش لەگەڵتان بسازێم و وەکوو یەکێک لە دانیشتووانی ئەم ناوچەیە، تەنانەت بە پێچەوانەی دابونەریتی خۆمان، بە هەر شێوەیەک بارودۆخەکە لە بەرچاو بگرم و ...»

مامە ئیرووشکا لە بەرخۆیەوە گوتی: «چەند جوان قسە دەکا!»

ملازم دووهەم دیسان ماوەیەکی تر بەو شێوەیە قسەی کرد. دوای هەموو ئەو قسەوباسانە، ئۆلێنین بۆی دەرکەوت کە ملازم دەیهەوێ کرێی مانگانەی ژوورەکەی شەش ڕۆبڵی زێو بێ. ئۆلێنین ڕەزایەتی دەربڕی و

---

٤٢ پوورشنی: کەوشێک کە لە چەرمی نەرم دروستی دەکەن و تووکی ئاژەڵەکەی پێوەیە و هەڵاڵ نەدراوە.

داوای لە خاوەنماڵەکەی کرد چایەک بخواتەوە. ملازم دووهەم داوای لێبووردنی کرد و گوتی: «بە پێی خووخدەیەکی گەوجانە کە هەمانە، خواردنەوە لە گڵاسی شووشەدا وەک تاوان دێتە ئەژمار. ئەگەرچی، بە پێی ئەو زانستانەی کە فێری بووم، دەتوانم لەو شتانە تێبگەم و بڕوام پێی نییە، بەڵام ژنەکەم بە هۆی دواکەوتووییییەوە ...»

ـ وەلحاسڵ چایەکمان لەگەڵ دەخۆیەوە یان نا؟

ملازم دووهەم لەگەڵ ئەوەی ڕۆیشت بۆ لای دەرگاکە وەڵامی دایەوە: «ئەگەر ڕێگام پێ بدەن. پەرداخێ دەخۆم، بەڵام پەرداخی تایبەتی خۆم دێنم.» پاشان هەرای کرد: «پەرداخێکم بۆ بێنن!»

دوای چەند ساتێک دەرگا کرایەوە و قۆڵێکی ناسک و ئەسمەرە کە لە کراسێکی سووردا بوو، بە پەرداخێکەوە لە کەلێنی دەرگاکەوە هاتە ژوورێ، ملازم دووهەم چووە پێشێ، پەرداخەکەی وەرگرت و سرتەیەکی لەگەڵ کچە کرد. ئۆلێنین بۆ ملازم دووهەم لە پەرداخدا و بۆ مامە ئیرووشکا لە گڵاسی شووشەدا چایی تێکرد. ملازم دووهەم کە بە پەلە چاییەکەی نا بە سەریەوە، دەمی سووتا و گوتی: «من نامەوێ ئێوە ماتڵ بکەم. لەم بارودۆخەدا زۆرم حەز لە ڕاوەماسییە و ئێستاش کە مۆڵەتم وەرگرتووە پشوو بدەم، زۆر حەز دەکەم بەختی خۆم تاقی بکەمەوە، بۆ ئەوەی بزانم تەرەک دیاری بە من دەدا یان نا. هیوادارم ئێوەش ڕۆژێک گەورەیی بنوێنن و سەبەرزم بکەن کە بە پێی دابونەریتی کازاخەکانی خۆمان پێکەوە شەڕابی هاوڕێیەتی بنۆشین.

ملازم دووهەم کڕنۆشێکی کرد، تۆقەی لەگەڵ ئۆلێنین کرد و لە ژوورەکە چووە دەرێ. ئۆلێنین لەگەڵ ئەوەی خۆی بۆ ڕۆیشتن ئامادە دەکرد، گوێی لە دەنگی بەرز و فەرمان پێدەرانەی ملازم دووهەم بوو کە دەستووری بە ئەندامانی بنەماڵەکەی دەدا. دوای چەند ساتێک ئۆلێنین دیتی ملازم دووهەم دەرەلینگی پانتۆڵەکەی هەتا بن ڕەفیچکەی هەڵکردووە و بەشمیتێکی کون کونی لە بەردایە. تۆڕێکی بە لقەدارێکەوە بەستووە و ناویەتە سەر شانی بە بەر پەنجەرەی ژوورەکەی ئەودا تێدەپەڕێ. مامە ئیرووشکا کە چاییەکەی لە

پەرداخە شووشـەدا خواردبـۆوە گـوتی: «نارِەسـەن! دەی ئێسـتا تـۆ مـانگی شەش سکەیان پێدەدەی؟ تا ئێستا هیچکەس شتی وای نەدیوە، باشترین ماڵی گوندەکە مـانگی بە دوو سـکە دراوە بە کـرێ. فێڵەبـاز! مـن مـاڵەکەی خۆمـت مانگی بە سێ سکە دەدەمێ.»

ـ نا، من هەر لێرە دەمێنمەوە، لێرە نارِۆم.

ـ شەش سکە! لە خۆرِا دەیدەی! ئاخ لەو دنیایە! ئیڤان شەرِابم بۆ تێکە.

دوای ئەوەی پیرەپیاو و ئۆلێنین بۆ ماوەی راوەکەیان خۆراک و ئارەقیـان پێچایەوە، سەعات حەوتی بەیانی پێکەوە لە ماڵێ چوونە دەرێ.

بەرەورِووی دیـواری گەورِەکە چاویـان بە عارەبـانەیەک کەوت. ماریانکـا هەتـا بەرچـاوی بە لەچکەیەکـی سـپی داپۆشـیبوو و بەشـمیتێکی بە سـەر کراسـەکەیدا لە بەر کردبـوو، جـووتێ جـزمەی لە پێدا و دارێکـی درێـژی بە دەستەوە گرتبوو و چەند مانگای وەپێش خۆی دابـوو و لێی دەخورِین بۆ لەوەرِگە. پیرەپیـاو هەردوو دەسـتی لێـک بـڵاو کـرد وەک ئەوەی ماریانکـا لە باوەش بگرێ و گوتی: «ئاخ! خۆشەویستەکەم!»

ماریانکـا دارەکەی راوەشـاند و بە چـاوە جوانەکـانی لە هەردووکیـانی روانی.

ئـۆلێنین شـادی لە دڵـی گەرِا و کە هەسـتی کـرد کـچە چـاوی لێـدەکا. تفەنگەکەی لە شانی کرد و گوتی: «زووکە! زووا!»

لە دوایانەوە دەنگی ماریانکا دەهات کە دەیگوت: «وەحا، وەحا برِۆ!»

هەتا ئەو کاتەی لە نێو حەوشـە و کۆڵانە چۆڵەکانی ئاواییدا بوون و بە نێـو لەوەرِگەکـانی دێـبەردا تێـدەپەرِین، ئێرووشـکا هەروا قسـەی دەکـرد. ئەو نەیدەتوانی ملازم دووهەم لە بیر بەرێتەوە و لە پەستا جنێوی پێدەدا. ئۆلێنین لێی پرسی: «باشە تۆ بۆ ئاوا ملازم دووهەمت لە بەرچاو رەش بووە؟»

ـ سـەگبابی چکـووس! مـن حەز دەکەم کـوێر بـم و نەیبیـنم. نـازانم ئەو خـوێرِییە بـۆ ئـاوا دنیـای لە کـۆڵ گرتـووە؟ پێـی وایە دوو رۆژی دیکە لاقـی جووت کا پارەکەی لەگەڵ دەنێنە گۆرِەوە؟ ئەو هەموو ماڵ و سـامانە بـۆ کـێ

کۆ دەکاتەوە؟ تا ئێستا دوو خانووبەرەی دروست کردووە. لە ڕێگای دادگاوە باخێکیشی لە براکەی داگیر کردووە. هۆی ئەوەیە زۆر چاک دەزانێ کاغەزبازی بکا! لە هەموو شوێنێکی ئیستانیستاوە خەڵک دێن بۆ لای ئەو کاغەزیان بۆ بنووسێ؛ کاتێکیش بۆیان دەنووسێ ڕاست بەو شێوەیە کارەکە دەچێتە پێشێ کە ئەو نووسیویەتی. هێندە شارەزایانە و فێڵاوییانە کارەکان تێک هەڵدەکێشێ کە شەیتانیش سەری لێی دەرناچێ! بەڵام بۆ کێی کۆ دەکاتەوە؟ تەنیا کوڕێک و کچێکی هەیە و ئەگەر کچەکەی شوو بکات ئیتر کێی هەیە؟

ئۆلێنین گوتی: «دەی، دەبێ جیازی بۆ کچەکەی دابین بکات.»

- کوڕە جیازیی چی؟ چوونەتە خوازبێنیی کچەکەی، زۆر کچێکی جوان و شۆخوشەنگە. بەڵام ئەو پیسکەی گوونەکەرە بە شوێن مێردێکی ساماندااردا دەگەڕێ بۆ کچەکەی! دەیهەوێ مارەیی و شیربایییەکی زۆر بستێنێ. کوڕێک هەیە بە ناوی لووکاشکا، کە برازامە و ماڵەکەیان جیرانمانە، لاوێکی زۆر باش و بەجەرگە و چەند ڕۆژ لەمەوبەر پیاوێکی چێچێنی کوشت؛ ئەو کوڕە ماوەیەکی زۆرە دڵی بەو کچەوەیە و داوای دەکا، بەڵام چونکە کوڕەکە دەوڵەمەند نییە، ئەو بێ شەڕەفە ڕازی نابێ و هەر جارەی بیانوویەک دەدۆزێتەوە: جارێک دەڵێ کچە هێشتا منداڵە، جارێک بیانووی مارەیی و شیربایی زۆر دەگرێ. بەڵام من دەزانم مەبەستی لەو کارە چییە، دەیهەوێ لەبەری بپاڕێنەوە. ئەگەر بزانی ئەمڕۆ لە سەر ئەو کچە چ هەڵڵا و هەنگەمەیەک ساز بووبوو! بەم حاڵەشەوە دەیدەن بە لووکاشکا، چونکە لەم ئەمڕۆ بە دواوە لووکاشکا یەکەم کازاخی گوند و یەک جیگیتە؛ ئەو توانیویەتی ئەبرەکێک بکووژێ و نیشانەی خاچی پێدەدەن.

ئۆلێنین گوتی: «هەر بەڕاستی مەسەلە چییە؟ دوێنێ من لە حەوشەکە پیاسەم دەکرد دیتم کچی خاوەنماڵەکەمان کازاخێک ماچ دەکات کە نەمزانی کێیە.»

پیرەپیاو ڕاوەستا و دەنگی هەڵبڕی: «گاڵتە دەکەی؟»

- بڕوام پێ بکە بە چاوی خۆم دیتم.

ئیرووشکا تۆزێ مات بوو و گوتی: «کوڵکەی سەربەخوێن! باشە ئەو کازاخە کێ بوو؟»

- من تەنیا تارماییەکەییم دی.

- باشە، پێم بڵێ، گوڵنگەیەک بە سەر کڵاوەکەیەوە بوو؟ سپی بوو، ها؟

- ئەرێ!

- زیپوونێکی سووری لە بەردا بوو، قەڵافەتیشی هەر بە قەد خۆت نەبوو.

- نا، هێندێک کەڵەگەتتر بوو.

ئیرووشکا دای لە قاقای پێکنین و گوتی: «خۆیەتی، خۆیەتی، مارکی خۆمە. هەر ئەو لووکاشکایە وا بۆم باس کردی؛ من بە گاڵتە پێی دەڵێم مارک. ڕاست خۆیەتی. من زۆرم خۆش دەوێ! من خۆشم هەروا بووم، کەسەکەم. بۆچی ئەو شتەی خەڵکی پێتی دەڵێن، خۆم پێتی نەڵێم؟ منیش گراوێکم هەبوو کە لەگەڵ دایکی و خوشکێکی لە ماڵێکدا دەژیا. بەڵام ئەوە نەدەبووە هۆی ئەوەی نەتوانم بە دزییەوە بچمە ژوورێ، بە دیوارە بەرزەکەیدا هەڵدەگەڕام، دایکی کچەش لەو ژنە جادووباز و عەیارانە بوو کە هیچ کەس دەسکیان لە دوو ناکا. ژنە زۆری ڕق لێم بوو، دەیگوت خۆم شووی پێ بکەم ناهێڵم کچەکەم شووی پێ بکا! بەڵێ، منیش بۆ ژوانی خۆشەویستەکەم هەوڵم دەدا و لەگەڵ گیرچیکی هاوڕێم دەچووم. دەگەیشتمە بەر پەنجەرەکە و دەچوومە سەر شانی گیرچیک، بە هێواشی پەنجەرەکەم دەکردەوە و دەچوومە ژوورێ، کچە لەو ژوورە دەخەوت. جارێکیان کاتێک چوومە ژوورسەری و خەبەرم کردەوە، پڕ بە ژوورەکە قیژاندی! منی نەناسیەوە و پێی وابوو کەسێکی ترە. ئەی هاوار تۆ کێی؟ نەدەکرا وەڵامی بدەمەوە، دایکی دەجووڵایەوە. خێرا کڵاوەکەم لە سەر داگرت و نامە سەر دەمی. کچەش خێرا منی ناسییەوە، چونکە لە کونێکی کڵاوەکەوە منی دیبوو. تەنیا تۆزێ لە جێگای خۆی جووڵا و پاڵی بە دیوارەکەوە دا. - پاشان پیرەپیاو کە هەموو شتێکی بە شێوەی کردەوە دەدی، گوتی: هەڵبەت من

پێویستم بە هیچ شتێک نەبوو، بەڵام ئەو لەڕێوە چوو نقشک و نان و ترێی هێنا. خۆ هەر ئەوە نەبوو. نازانی چە کەیفێکی لە لا بوو. ژیان هەر ئەو سەردەمە بوو.»

ـ بۆ مامە! ئەی ئێستا؟

ــ جارێ با لە سەری نەڕۆین، وا چاکە بە دوای سەگەکەدا بڕۆین، بەشکوو قومرییەک یان سوێسکەیەک هەڵفڕێنێ، کە هەڵی فڕاند ئێمەش تەقەی لێ دەکەین.

ـ تۆ ماریانکات خۆش دەوێ کە ئاوا بە دوویدا هەڵدەهاتی؟

ــ چاو لەو سەگانە بکە! ـ پاشان پیرەپیاو لەگەڵ ئەوەی سەگە خۆشەویستەکەی واتە لیامی پیشان ئۆلێنین دەدا، گوتی: من عەسر ئەوەت پیشان دەدەم. ـ پاشان هەردووکیان بێدەنگ بوون.

کاتێک هەستیان کرد نزیکەی سەد هەنگاویان ڕێ بڕیوە، پیرەپیاو دیسان ڕاوەستا و ئەو لقەدارەی لە سەر ڕێگاکە کەوتبوو پیشان ئۆلێنینی دا و گوتی: «بە بڕوای تۆ، ئەمە چییە؟ ... تۆ پێت وایە ئەم لقەدارە لە خۆوە لەوێ کەوتووە؟ نا، وا نییە. ئەو لقە، یەکێک لە لقە هەرزەکانە.»

ـ چۆن، لقی هەرز؟ پاشان دەستی کرد بە پێکەنین.

ـ کەوایە تۆ هیچ نازانی. گوێ بگرە. کاتێک دەبینی لقەدارێک ئاوا لە سەر زەوی کەوتووە بە سەریدا تێ مەپەڕە! یان لێی لادە. یان لە سەر ڕێگاکە هەڵیگرە و فڕێی دە قەراغێک و بڵێ: «سپاس بۆ باوک و کوڕ و ڕۆحی پیرۆز!» پاشان بە دڵنیایی درێژە بە ڕێگای خۆت بدە. ئیتر ئەو لقە هەرزە زەرەرت پێ ناگەیێنێ. من ئەو شتانە لە قەدیمییەکان فێر بووم.

ئۆلێنین گوتی: «ئەم شتانە زۆر قۆڕ و گەوجانەن! باسی ماریانکام بۆ بکە. دەی دەتگوت لەگەڵ لووکاشکا دڵیان بە یەکەوەیە؟»

ئیرووشکا بە دەنگێکی کز و سرتەئاسایی، قسەکەی بە ئۆلێنین بڕی و گوتی: «وست! ئێستا کاتی قسە کردن نییە! تەنیا گوێت شل کە، ئێستا لەوانەیە بە سەر لقەدارەکەدا بڕۆین.»

پیرەپیاو بە بێدەنگی دەڕۆیشتە پێشێ و دیسان لە ڕێگایەکی فەرعی کە دەچوو بۆ نێو لێڕەوارە چڕوپڕەکە تێپەڕی. چەند جار لەگەڵ ئەوەی نێوچاوانی تێک نابوو، گەڕایەوە دواوە تاکوو چاو لە ئۆلێنین بکات، چونکە ئۆلێنین بە جزمە قورسەکانییەوە کاتی بەڕێدا ڕۆیشتن تەپوکوتێکی زۆری دەکرد و تفەنگەکەی زۆر کەمتەرخەمانە بە دەستەوە گرتبوو. زۆر جار لە لقەداری سەر ڕێگاکەی دەگیراند. ئیرووشکا بە لەبزێکی توند و تووڕەوە گوتی: «هێواش، خشەخش و تەپەتەپ مەکە، سەرباز!»

بە هەڵمژینی هەوادا دیار بوو خۆر هەڵاتووە. تەمومژ دەڕەوییەوە، بەڵام هێشتا سەر لێڕەوارەکەی داگرتبوو. دارستانەکە بە شێوەیەکی ترسناک بەرز و هەڵدێر دەهاتە بەرچاو. لەگەڵ هەڵێنانەوەی هەر هەنگاوێک دیمەنەکە دەگۆڕا. ئەوەی وەک دارێکی بەرز دەهاتە بەرچاو، تەنیا دەوەنێکی کوڵەبنە بوو؛ هەموو قامیش و ڕمووسکێک لە بەرچاویان وەک دارێکی بەرز خۆیان دەنواند.

# نۆزده

بەشێکی تەمومژەکە بەرز بووبۆوە و سەر چڵووکی دار و قامیشەکانی داپۆشیبوو، بەشەکەی دیکەشی بووبوو بە ئاونگ و ڕێگاکە و گیاوگژی دەوری پەرژینەکانی خووساندبوو. لە دووکەڵکێشی هەموو ماڵانەوە دووکەڵ لارەکە و پێچەکەی بوو و بەرەو ئاسمان هەڵدەچوو. خەڵکی لە گوند هاتبوونە دەرێ و تاقمێک دەچوون بۆ سەر کار و دەستەیەک بۆ لای ڕووبارەکە و تاقمێکی دیکەش بەرەو پاسگا ملی ڕێیان گرتبوو. ڕاوچییەکان شان بە شانی یەک بە سەر ڕێگا تەڕ و پڕ لە گیاوگژەکەدا هەنگاویان دەنا. سەگەکان کلکیان ڕادەوەشاند و بۆ لای خاوەنەکانیان دەگەڕانەوە و بە دەوریاندا هەڵدەسووڕان. هەزاران مێشووله بە حەواوە خولیان دەخوارد و بە سەر سەری ڕاوچییەکانەوە دەفڕین و لە سەر پشت و دەست و دەموچاویان دەنیشتنەوە. بۆنی سەوزەڵانی و فێنکی و تازەیی هەست پێدەکرا. ئۆلێنین لە پەستا ئاوڕی دەدایەوە تاکوو ئەو عارەبانەیە ببینێ کە ماریانکا سواری بووبوو بە دارەدەستەکەی گایەکانی لێ دەخوڕی. هەموو شتێک ئارام بوو. ئەو دەنگانەی لە گوندەکەوە هەڵدەستان ئیتر نەدەگەیشتنە لای ڕاوچییەکان. سەگەکان لق و پەلی دار هەڵووچەکانیان پێکدا دەدا و خشەخشیان ساز دەکرد. هێندێ جار باڵندەکان دەیانخوێند. ئۆلێنین دەیزانی کە لە دارستانەکەدا مەترسی هەیە و لەو شوێنانە هەمیشە تاقمێک ئەبرەک لە بۆسەدان. ئەویش دەیزانی کە لە نێو لێڕەواردا تفەنگ بۆ کەسێکی ڕێبوار باشترین کەرەسەی بەرگری کردنە لە خۆی. نەک ئەوەی بترسێ بەڵام دەیزانی ئەگەر کەسێکی تر بە جێی ئەو بوایە دەترسا. لەگەڵ ئەوەی بە وردی چاوی لە دارستانە چڕ و شێدار و تاریکەکە دەکرد، گوێی بۆ هەموو ورتە و خشپەیەک شل کردبوو، تفەنگەکەی بە خۆیەوە دەگوشی و حاڵەتێکی

خۆش و نوێی لە ناخی خۆیدا هەست پێدەکرد. مامە ئیرووشکا لە پێشەوە دەڕۆیشت. لە هەموو شوێنە قوڕ و باتڵاخەکان کە جێگاپێی ئاژەڵە دووسمەکان دەهاتە بەرچاو، ڕادەوەستا و لەگەڵ ئەوەی بە وردی تاقیی دەکردنەوە، پیشیان ئۆلێنینی دەدان. بەڵام هێندێ جار بە دەنگێکی زۆر هێواش ئاماژەی بە ئۆلێنین دەکرد. ئەو ڕێگایەی ئەوان پێیدا دەڕۆیشتن، شوێنی تایەی عارەبانەیەک دەکەوتە بەرچاو کە ماوەیەک بەر لەوان لەوێوە تێپەڕیبوو. لە هەردوو بەری ڕێگاکە داری قەرەقاچ[43] و سپیدار سەریان لێک دابوو و هێندە چڕوپڕ بوون کە لە هیچ کوێوە ئاسمان بە دەرەوە نەبوو. هەموو دارەکان لە تەختی عەرزییەوە هەتا سەرێ تەرزوتوولی ڕەزیان تێ هاڵابوو. لە لای خوارەوەی ڕێگاکە، بنجە چاڵوکی ڕەش و ئەستوور ڕوابوون، ئەو شوێنانەی داری لێ نەبوو، بە دڕکوداڵ و قەرسیل و قامیشی خۆڵەمێشین داپۆشرابوو لەگەڵ شنینەوەی با کەروێشکەیان دەکرد. لە هێندێ شوێن، تووڵەڕێی چکۆلە وەبەرچاو دەهات کە لە ڕێگاکە جیا دەبوونەوە. ئەو ڕێگایانە، هێندێکیان کە پانتر بوون، جێگاپێی نێچیری گەورە و هێندێکی تریان چکۆلە و شێوە تونێل بوون. جێگاپێی سوێسکە و قومریش زۆر بوون و هەموویان بەرەو شوێنە چڕەکانی دارستان دەڕۆیشتن. زۆر و زەوەندیی گژوگیا لەو دارستانەدا کە هیچ ئاژەڵێک دەمی پێی نەگەیشتبوو، جار لەگەڵ جار زیاتر ئۆلێنینی تووشی سەرسووڕمان دەکرد. ئەو تا ئێستا چاوی بە دارستانی لەو شێوەیە نەکەوتبوو. لێڕەوار و مەترسی و ئەم پیرەپیاوە و سرتەسرتە سەیروسەمەرەکانی ماریانکا و بەژنولاَبای پیاوانە و لەباری ئەو و شاخ و کێو، هەموو ئەوانە وەکوو خەونێک دەهاتنە بەرچاوی ئۆلێنین.

پیرەپیاو ئاوڕی دایەوە و لەگەڵ ئەوەی کڵاوەکەی بۆ نێوچاوانی دادەکێشا گوتی: «قومرییەک لە سەر ئەو دارە نیشتۆتەوە! قسە مەکە، ئەوە قومرییەک. پاشان بە ڕقەوە چاوێکی لە ئۆلێنین کرد و لە سەر دەست و پێ و بە ماتەماتە چووە پێشێ و گوتی: «ئەوان حەز بە دەنگی مرۆڤ ناکەن.»

---

٤٣ قەرەقاچ: جۆرێک داری نارەوەن. لە دەقی سەرەکیشدا هەر ئەوەیە.

ئۆلێنین هێشتا لە دواوە بوو کە پیرەپیاو ڕاوەستا و چاوی لە درەختێک کرد. قومرییەکە لە سەر دارەکەوە بەرەوڕووی سەگەکەیان چریکاندی و ئۆلێنین چاوی پێی کەوت. بەڵام هەر لەو کاتەدا، تەقەی تفەنگی مامە ئیرووشکا وەک تەقینەوەی تۆپێک لە نێو دارستانەکەدا دەنگی دایەوە. باڵندەکە باڵی کردەوە، چەند جار باڵی لێدا و کەوتە خوارێ. ئۆلێنین لەگەڵ ئەوەی دەچوو بۆ لای پیرەپیاو، قومرییەکی دیکەی هەڵفڕاند، تفەنگەی بە دەستەوە گرت، سێرەی گرت و قامکی بە پەلەپیتکەدا نا. قومرییەکە خولێکی لێدا و بەرەو سەرەوە فڕی، پاشان وەک بەردێک لەگەڵ ئەوەی باڵەکانی پێکەوە نووساندبوو، لە نێو دارستانە چڕەکەدا کەوتە خوارێ. ئیرووشکا کە تیرەندازی لە کاتی فڕینیدا نەدەزانی، پێکەنی و دەنگی هەڵبڕی: «بژیی!»

هەردوو قومرییەکەیان هەڵگرتەوە و درێژەیان بە ڕێگاکەیان دا. ئۆلێنین کە بە هۆی ئەو کارەی پیرەپیاوەوە هەستی جووڵابوو، بەردەوام قسەی دەکرد، بەڵام پیرەپیاو قسەکەی پێ بڕی و گوتی: «ڕاوەستە! لێرەوە وەرە! دوێنێ من لێرە چاوم بە جێگاپێی مەڕەکێوی کەوت.» ئیرووشکا و ئۆلێنین چوونە نێو شوێنێکی چڕوپڕی دارستانەکەوە و دوای بڕینی نزیکەی سێسەد هەنگاو کەوتن بە سەر جێگایەکی بێ دارودرەختدا کە تەواوی بە قامیش داپۆشرابوو و هێندێ شوێنیشی ئاوی تێدا ڕاوەستابوو. ئۆلێنین هەروا بە دوای پیرەڕاوچیدا دەهات و مامە ئیرووشکاش نزیکەی بیست هەنگاو لە پێش ئەوەوە دانەویبۆوە و بە دەست و سەر ئاماژەی بە ئەو دەکرد. ئۆلێنین گەیشتە پەنای و چاوی لەو جێگاپێی مرۆڤە کرد کە مامە ئیرووشکا پیشانی دەدا.

- دیتووتە!

ئۆلێنین کە هەوڵی دەدا هەتا ئەو جێیەی بۆی دەکرێ بە هێواشی قسە بکات، گوتی: «دەی باشە، دیتوومە، ئەوە چییە؟ جێ پێی مرۆڤە.»

ئۆلێنین سەرەڕای خۆی، بۆ ساتێک کەوتەوە بیری چیرۆکی پاتفینـدێر بەرهەمی گووپێر[٤٤] و ئەبرەکەکان لە خەیاڵیدا سەریان هەڵدا. بەڵام ڕازێکی لە هەڵسوکەوتی پیرەپیاودا دەدی کە نەیدەوێرا پرسیارێ لێ بکات و لە خۆی دەپرسی ئەم ڕازە ترس وەدیی هێناوە یان ڕاو کردن؟ پیرەپیاو بە سادەیی وەڵامی دایەوە: «نا، ئەمە جێگاپێی خۆمە.» پاشان ئەو گیایەی نیشان دا کە لە ژێریدا جێگاپێی ئاژەڵێک بە حاڵ دیار بوو.

پیرەپیاو درێژەی بە ڕێگاکەی خۆی دا. ئۆلێنین ئیتر وەدا نەدەکەوت. دوای ئەوەی نزیکەی بیست هەنگاو بە سەرەولێژیدا داگەڕان، لە نزیک دار هەرمێیەکی گەورە، گەیشتنە شوێنی چڕوپڕی لێڕەوار کە خاکی ژێر دارەکان مەیلەوڕەش بوون و شیاکەی حەیوان بەرچاو دەکەوت کە دیار بوو تازە کردوویەتی. ئەو شوێنە پڕ دار و ڕەزە، لە کەپرێکی خۆش و فێنک دەچوو. پیرەپیاو هەناسەیەکی هەڵکێشا و گوتی: «ئەم بەیانییە لێرە بووە؛ لانەکەی هێشتا گەرمە و بە ئارەقەی جەستەی شێدارە.»

لە ناکاو بیست هەنگاو لەولای ئەوانەوە لە نێو دارەکاندا خشەخشێکی توند پەیدا بوو. هەردووکیان ڕاپەڕین و تفەنگەکانیان بە دەستەوە گرت. بەڵام هیچیان نەدی. تەنیا خشپە و قرچەی شکانی پەلی دارەکان بەرگوێ دەکەوت. دوای تاوێک تەپوکوتی غاردانێکی ڕێکوپێک هات و پاشان دەنگی خشەخشەکە بوو بە ڕمبەڕمبێک کە جار لەگەڵ جار دوور دەکەوتەوە، دوای چەند ساتێک تەپوکوت و ڕمبوهۆڕ تەواوی لێڕەوارەکەی داگرت. ئۆلێنین خەریک بوو دڵی داکەوێ. لەخۆڕایی سەری بە کەلێنوکولێنی دارەکاندا دەکرد و هەرچۆنێک بوو سەرنجی لە سەر پیرەپیاو گیرسایەوە. مامە ئیرووشکا تفەنگەکەی بە سینگی خۆیەوە نووساندبوو و لە جێی خۆی نەدەبزووت. کڵاوەکەی هەتا سەر لووتی داکێشابوو، بریقەیەکی سەیر لە چاویدا

---

٤٤ کووپێر Cooper ڕۆماننووسی ئەمریکایی، (١٧٨٩-١٨٥١) نووسەری چیرۆکی ڕووداو و کارەسات سەبارەت بە سوورپێستەکانی ئەمریکایە. چیرۆکی پات فیندێر یەکێک لە بەرهەمەکانی ئەوە.

دەدرەوشـایەوە و دەمـی داچەقانـدبوو، ددانە زەرد و بـێ پووکەکـانی وەک شووڵ چەپەر وەدیار کەوتبوون و دەتگوت لە جێی خۆی وشک بووە. دوای چەند ساتێک گوتی: «کەڵەکێوی!» هیوابڕاوانە تفەنگەکەی فڕێدا. دەستێکی بە ڕیشـیدا هێنـا و پاشـان گـوتی: «لەو نێـوەدا خـۆی حەشـار دابـوو! دەبـوو لەو ڕێگا فەرعییەوە بهاتبایەین! بێ شعوور! بێ شعوور!» تـووڕە و ئـاڵەتی لەگەڵ ئەوەی بە تونـدی ڕیشـی خـۆی گرتبـوو دەیکێشـا و خەریـک بـوو هەڵیکەنـێ، دووپاتی کردەوە: «بێ شعوور! بەراز!»

لە لای سـەرووی دارسـتانەکە، لە نێـو تەمـومژدا، فـڕەی بـاڵی باڵنـدەیەک هات. ڕمبەی پێی کەڵەکێوی هەروا لە نێو دارستانەکەوە بەرگوێ دەکەوت...

شـەو بە سـەردا هـاتبوو کە ئۆلێنین لەگەڵ پیرەپیـاو ماندوو و شـەکەت و برسی گەیشتەوە مـاڵێ. شـێو ئامـادە بـوو. نانیـان خـوارد و پاشـان شـەڕابیان خواردەوە، شەڕابەکە وزە و شادییەکی تـایبەتی پـێ بەخشـی. پاشـان ئۆلێنین لە ژوورەکە چـووە دەرێ و لە سـەر قاڵـدرمەکان دانیشـت. شـاخی بەری ڕۆژاوا لە ژێر تیریژی ئێوارەدا دەدرەوشایەوە. پیرەپیاو دیسان دەستی کرد بە گێڕانەوەی حەقایەتی ڕاو و ئەبرەکەکان و گراوەکانی، باسی ژیانی پڕ لە ئـازایەتی و دوور لە خەم و خەفەتـی خـۆی دەکـرد. دیسـان ماریانکـای شۆخوشـەنگ دەهـاتە ژوورێ و دەچـووەوە دەرێ و بە نێـو حەوشـەکەدا هـاتوچۆی دەکرد. کراسـەکەی و لەشـولاری کچـانە و توندوتۆڵی ئەو شـۆخە دڵڕفێنە سەرنجی ڕاکێشابوو.

# بیست

ڕۆژی دوایی ئۆلێنین بە تەنیا، ڕۆیشت بۆ ئەو شوێنەی کەڵەکێوییەکەیان لـێ هەسـتاندبوو. بەجێـی ئەوەی لە دەرگـا گەورەکەوە بـڕواتە دەرێ، وەک کەسانی دیکەی ماڵێ بە سەر تەیمانەکەدا بازی دا ئەودیو. هێشتا هەموو ئەو دڕوودالەی لە چەرکساکەی نەکردبۆوە کە تێی هەڵچەقیبوون. سەگەکەی کە لە پێشـــەوە دەڕۆیشـــت، دوو قـــومریی هەڵفڕانـــد. کە گەیشـــتە لای دار هەڵووژەکان، هەر هەنگاوێکی هەڵدێنایەوە چەند قومریی هەڵدەفڕاند. (پیرەپیاو ڕۆژی ڕابردوو، ئەو شوێنەی پێ نیشان نەدابوو، (چونکە ئەو شوێنەی بۆ داونـــانەوە دانـــابوو.) ئـۆلێنین بە دوازدە تیـر پێـنج قـومریی کوشـت. بـۆ دۆزینەوەشیان لە نێو بنچک و دەوەنەکان زۆری زەحمەت کێشا و ئارەقەی ڕەش و شینی دەردابوو. پاشان سەگەکەی بانگ کرد. تفەنگەکەی زامن کـردەوە، گوللەکـانی خسـتەوە جێـی خـۆی و لەگەڵ ئەوەی بە سـەرقۆڵی کراسـەکەی مێشـوولەی لە خـۆی دەردەکـرد، بە هێواشـی بەرەو شـوێنەکەی ڕۆژی ڕابـردوو ملـی ڕێـی گـرت. سـەگەکەی کە بە ملۆمـۆ کـردن تەنـانەت سـەری بە هەموو چاڵوچۆڵ و قونجڕکێکدا دەکرد، نەیدەتوانی بەرگریی لێ بکات. ئۆلێنین دیسان دوو قومریی کوشت. ئەم کارەشی زۆر بەپەلە ئەنجام دا بەڵام سـەرەڕای ئەوەش، نزیـک نیـوەڕۆ گەیشـتنە ئەو شـوێنەی کە بـۆی دەگەڕا.

هەواکەی زۆر گەرم و ڕوونـاک و سـریوەی بـا نەدەهـات. تەنـانەت لە نێو دارستانەکەشدا فێنکایی بەرەبەیان لە نێو چووبوو هەزاران مێشـوولە لە دەوری ســـەری دەخـــولانەوە و لە دەســـت و دەموچـــاوی دەنیشـــتن. سەگەکەی کە ڕەنگی خۆی ڕەش بوو، بووبوە خۆڵەمێشین؛ هێندەی مێشوولە لێ نیشتبوو. چەرکساکەی ئۆلێنین کە مێشوولەکانی دابوویانە بەر درەوشـەی

چزوویان، بووبووه ئەو ڕەنگە. ئۆلێنین لە هەڵاتن بوو. ئەو پێی وابوو هاوینی گوندی بۆ تامڵ ناکرێت و ناتوانێ تاقەت بێنێ. پاشان بەرەو ماڵێ وەڕێ کەوت؛ بەڵام بە خۆی دەگوت من چیم لەو خەڵکە زیاترە، ئەوان سەرەڕای کۆڵەکۆڵی گەرما و ئارەق ڕشتن لە گوند دەمێننەوە. هەربۆیە لە دڵەوە بڕیاری دا لە گوند بمێنێتەوە. بە دەم ڕێوە دەستی کرد بە کوشتنی مێشوولە و شتێکیش سەیر بوو نزیک نیوەڕۆ ئەم بارودۆخە بە لایەوە خۆش و دڵگری دەنواند. ئەو لە دڵەوە پێی وا بوو ئەو سروشت و لێڕەوارە بەبێ مێش و مێشوولە کە لە هەموو لایەکەوە گەمارۆیان دابوو و ناچار بوو بە لەپی دەستی لە ڕوومەتە ئارەقاوییەکەی خۆی بدا و لە ژێر دەستیدا پانیان بکاتەوە، خۆشی و ڕەنگ و بۆنی خۆی لە دەست دەدا. ئەم پوورەی مێشوولانە و ئەم هەموو گیاوگژەی چڕوپڕ سەریان لێکدابوو و بە شێوەیەکی ترسناک هەڵچووبوون، لەگەڵ ئەو هەموو ئاژەڵ و پەلەوەرانەی کە لە نێو دارستانەکەدا بوون و ئەو سەوزەڵانییە تۆخە و هەوا گەرمەکەی کە هەتا مۆخی یەسقانی گەرم دادێنا، ئەو هەموو گۆلاوە پڕ قوڕ و قەوزە و لیتەیەی لە تەرەک جیا بووبوونەوە و لە ژێر لق و گەڵای داچۆڕاوی دارەکاند دەترووسکانەوە، هەموویان هێندە لێک دەکاڵانەوە کە ئۆلێنین بۆ ساتێک ئەو شتەی ترسناک و جاڕزکەر و تاقەتپڕووکێن هاتبووە بەرچاوی، هەستێکی خۆش و شادیهێنەری پێ بەخشی.

دوای ئەوەی لە دەوروبەری ئەو شوێنەی کە ڕۆژی ڕابردوو کەڵەکێوییەکەیان دیبوو، هێندێک چاوی گێڕا بەڵام هیچی بەرچاو نەکەوت، ویستی تاوێک پشوو بدات. خۆر ڕاست لە سەر لێڕەوارەکە بوو، تیرێژی بەتینی هەموو جارێک کە ئۆلێنین دەچووە شوێنێکی بێ دار و درەخت یان دەچووە سەر ڕێگاکە، قرچە و کۆڵەکۆڵی لەوانە بوو بیسووتێنێ. هەروەها قورسایی حەوت کۆتر کە کوشتبووی و دابووی بە کۆڵیدا ئەوەندەی دیکە گوشاری بۆ هێنابوو و هەستی بە ژانێک دەکرد لە سینگی خۆیدا.

ئۆلێنین جێگای پێی دوێنێی کەڵەکێوییەکەی دۆزییەوە و خۆی کرد بە ژێر کەندەڵانی بن دەوەنێکی تیکاندا کە دوێنێ عەسر کەڵەکێوییەکە لەوێدا خۆی حەشار دابوو. لە بەر لانی کەڵەکێوییەکەدا ڕاوەستا و لە دەوروبەری خۆی سەوزەڵانییەکی تۆخ و پڕ لە دەوەن و چاڵووکی دی و چاوی لە لانی بە ئارەقە شێداری ئاژەڵەکە کرد، شیاکەی ڕۆژی ڕابردوو و جێ سم و چۆکی کە لە سەر قوڕە ڕەشەکە بەجێمابوو، هەروەها جێگاپێی دوێنێی خۆشی ناسییەوە و چاوی پێدا گێڕان. لەو حاڵەدا خۆی زۆر ئاسوودە و بێ خەم و گەشاوە هەست پێکرد. بیری لە هیچ شتێک نەدەکردەوە و هیچ ئارەزوویەکی نەبوو. لە ناکاو هەستێکی هێندە سەیر و پڕ لە بەختەوەرییەکی بێ هۆ و ئەوینێکی بەتینی لە ناخی خۆیدا هەست پێکرد کە بە پێی خووخدەی سەردەمی منداڵی، خاچی خۆی کێشا و شوکری خودای کرد. بێ ئیختیار و بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا ئەم خەیاڵە بە مێشکیدا هات: «ئەوە منم، من دیمیتری ئۆلێنین، بوونەوەرێک کە تا ئەو ڕادەیە جیاوازترە لە خەڵک و بە تەنیا لە شوێنێک دانیشتووە، کە کەڵەکێوییەک، کەڵەکێوییەکی جوان کە ڕەنگە تا ئێستا مرۆڤی بە چاوی خۆی نەدیتبێ، لە شوێنێک کە هەرگیز مرۆڤێک لێی دانەنیشتووە و بیر و خەیاڵێکی ئاوای لە مێشکدا نەبووە. من لێرە دانیشتووم و لە دەوروبەرم خەڵف و پیرەدار هەڵچوون. یەکێک لەوان تەرزوتوولی مێو سەرتاپای داپۆشیوە؛ لە دەوروبەرم کۆترەکان دەفڕن و دەنیشنە؛ بە دەندووک لە یەکتری دەدەن و ڕەنگە هاتبێتن بۆن بە خوشک و برا کوژراوەکانیانەوە بکەن.» ئۆلێنین دەستێکی بە کۆترەکانی خۆیدا هێنا و دەستە خوێناوییەکەی بە ئاتەگی چەرکساکەی سڕی. «چەقەڵەکانیش ڕەنگە بۆن بە خوێنەوە بکەن و بە خاڵێکی پەرۆش و ناڕازییەوە دەست لەو ڕێگایە بەردەن، مێشوولە لە ژوورسەرم و بە نێو پەل و گەڵای دارەکاندا دەفڕن و گەڵاکان لە بەرچاویان وەک دورگەیەکی بێوێنە خۆ دەنوێنێ و ویزەویزیان دێ: یەکێک، دوو، سێ، چوار، سەد هەزار، یەک میلیۆن مێشوولە، هەموویان بە دەوری سەرمدا دەسووڕێنەوە و نازانم بۆ ویزەویز دەکەن و هەرکام

لەوان خـۆی دیمیتـری ئـۆلێنینێکە کە وەک مـن لە زۆر لە کەسـانی دیـکە جیـاوازترە.» ئەو لە دڵـی خۆیـدا فکـر و خەیـاڵی مێشـوولەکان و ئەو شـتەی ویزەویزی بۆ دەکەن، بە ڕوونی دەیهێنایە بەرچاوی خۆی. مانـای ویزەویزی ئەوان ئەمەیە: «هاوڕێیان وەرن بـۆ ئێرە، وەرن بـۆ ئێرە! کەسـێک لێرەیە کە دەتوانین بیخۆین!» پاشان پێوەی دەنیشن و چزووی تیژیان بـۆ خـوێن مـژین وەکـار دەخەن. ئـۆلێنین هەروەهـا بیـری کـردەوە: «مـن کەسـێکی خـانەدانی ڕووس، ئەنـدامی کۆمەڵگـای بـاڵای مۆسـکۆ، دۆسـت و خزمـی فـڵان و فیسـارەکەس نـیم، بەڵکـوو زۆر ئاسـایی، مێشـوولەیەک، کۆترێـک یـان کەڵەکێوییەکم، ڕاست وەکوو ئەو ئاژەڵ و پەڕۆکانەی لە دەوروبەرم دەژین. وەک ئەو بوونەوەرانە، وەک مـامە ئێرووشـکا، هەمووومـان مـاوەیەک لە سـەر ئەم زەوییە دەژین و پاشـان دەمرین.» پیرەپیـاو ڕاسـت دەکـا: «گیـا لە سـەر گۆڕەکەمان شین دەبێ و تەواو، هەموو شتێک دەبڕێتەوە.»

ئۆلێنین بیری کردەوە: «دەی باشـە، گیـاوگژ شـین دەبێ، بەڵام دواتـر چـی ڕوودەدا؟ سەرەڕای هەموو ئەوانە دەبێ بژیین، دەبێ بەختەوەر بین؛ چونکە من تەنیا ئاواتێکم هەیە، ئەویش بەختەوەرییە. چ گرنگییەکی هەیە کە من چ جـۆرە بـوونەوەرێکم! ئاژەڵێـک کە وەکـوو ئەوانـی دیـکە گیـاوگژ لە سـەر گـۆڕەکەی دەڕوێ و ئیتـر هـیچ شـتێکی دیـکە بـوونی نیـیە!؟ یـان ڕەنـگە چوارچێوەیەک بین کە لە نێویدا بەشێک لە یەزدانی نادیار تێیدا جێگیر بووە؛ سـەرەڕای ئەوەش دەبـێ بە باشـترین شـێوەی گونجـاو بـژیین. بەڵام بـۆ بەخـتەوەر بـوون، دەبـێ چـۆن بـژیین و مـن تـا ئێسـتا بـۆچی بەخـتەوەر نەبـووم؟» ژیـانی ڕابـردووی خـۆی وەبیـر هـاتەوە و ڕقـی لە خـۆی هەسـتا. خۆی وەک مرۆڤێکی خۆپەرەست و پڕفیز و هەوا هاتە بەرچاو، لە حاڵێکدا لە شـتەکان ورد بـووەوە: سـەوزایی گەش و پـاراو، هەتـاو کە بەرەو ڕۆژاوا دەڕۆیشت، ئاسمانی ساو، چاوی بە هەمـوو ئەوانەدا دەگێڕا و خـۆی وەکوو ڕابردوو شاد و دڵخۆش دەدی. «بۆچی من بەختەوەرم؟ بۆ تا ئێستا ژیاوم؟ چەندە پڕ دیعایە و لووتبەرز بووم؛ ئەو هەمـوو چاوەڕوانییە بێ جێیە و ئەو

هەموو لەخۆڕازی بوونە جگە لە شەرمەزاری و خەفەت هیچ شتێکی بۆ من پێوە نەبووە، ئەوا ئێستا بە چاوی خۆم دەیبینم! بۆ بەختەوەر بوون پێویستیم بە هیچ شتێک نییە!» لە ناکاو دنیایەکی نوێ لە بەرچاویدا خۆی نواند و بە خۆی گوت: «بەختەوەری، بەرەوڕووی خۆمە، بەختەوەری یانی ژیان بۆ خەڵکی. ئەم بابەتە ڕوون و ئاشکرایە. مگێزێک بە مرۆڤ بەخشراوە کە هانی دەدا بگەڕێ و شتە ون بووەکانی جیهان بدۆزێتەوە، کەوایە ئەم مگێزە شتێکی ڕەوایە. کاتێک بمانهەوێ ئەو ئیشتیا و مگێزە لە ڕێگای خۆپەرەستی و دەمارزلییەوە پەرە پێ بدەین، یانی ماڵ و سامان، شانازی، دابین بوونی مەعیشەت و عەشقمان تەنیا بۆ خۆمان بوێ، لەوانەیە بارودۆخەکە جۆرێگ بێ کە ئەوەی دڵمان دەیخوازێ پێی نەگەین. کەوایە دەبێ بزانین ئەو خواستانە شتێکی ناڕەوان، نەک مگێز و ئارەزووی بەختەوەرییەک کە هەمیشە، سەرەڕای بارودۆخی دەرەکی، دەتوانین بە دەستی بێنین؛ کەوایە ئەو ویست و ئاواتانە چین و کامانەن؟ کامەنەن؟ دیارە هەست و لێک هەڵوەشاندنەوەی ئەشق و هۆگری!»

ئۆلێنین لەوەی کە حەقیقەتێکی نوێی دۆزیبۆوە، خۆشییەک باوەشی لە ڕۆحی وەرهێنا و وەهای شوێن لەسەر دانا کە بێ ئیختیار لە جێی خۆی ڕاپەڕی و بێ سەبرانە لە خۆی پرسی کە دەتوانێ بە زووترین کات خۆی بۆ کێ بەخت بکات؟ چاکە لەگەڵ کێدا بکات و کێی خوش بوێ؟ هەروا لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە: «بەڕاستی من پێویستیم بە هیچ شتێک نییە، ئیتر بۆ ژیانی خۆم بۆ خەڵکی تەرخان نەکەم؟» تفەنگەکەی کە لە سەر زەوی دابنابوو هەڵیگرت و بە مەبەستی گەڕانەوەی خێرا بۆ ماڵێ و تاقی کردنەوەی هەموو ئەو بۆچوونانە و بارودۆخێک کە بتوانێ بە شێوەیەکی چاکەکارانە قۆڵی لێ هەڵماڵێ، بەپەلە بە نێو دار و دەوەنە چڕوپڕەکاندا تێپەڕی و لە دارستانەکە چووە دەرێ. هەرکە پێی نایە شوێنی ڕووتەن و بێ دار و درەخت، ئاوڕی دایەوە؛ هەتاو لەو کاتەدا لە پشت چڵەپۆپەی دارەکانەوە خۆی حەشار دابوو و هەواکەی بەرەو فێنکایی دەچوو. ئەو شوێنە بە

تەواوی لە بەرچاوی نامۆی دەنواند و بە هیچ شێوەیەک لەو دارستانە نەدەچوو کە دەوری گوندەکەی گەمارۆ دابوو. هەموو شتێک لە ناکاو گۆڕانی بە سەردا هاتبوو. ڕووکاری دارستان و زەمەن هەردووکیان گۆڕابوون. هەموو شتێک ئالوگۆڕی بە سەردا هاتبوو؛ هەور ئاسمانی داپۆشیبوو، شنەی با لق و پەلی دارەکانی دەشەکاندەوە و هاژەی دەهات. لە دەوروبەری جگە لە قامیشەڵان و لک و پەلی داری وشکەڵ هیچ شتێکی تر وەبەرچاو نەدەکەوت. بانگی سەگەکەی کرد کە بە دوای حەیوانێکدا ملۆمۆی دەکرد و دوور کەوتبۆوە، زایەڵەی دەنگی خۆی لەوبەری دارستانەکەوە وەڵامی دایەوە.

لە ناکاو دڵەخورپەیەکی ترسناک دایگرت. ترسێکی بەهێز شکایە گیانی. ئەبرەکەکان و پیاوکوژییەکانیان بیستبوو، گوێ قوڵاغ ڕاوەستابوو و چاوەڕێ بوو لە بن هەموو بنچک و دەوەنێک چێچێنێک دەرپەڕێت و ئەو ناچار بێ یان بەرگری لە گیانی خۆی بکات و بمرێ، یان بێ ورە و زراوتۆقیو تێی تەقێنێ. بیری لە خودا و ژیانی داهاتووشی کردەوە، بەڵام قەت لەو بارەوە ئاوای بیر نەکردبۆوە و دەوروبەری هەروا سروشتێکی وەحشی و جیددی و تاریک بوو. بیری کردەوە: «یانی ئەو بایەخەی هەیە کە پیاو بۆخۆی بژی و لەگەڵ ئەوەشدا چاوەڕوان بکرێت سات لە دوای سات مەرگ هەڵکوتێتە سەری؟ مردنێک کە مرۆڤ هیچ کارێکی باشی نەکردبێ، و بێ ئەوەی هیچ کەس ئاگادار بێ! پاشان بەرەو لایەک ملی ڕێی گرت کە پێی وا بوو بەرەو گوند دەچێ. ئیتر باسی ڕاو لە گۆڕێدا نەبوو. تەنیا هەستی بە ماندوو بوونێکی لەشپڕووکێن دەکرد و بە وردی و تۆقیوانە چاوی لە هەموو سووچ و قوژبن و دار و دەوەنەکان دەکرد، سات بە سات چاوەڕوان بوو ماڵئاوایی لە ژیان بکات. دوای ئەوەی ماوەیەک بە دەوری خۆیدا سووڕایەوە، گەیشتە لای چۆمەڵێک کە ئاوەکەی دەڕژایە نێو ڕووباری لیڵی تەرەکەوە، لەبەر ئەوەی ئیتر ڕێی لێ نەشێوێ، بڕیاری دا بە کەناری چۆمەکەدا بڕوات. هەروا هەنگاوی دەنا، بەبێ ئەوەی بزانێ ئەم ڕووبارە بەرەو کوێ دەڕوات.

لە ناکاو لە پشت سەریەوە خشەخشێک لە نێو قامیشەڵانەکەوە هەستا. ئۆلێنین گورج ڕاسایەوە و تفەنگەکەی بە دەستەوە گرت. لە خۆی تریق بۆوە کە دیتی سەگەکەی ماندوو و شەکەت بە هاسکەهاسک خۆی کرد بە نێو قامیشەکاندا و زمانی لە ئاوی فێنکی ڕووبارەکە دەدا و دەیچڵەپاند. ئۆلێنین لەگەڵ سەگەکەی ئاوی خواردەوە و بە ڕێگایەکدا کە سەگەکەی کەوتبووە پێشی وەڕێ کەوت. چونکە پێی وا بوو سەگەکەی بە بۆن کردن بەرەو گوندەکە دەڕوات. لەگەڵ ئەوەی بەشدارەکەی بووبووە ڕێنوێنی، سات لە دوای سات دەوروبەری تاریکی دایدەگرت. سێبەری دارەکان ئەوەندەی تر بەرپێی تاریک کردبوو و با بە توندی سەرلکی پیرەدارەکانی ڕادەوەشاند و قرچە و خشەخشی پۆپ و گەڵا مێشکی ئازار دەدا و نەیدەتوانی گوێ بۆ خشە و جووڵەی دەوروبەری شل بکات و هەست ڕاگرێ. باڵندەی گەورە بە قیژە و سیڕە و فڕەی باڵیان دایاندەچڵەکاند و لە هێلانەکانیان دوور دەکەوتنەوە. وردەوردە گژوگیای بەرپێی کەم دەبوونەوە و زەل و قامیشەلانی خۆڕسک چڕوپڕتر و زۆرتر لە بەردەمیدا بالایان دەکرد و گەیشتە سەر لم و خیزەلانێک کە جێگاپێی گەماڵەکەی بە باشی دیار بوو. ئیتر گەیشتە شوێنێکی ڕووتەن و بەرئاوەڵا. هاژەیەکی یەکهاوی و بەردەوام لەگەڵ گڤەی گژەبا تێکهالان و ترس و سامێکی گرانیان لە ڕۆحیەوە پێچا. دەستی برد بۆ پشتی و بۆی دەرگەوت یەکێک لە کۆترەکانی نەماوە. یەکیان ملی پچڕابوو و تەنیا سەر و ملە خوێناوییەکەی بە لاکەلاکەیدا شۆڕ بووبۆوە و بە پەتەکەوە بەند بوو. زیاتر لە پێشوو ترسی لێ نیشت. دەستی کرد بە دۆعا خوێندن. ترسی ئەو تەنیا ئەوە بوو کە بێ ئەوەی توانیبێتی کارێکی باش ئەنجام بدات، بمرێ. لەگەڵ ئەوەشدا هەستی بە ئاواتێکی بەرزی زیندوومانەوە دەکرد. زیندوومانەوە بۆ ئەوەی فیداکارییەکی گەورە لە خۆی نیشان بدات.

# بیست و یەک

لە ناکاو ترووسکەیەک ڕووناکی لە ڕۆحی گیرا. دەنگێکی بیست کە بە زمانی ڕووسی قسە دەکا. خوڕە و هاژەی خێرا و خوڕینی تەرەکی لە دوو هەنگاو پێش خۆیەوە دەبیست و ڕووکاری بزۆک و مەیلەوڕەشی ڕووبارەکەی لەگەڵ لمی قاوەیی ڕەنگی ڕۆخەکە و ئیستیپی دوورەدەست دەدی و بورجی قەرەوڵی پاسگاکەش کە نزیک ڕووبارەکە هەڵکەوتبوو، هەروەها ئەسپێکی زین کراو کە لە نزیک دارە هەڵووچەکان بەسترابۆوە و کێوەکانی ئەوبەری چۆمەکەشی بە جوانی لێ وەدیار کەوت. خۆری مەیلەوسوور بۆ ساتێک لە ژێر گەواڵە هەورێکی ڕەش هاتە دەرێ و دوایین تیرێژی خۆی بە ڕووبەری چۆمەکە و قامیشەڵان و بورجی قەرەوڵ و دەستەی کازاخەکان بەخشی کە لە چەند جێگا کۆزیلکەیان بەستبوو. لە نێو کازاخەکاندا لاڕوومەتی لووکاشنکا سەرنجی ئۆلێنینی بۆ لای خۆی ڕاکێشا.

ئۆلێنین ڕۆحێکی تازەی لە جەستە گەڕابوو و بەبێ هیچ هۆکارێکی دیار و ئاشکرا خۆی بە بەختەوەر دەزانی. خۆی کرد بە نێو حەوشەی پاسگای نیژنی - پرۆتۆکدا کە لە کەناری تەرەک و بەرەوڕووی گوندێکی بێدەنگی ئەوبەری چۆمەکە هەڵکەوتبوو. سڵاوی لە کازاخەکان کرد، بەڵام چونکە هێشتا هەلێکی بۆ هەڵنەکەوتبوو کە کارێکی باش دەرهەق بە کەسێک بکات، بە ئارامی بەرەو دالانی ئیسپا ملی پێوەنا؛ لەوێش بارودۆخێکی شیاوی بۆ نەڕەخسا. چونکە کازاخەکان زۆر بە ساردوسڕی لەگەڵی بەرەوڕوو بوون. ئۆلێنین چوو بۆ بنکەی کازاخەکان و لەوێ جگەرەیەکی داگیرساند. کازاخەکان هیچ ڕوویەکی خۆشیان پیشان نەدا و بە لالووتێکەوە چاویان لێکرد، چونکە لە لایەکەوە ئەو جگەرەی دەکێشا و لە لایەکی دیکەشەوە ئەوان ئەو ڕۆژە ئێوارە سەرقاڵی کاروباری دیکە بوون. چەند کەسی چێچێنی

کە لە یاغییەکانی خزموکەسی ئەوبرەکە کوژراوەکە بوون لەگەڵ نوێنەرێک لە کوێستانەوە هاتبوون بۆ لای کازاخەکان کە تەرمی کوژراوەکە بکڕنەوە. کازاخەکان چاوەڕوان بون سەرۆکەکان لە ئیستانیستاوە بێن. برای کوژراوەکە پیاوێکی کەڵەگەت بوو بە ڕواڵەتێکی خاوێن و ڕێکوپێکەوە، ڕیشی سوور و لە خەنە گیراوی بریقەی دەهات، لەگەڵ ئەوەی چەرکسای لە بەردا بوو و کڵاوەکەی لە چەند جێگاوە کون بووبوو، وەک پادشایەکی خاوەن شکۆ و ویقارِ بە ئارامی و نەرمونیانی هەڵسوکەوتی دەکرد. قەڵافەتی زۆری شێوەی ئەبرەکە کوژراوەکە دەدا و دەتگوت سێوێکن کراون بە دوو بەشەوە. هیچ کەسی بە شیاوی ئەوە نەدەزانی چاوی لێ بکا؛ تەنانەت بۆ تاقە جارێک چاوی لە براکوژراوەکەشی نەکرد. لە بن دیوارێک هەڵترووشکابوو و قەننەی دەکێشا و خێراخێرا تفی دەکردەوە. جاروبار دەنگێکی فەرمان پێدەرانەی لە گەرووی دەدا دەرێ کە هاوڕێیەکەی بە شێوەیەک ڕێزدانانی دەزانی. دیار بوو ئەو پیاوە یەک جیگیتە و زۆری چاو بە ڕووسەکان کەوتووە و ئێستاش نە هیچ شتێکی ئەوان تووشی سەرسوورمانی دەکرد و نە بە لایەوە سەرنجڕاکێش بوو. ئۆلێنین هەنگاوێک لە تەرمەکە نزیک بۆوە و چاوی لێکرد، بەڵام برای کوژراوەکە چاوێکی پڕ لە سووکایەتیی لێکرد و چەند وشەی ناڕێکوپێک و غەرزیوانە هەنگاوی بە ئۆلێنین شل کردەوە و لە جێی خۆی ڕایگرت. نوێنەر بەپەلە دەموچاوی کوژراوەکەی بە شاقەلی چەرکساکەی خۆی داپۆشی. ئۆلێنین بەو قورساخی و حاڵەتە جیددییەی برای کوژراوەکە سەرسام بوو؛ دەیویست بچێ قسەی لەگەڵ بکات و لێی بپرسێ خەڵکی چ گوندێکە، بەڵام کابرای چێچێن چاوی لێ نەدەکرد؛ پاشان بە حاڵەتێکی پڕ لە سووکایەتییەوە تفێکی کردەوە و پشتی تێکرد. ئۆلێنین لەوەی کە ئەو پیاوە چیانشینە بە چاوی سووک تەماشای دەکا، سەری هێندە سوورمابوو کە پێی وابوو ئەو ڕق و گەوجێتییە دەبێ بە هۆی تێنەگەیشتنی زمانەوە بێ. لێک حاڵی نەبوون ئەو بارودۆخەی هێناوەتە ئاراوە. لە ناکاو بیری چوو بۆ لای هاوڕێکەی. ئەوی دیکەیان کە نوێنەر و دیلمانج بوو، وەک

ئەوی پێشــوویان جلــوبەرگی دڕاوی لە بەردا بــوو، بەڵام ڕەشــتاڵە بــوو. بەردەوام ددانە سپییەکانی وەدیار دەخست و چاوە ڕەشەکانی دەگێڕا. ئەو بە شـێوەیەکی تامەزرۆیـانە لەگەڵ ئۆلێنین کەوتە قسـە و داوای جگەرەیەکی لێکرد. پاشان بە ڕووسییەکی سەروگوێشکاو دەستی کرد بە قسە کردن:

ـ ئەوان پێنج برا بوون، ئەمە سێهەمین برایانە کە بە دەستی ڕووسەکان کوژراوە. ئێستا دوو برایان ماون. ـ دیلمانج ئامـاژەیەکی بە کابرای چێچێن کرد و گوتیشی: ئەم جیگیتێکی بەهێز و توانـایە، بەڕاستی جیگیتە. کاتێک کە ئەحمەدخان کوژرا، (ئەحمەدخان ناوی کوژراوەکە بوو) ئەو کاتەی تەقەیان لە براکەی کردووە لە نێو قامیشەڵانی ئەوبەری چۆمەکەدا بووە و هەموو شتێکی بە چاوی خۆی دیتووە. ئەو دیتوویەتی چۆنیان تەرمەکە خستۆتە نێو گەمـیەوە و هێناویـانە بـۆ ئەمـبەر. ئەو شــەوە هەتـا بەیـانی لەوێ بــووە و ویستوویە تەقە لە پیرەپیاوەکەش بکات، بەڵام ئەوانی دیکە نەیانهێشتووە.

لووکاشکا هـات بۆ لای ئەو دوو کەسـە و لە پەنایانـدا دانیشت و پرسـی: «خەڵکی کام ئائۆلن؟»

دیلمــانج وەڵامــی دایەوە: «ئەو لایە.» پاشــان ئامــاژەی بە کێوەکــانی ئەوبەری تەرەک و کەلێکی تاریک و لاجەوەردی گرد و گوتی: «ئەو کێوە، دەزانـی سواقسـوو لە کـوێیە؟ ئەوبەری چـۆمەکە. هەتـا ئەوێ مەوداکەی دە وێرێستە.»

لووکاشـکا پرسـیی: تـۆ لە سواقسـوو قیریخـان دەناسـی؟» دیـار بـوو لووکاشکا زۆری ئەو ئاشنایەتییە پێخۆشـە و پاشـان گوتیشـی: «ئێمە پێکەوە هاوڕێین.»

دیلمانجەکە گوتی: «بەڵێ دەیناسـم، ئەو دراوسـێمانە. پیاوێکی زۆر ئـازا و بوێر و خۆشگوزەرانە.»

لووکاشـکا کە سـەری قسـەی کردبـۆوە و زۆر حەزی لە ئاخـاوتن بـوو لەگەڵ کابرای دیلمانجدا، بە زمانی تورکی دەستی کرد بە قسە کردن.

زۆر زوو یووزباشی و سەرۆکی ستانیتسا بە سواری ئەسپ لەگەڵ دوو کازاخی تر هاتنە نێو ئیسپاکەوە. یووزباشی کە تازە پلەی بەرز کرابۆوە و نیشانەی پێدرابوو، سڵاوی لە کازاخەکان کرد و دەستی بەرز کردەو، بەڵام هیچ کەس بە پێی دابی ئاسایی هێزەکەیان پێی نەگوت: «سپاس قوربان. سڵامەت بی!» لەمبەر و ئەوبەر چەند کەسێک بێهەمیەتانە سڵاوێکیان لێکرد. هێندێکیان نەبێ کە لووکاشکا یەکێک لەوان بوو هەستانە سەر پێ و ڕاست و خەبەردار ڕاوەستان. ملازم بۆی دەرکەوت کە لە پشتەوە هەموو شتێک ڕێکوپێکە. هەموو ئەوانە لە بەرچاوی ئۆلێنین سووک و فشەی دەنواند. لە دڵی خۆیدا دەیگوت: «ئەم کازاخانە یاریی سەربازییان وەڕێ خستووە!» بەڵام زۆر زوو تەشریفات وەلانرا و بە شێوەیەکی سادە پێوەندی و ئاخافتن دەستی پێکرد و یووزباشی کە خۆشی وەک کازاخەکانی تر پیاوێکی شارەزا بوو، لەگەڵ دیلمانجەکە بە خێرایی دەستی کرد بە قسە کردن و بە زمانی تورکی لەگەڵی دوا. کاغەزێکیان نووسی و دایان بە دیلمانج و پارەیەکیان لێ وەرگرت و چوون بۆ لای تەرمەکە. یووزباشی پرسیی: «گاورلۆیۆڤ لووکاشکا کێیە؟»

لووکاشکا کڵاوەکەی لە سەری داگرت و هاتە پێشێ.

ـ لووکاشکا من سەبارەت بە تۆ ڕاپۆرتێکم نووسیوە و ناردوومە بۆ سەرهەنگ. ئیتر نازانم ئاکامەکەی چی دەبێ. پێشنیارم پێکردوون نیشانەی خاچت پێ ببەخشن و ببی بە ڕائید؛ تۆ زۆر گەنجی، خوێندەواریت هەیە؟

ـ نا.

یووزباشی لەگەڵ ئەوەی ڕۆڵی سەرۆکێکی دەسەڵاتداری دەگێڕا، گوتی: «قەیناکا. تۆ گەنجێکی بوێر و ئازای. کڵاوەکەت بکەوە سەرت. تۆ کوڕی کام کابریلۆڤی؟ نەکا کوڕی ئەو زلحۆرتەکە بی؟»

ڕائید وەڵامی دایەوە: «برازای ئەوە قوربان.»

ـ ئەها، دەزانم. ـ پاشان ڕووی لە کازاخەکان کرد و گوتیشی: «باشە، ئێستا بچن یارمەتیی ئەوان بدەن.»

لووکاشکا ڕوخساری گەشابۆوە و جوانتر لە کاتی ئاسایی دەنواند. دوای مۆڵەت وەرگرتن لە ڕائید، کڵاوەکەی لە سەری نا و دیسان لە لای ئۆلێنین دانیشتەوە. کاتێک تەرمەکەیان خستە نێو گەمیەکەوە، پیاوە چێچێنیەکە، واتە برای کوژراوەکە، چوو بۆ لای ڕۆخەکە. کازاخەکان بە پێچەوانەی ویستی خۆیان کشانە دواوە تاکوو ڕێگای بۆ چۆڵ بکەن. کابرا بە هەنگاوێکی بەهێز لە سەر لمی کەنارەکەوە لاقی بەرز کردەوە و بازی دایە نێو گەمیەکەوە. ئەو کاتە بۆ یەکەم جار ئۆلێنین بە جوانی چاوی لێکرد. پاشان کابرای چێچێن هەموو کازاخەکانی دایە بەر تیری ڕوانینێکی دەغەزدارانە و بە دەنگێکی بەرز دیسان پرسیاری لە هاوڕێکەی کردەوە. هاوڕێکەی وەڵامی دایەوە و ئاماژەی بە لووکاشکا کرد. کابرای چێچێن چاوێکی لە لووکاشکا کرد بە هێواشی پشتی لە کازاخەکان کرد و چاوی لە ڕۆخەکەی ڕووبەڕووی بڕی، ئەو حاڵەتەی کە ئەو پیاوەی لە خۆیەوە پێچابوو، ڕق و قین نەبوو؛ بەڵکوو سووکایەتییەکی زۆر بە ڕوانین و قەڵافەتیەوە دیار بوو. پیاوی چێچێن دیسان شتێکی بە هاوڕێکەی گوت. ئۆلێنین ڕووی کردە کابرای دیلمانج کە لە پەستا دەجووڵایەوە و هەدادانی نەبوو، گوتی: «دەڵێ چی؟»

دیلمانج کە دیار بوو درۆ دەکا وەڵامی دایەوە: «تۆ کاری خۆتت کردووە، ئێمەش کاری خۆمان دەکەین. هەرکەس بە نۆرەی خۆی.»

دیلمانج دای لە قاقای پێکەنین و ددانە سپییەکانی وەدیار کەوتن، پاشان ئەویش بازیدا نێو گەمیەکەوە.

برای کوژراوەکە بەبێ ئەوەی جووڵە بکات، لە نێو گەمیەکەدا دانیشتبوو، چاوی لە ڕۆخەکەی بەرانبەری دەکرد و نوقمی خەیاڵ بوو. ناخی ئەوەندەی ڕق و بێزاری تێدا کەڵەکە ببوو کە هیچکام لەو ڕووداوانە تووشی سەرسوورمانی نەدەکرد. دیلمانج لە لای دواوەی گەمیەکە ڕاوەستا، هەرجارەی بە بارێکدا سەوڵی لێدەدا و شارەزایانە گەمیەکەی بۆ پێشەوە ڕادەدا و بێ بڕانەوە قسەی دەکرد و چەنەی شل نەدەبوو. گەمیەکە بە شێوەی کەشوتووش بە سەر ئاوەکەدا دەخوشی، جار لەگەڵ جار دوور

دەکەوتەوە و شڵپەی سەوڵ و چەنەوەریی کابرای دیلمانج ئیتر بە باشی نەدەبیسترا. هەروەک هەموو چاویان لێ بوو، گەمیەکە گەیشتە کەناری ئەوبەر، لەوێ چەند ئەسپ چاوەڕوانیان بوون. دوو کەس تەرمەکەیان لە گەمیەکە داگرت و لەگەڵ ئەوەی ئەسپەکە هەڵدەستایە سەر پاشوو و چەپۆکانی دەکرد، تەرمەکەیان دا بە سەر زینی ئەسپەکەدا و دەست و لاقی بە هەر دوو لاتەڕافی ئەسپەکەدا شۆڕ ببۆوە، هەرکام سواری ئەسپی خۆیان بوون و بەرەو ئائۆل ملی ڕێیان گرت و ئەو مەودایەیان زۆر بە ئارامی بڕی. لە کەناری بەری ڕووس، کازاخەکان شاد و دڵخۆش بوون و لە هەموو لایەکەوە دەنگی قاقاکێشان گاڵتەوگەپ دەهاتە گوێ. یووزباشی و ڕائید بۆ پێکهێنانی بەزم و ئاهەنگ چوونە نێو بنکەکەوە. لووکاشکا کە شادی و دڵخۆشی لە سەرتاپای دەباری و بێهۆ هەوڵی دەدا خۆی جیددی پیشان بدات، لە پاڵ ئۆلێنیندا دانیشت و هەنیشکی لە سەر ئەژنۆی دانا و خەریکی سڕینی سەرنێزەکەی بوو. هەر لەو کاتەدا، بە حاڵەتێکەوە کە کونچکاویی پێوە دیار بوو گوتی: «دەی، کەوایە ئێوە جگەرە دەکێشن؟ یانی کارێکی باشە؟»

لووکاشکا ئەو قسەیەی کرد تەنیا لەبەر ئەوەی دەیدی ئۆلێنین بێتاقەتە و خۆی لە کازاخەکان دوورەپەرێز ڕاگرتووە و بە تەنیا دانیشتووە. ئۆلێنین وەڵامی دایەوە:

ـ بەڵێ، خووخدەیەکە. بۆ دەپرسی؟

ـ ئەها! ئەگەر ئەم خەڵکەی ئێمەش فێری جگەرەکێشان بن، زۆر خراپە! پاشان لەگەڵ ئەوەی ئاماژەی بە ملانەی کێوەکەی ئەوبەر دەکرد، درێژەی بە قسەکانی دا: «مەبەستم ئەوەیە کە کێوەکە زۆر لێرەوە دوور نییە... تۆش دەتوانی بە تەنیا بگەڕێیەوە بۆ ماڵێ؟ هەواکەی تاریک بووە و ئەگەر حەز دەکەی من لەگەڵتا دێم، بەڵام مۆڵەتم بۆ لە ڕائید وەرگرە.»

ئۆلێنین لەگەڵ ئەوەی چاوی لە قەڵافەت و ڕواڵەتی شاد و بەکەیفی لووکاشکا دەکرد، بیری کردەوە: «چ پیاوێکی بەتاقەتە!» هەر لەو کاتەدا

ماریانکا و شەقەی ماچەکەی پشت دەرگاکەی وەبیر هاتەوە و بەزەیی پێیدا هات. بۆیە دڵی بە لووکاشکا سووتا چونکە نەخوێندەوار بوو. ئۆلێنین بیری کردەوە: «ئەو گەوجێتییە! بەڕاستی بیر و مێشکێکی دواکەوتووی هەیە! ئەم پیاوە، پیاوێکی تری کوشتووە و شاد و کەیفخۆشە. هەردەڵێی باشترین کاری دنیای ئەنجام داوە! یانی بیر لەوە ناکاتەوە کە ئەم ڕووداوە شایانی ئەم هەموو دڵخۆشییە نییە و بەختەوەری لە کوشتندا نییە، بەڵکوو لە گیان بەخت کردندایە؟»

یەکێک لە کازاخەکان کە لەگەڵ گەمیەکە چووبوو، ڕووی لە لووکاشکا کرد و گوتی: «براکەم با ئەوەت پێ بڵێم! دەبێ لەمە بەدوا زۆر وریا بی نەکەویە داوی! خۆ گوێت لێبوو چۆنی ناوەکەت دەپرسی؟»

لووکاشکا سەری هەڵێنا و گوتی: «کێ، ئەو کوڕە؟»

مەبەستیشی لەو کوڕە، کابرای چێچێن یانی برای کوژراوەکە بوو.

ـ کوڕە ئیتر زیندوو نابێتەوە، بەڵام برا زرتەبۆزە ڕیش سوورەکەی کاری خۆی دەکا.

لووکاشکا بە پێکەنینەوە گوتی: «دەبێ بڕوات هەر نانێک بخوات و نانێک بکاتە خێر کە لێرە توانیی بە سلامەتی ڕزگاری بێ.»

ئۆلێنین لە لووکاشکای پرسی: «بۆ هێندە کەیفخۆشی؟ ئەگەر برای تۆیان بکوشتبایە، هەر ئاوا دڵخۆش و کەیفساز دەبووی؟»

چاوانی لووکاشکا لە سەر چاوانی ئۆلێنین گیرسابوونەوە و تروووسکەی بزەیان تێگەڕابوو. لووکاشکا دیار بوو بە جوانی تێدەگا کە ئۆلێنین مەبەستی چییە، بەڵام زۆر لەوە دڵخۆشتر بوو بەو قسانە شلوێ بێ و گوێ بەو شتانە بدات.

ـ دەی دەبێ چبکەم؟ ئەو شتانەش ڕوودەدا. مەگین ئەوان براکانی ئێمە ناکووژن؟

یووزباشی و سەرۆکی ستانیتسا ڕۆیشتبوون. ئۆلێنین بۆ ئەوەی بە پێی ویستی لووکاشکا هەڵسوکەوت بکا و خۆشی بە تەنیا لە دارستانە تاریکەکە

تینەپەڕێ، بۆیە چوو داوای مۆڵەتی لە ڕائید بۆ کرد و ئەویش دڵی ئۆلێنینی نەشکاند. ئۆلێنین پێی وا بوو لووکاشکا دەیەوێ چاوی بە ماریانکا بکەوێ و جگە لەوەش پێی خۆش نەبوو کە کازاخێکی کوڕەخاسە و قسەخۆش و جەفەنگبازی لەگەڵدایە. ئۆلێنین لە خەیاڵی خۆیدا سەرەڕای خۆی، لووکاشکا و ماریانکای پێکەوە ئاوێتە دەکرد و چێژی لە بیرکردنەوە سەبارەت بە ئەوان وەردەگرت. ئۆلێنین بیری کردەوە: «ئەو ماریانکای خۆشدەوێ و منیش دەتوانم خۆشم بوێ.» لەگەڵ ئەوەی بە نێو دارستانە تاریکەکەدا هەنگاویان دەنا و بەرەو ماڵێ دەڕۆیشتن، هەستێکی پڕ لە دڵسۆزی کە بە لایەوە شتێکی نوێ بوو، ناخی داگرت. لووکاشکایش زۆر دڵخۆش بوو. شتێکی وەک هاوڕێیەتی لە نێوان ئەو دوو پیاوەدا هەبوو، بەڵام لە بیر کردنەوەدا زۆر لە یەک دوور بوون. هەرجارێک لە یەکتریان دەڕوانی، دەستیان دەکرد بە پێکەنین. ئۆلێنین پرسیی: «تۆ بە کام دەروازەدا دەچیە ژووری؟»

ـ لە دەروازەی نێوەڕاستەوە. بەڵام من هەتا نزیک زەلکاوەکە لەگەڵتا دێم. لەوێوە ئیتر هیچ شتێک نییە جێی ترس بێت و بە ئەرخەیانی بڕۆوە بۆ ماڵێ.

ئۆلێنین دای لە قاقای پێکەنین و گوتی: «مەگین من دەترسم؟ بڕۆ بگەڕێوە. پێویست بە زەحمەت ناکات، زۆر سپاست دەکەم، خۆم بە تەنیا دەڕۆم.»

ـ نا، نا! من کارم بە سەر ئەوەوە نییە، تۆ بۆ دەبێ نەترسی؟ خۆ ترسان عەیب نییە. ـ پاشان لووکاشکا بۆ ئەوەی هەستی ئۆلێنین نەڕووشێنێ و دڵی چاک بکاتەوە، بە پێکەنینەوە گوتی: «ئێمە خۆشمان دەترسین.»

ـ تۆ وەرە بۆ ماڵی ئێمە. هێندێک قسە دەکەین و شەڕاب دەخۆینەوە و سبەینێ بەیانی بگەڕێوە بۆ پاسگا.

لووکاشکا بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: «پێتوایە من ماڵم نییە شەوێ لێی بمێنمەوە؟ ئەوەش بە جێی خۆی، ڕائید داوای لێکردم بگەڕێمەوە بۆ پاسگا.»

ـ دوێنێ گوێم لە دەنگت بوو گۆرانیت دەگوت، تەنانەت چاوم بە خۆشت کەوت.

ـ ئەرێ، ڕاست دەکەی.... پاشان سەری لەقاند و چاوی لە ئۆلێنین بڕی.

ئۆلێنین چاوێکی لێ قرتاند و لێی پرسی: «کەوایە دەتهەوێ ژن بێنی! وایە؟»

ـ دایکم حەز دەکا ژنم بۆ بێنێ. بەڵام گرفتەکە لێرەدایە کە من هێشتا ئەسپم نییە.

ـ کەوایە تۆ هێشتا کازاخێکی یاسایی نیت؟

ـ نا، هێشتا نیم! من تازە چوومەتە ڕیزی ئەرتەشەوە و ئەسپم نییە، ناشزانم چۆن ئەسپێک پەیدا بکەم. هۆی ئەوەی زەماوەند ناکەم هەر ئەوەیە.

ـ نرخی ئەسپێک چەندەیە؟

ـ چەند ڕۆژ لەمەوبەر دەیانویست ئەسپێک لەوبەری چۆمەکە بکڕن، شەست سکەیان پێدا، بەڵام کابرا نەیدا و داوای زیاتری دەکرد. ئەو ئەسپەش وەنەبێ زۆر ئەسپی چاک بێ، ئەسپێکی نووقانی بوو!

ـ تۆ حەز دەکەی لەگەڵم ببیتە هاوڕێ، لێم نزیک بی و هێندێک لە کارەکانم بۆ جێبەجێ بکەی؟ من سەبارەت بە تۆ داواکارییەک بەرز دەکەمەوە.

پاشان چاوێکی لە لووکاشکا کرد و گوتی: «ئەسپێکیشت پێشکەش دەکەم، بەڕاستیمە! من دوو ئەسپم هەیە و پێویستیم بە هەردووکیان نییە.»

لووکاشکا پێکەنی و گوتی: «چۆن شتی وا دەبێ؟ بۆ پێشکەشی منی دەکەی؟ ئێمە خۆمان ئەگەر خودا بیدا، پارەمان دەبێ.»

ئۆلێنین کە زۆری پێخۆش بوو ئەسپێک بدات بە لووکاشکا و لەوەی کە کتوپڕ ئەو بڕیارەی دابوو، زۆر خۆشحاڵ بوو. گوتی: «بەڕاستی تۆ حەز ناکەی لەگەڵم ببی بە هاوڕێ؟»

بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جۆرێک هەستی پەشیمانی ئۆلێنینی ئازار دەدا و خستبوویە تەنگژەوە. لە قسەیەک دەگەڕا. بە لووکاشکای بڵێ بەڵام نەیدەدۆزییەوە.

لووکاشکا بێدەنگییەکەی شکاند و گوتی: «ئێوە لە ڕووسیا ماڵی تایبەتی خۆتان هەیە؟»

ئۆلێنین نەیتوانی دان بە خۆیدا بگرێ و نەڵێ بە جێگای خانوویەک، خاوەنی چەندین ماڵە. لووکاشکایش بە ساکاری درێژەی بە قسەکانی دا و گوتی: «ڕەنگە ماڵەکەتان زۆر خۆش بێ! حەتمەن لە ماڵەکانی ئێمە گەورەترە! وا نییە؟»

ئۆلێنین هەروا کە باسی ماڵەکانی خۆی دەکرد گوتی: «زۆر گەورەیە، دە هێندەی ماڵەکانی ئێوە گەورەترە، سێ نهۆمە.

- ئەی ئەسپ، ئێوەش وەک ئێمە ئەسپتان هەیە؟

- من سەد سەرم ئەسپ هەیە، هەرکامەیان، سێسەد تا چوارسەد ڕۆبڵ دەژین. بەڵام وەک ئەسپەکانی ئێوە نین نرخیان سێسەد ڕۆبڵی زێو بێ! ئەوانەی ئێمە ئەسپی کێبڕکێن، خۆ دەزانی! بەڵام من ئەسپەکانی ئێرەم زیاتر بە دڵە.

لووکاشکا هەروا کە بزەی لە سەر لێو بوو گوتی: «دەی یانی ئێوە بە خواستی خۆتان هاتوون بۆ ئێرە، یان ناچاریان کردوون؟» پاشان ئاماژەی بە تووڵەڕێیەک کرد کە لە پێشیانەوە بوو و گوتی: «ئا، بڕوانە، ڕێگاکە ئەوە نییە! دەبێ بە لای دەستە ڕاستدا بڕۆین.»

ئۆلێنین وەڵامی دایەوە: «بەڵێ، من بە خواستی خۆم هاتووم بۆ ئێرە، حەزم دەکرد وڵاتی ئێوە ببینم و بچم بۆ مەیدانی جەنگ.»

لووکاشکا گوتی: «من ئێستا زۆر بە تامەزرۆییەوە دەچم بۆ مەیدانی جەنگ.» پاشان لەگەڵ ئەوەی گوێی شل کردبوو گوتیشی: «بڕوانە ئەو چەقەڵانە چۆن دەستیان کردەوە بە واقەواق.»

ئۆلێنین پرسی: دەی تۆ ناترسی کەسێکت کوشتووە؟»

- ترس؟ بۆ دەبێ بترسم؟ پاشان دووپاتی کردەوە: زۆرم حەز لێیە بچم بۆ مەیدانی جەنگ. ئەوەندەم حەز لێیە کە...

ـــ ڕەنـــگە پـــێکەوە بچـــین. لیـــواکەی ئـــێمە بەر لە جەژن لێـــرە دەڕوا و سوارەکانی ئێوەش لەگەڵمان دێن.

ـ بەڕاستی سـەیرە، کەسێک ماڵوحاڵی خۆی بەجێ بێڵێ و بێت بۆ ئێرە! ئێوە خۆتـان مـاڵ و ئەسـپ و تاقمێک خزمەتکارتـان هەیە. ئەگەر مـن بە جێی ئێوە بـوایەم، خەریکی خۆشـگوزەرانی دەبـووم. ئێـوە نیشـانەی ئەفسـەریتان پێدراوە؟

ـ مـن جـارێ قوتـابیی فێـرگەی سـەربازیم و پێشـنیاری نیشانەشـیان بـۆ کردووم.

ـ ئەگەر ئێوە قسەکەتان ڕاست بێ و خاوەنی ژیانێکی ئەوەندە باش و مـاڵ و سامان بن، من هیچکات ئەم کۆخە هەژارانەیەی خۆمان بەجێ نـاهێڵم. قەت حەز ناکەم ئێرە بەجێ بێڵم. تۆ ژیانی ئێرەت پێ باشە؟

ئۆلێنین وەڵامی دایەوە: «بەڵێ. زۆریش باشە.»

هەروا کە ئـــۆلێنین و لووکاشـــکا پـــێکەوە دەدوان، بە دەم قســـەکردنەوە گەیشـــتنە ئـاوایی. کە پێیـــان نـایە یەکەم کـۆڵانەوە، هەوا بە تەواوی تاریـک داهاتبوو. سێبەری دارسـتان بە سـەر گونـدەکەدا کشـابوو تـاریکتری دەنوانـد. بـای دەهـات، چڵوپـۆپی دارەکـانی دەشـەکاند و هاژەهـاژی دەهـات و لەگەڵ دەنگی نووزە و واقەواقی ڕێوی و چەقەڵ تێکەڵ دەبوو و دەتگوت پێدەکەنن و دەگرین. لە پێشـیانەوە دەنگی ژنـان و چەقولـووری سـەگەل دەهـاتە گـوێ. ماڵەکـان وەک تـاپۆیەک دیـار بـوون و لە دەلاقەی چکۆلەیـانەوە شـۆقی چـرا دەڕژایە کۆشی تاریکییەوە. بۆنی تـایبەتی دووکەڵی کیزیـاک دەهـات. ئۆلێنین لەم شـەوەدا بەتـایبەت هەسـتی دەکـرد کە مـاڵەکەی و بنەمـاڵەکەی و تەواوی بەختەوەرییەکـانی لەم گونـدەدایە و هەرگیـز بەم شـێوەیە نەژیـاوە و لەمە بەدواوەش قەت بە ڕادەی ئێســـتا و ژیـــانی لەم ستانیتســـایە هەســـت بە بەختەوەری ناکات و ژیانێکی لەو شـێوەیەی نـابێ. ئەو شـەوە تەواوی دنیـا و ژیان و بەتایبەتی لووکاشکای لەڕادە بەدەر خۆش دەویست!

کاتێـک ئـۆلێنین گەیشــتەوە مەزڵەکەی، لە بەرچــاوی پــڕ لە ســەیرمانی لووکاشـکا، خـۆی چـووە گەوڕەکە و ئەو ئەسـپەی کە لە گڕوزنـی کڕیبـووی، نەک ئەوەیــان کە هەمیشــە ســواری دەبــوو، بەڵکــوو ئەو ئەســپەیان کە تــا ڕادەیەک پیر بوو، بەڵام هێشتا بەهێز و لەسەر لۆق بوو، هێنـایە دەرێ و دای بە لووکاشکا.

لووکاشـکا گـوتی: «بـۆ ئەو ئەسـپە دەدەی بە مـن؟ خـۆ مـن هێشـتا هـیچ خزمەتێکم بە ئێوە نەکردووە.»

ـ قەیناکا، نرخی ئەو ئەسپە زۆر نییە، سواری بە و بڕۆ، هەرچەندێکت بۆ هەڵسووڕا بمدەیە. ئێمە پێکەوە دەچین بۆ شەڕ.

لووکاشکا پەشۆکا و بێ ئەوەی چاو لە ئەسپەکە بکات گوتی: «چۆن وا دەبێ؟ ئەسپ نرخی خۆی هەیە، وا نییە؟»

ـ وەریگرە! پێشکەشـم کـردووی، ئەگەر ئەسـپەکەم لـێ وەرنەگری، مـن بە سووکایەتیی دەزانم. ژانۆ! یارمەتیی بدە بـا سـوار بێت و ئەسـپە شـێ لەگەڵ خۆی بەرێ.

لووکاشـکا هەوسـاری ئەسـپەکەی گـرت و گـوتی: «ئێسـتا کە وای لێهـات، زۆرتان سـپاس دەکەم. ئەو کـارەی ئێوە بە تەواوی تووشـی سەرسـووڕمانی کردم.»

ئۆلێنین وەک کۆڕیژگەیەکی دوازدە ساڵان شاد و دڵخۆش بوو.

ـ نـا، جـارێ مەڕۆ؛ ئەسـپەکە لێرە ببەسـتەوە. ئەسـپی چـاکە، لە گڕۆزنـی کڕیومە. وەک بای شەماڵ دەفڕێ. ژانۆ چیخیرمان بۆ بێنە! با بچینە ژووری!

ژانۆ شەڕابی بۆ هێنان. لووکاشکا دانیشت و پەرداخێکی هەڵگرت و لەگەڵ ئەوەی خەریک بوو دواپین قومی لێدەدا، گوتی: «هیـوادارم بتـوانم قەرەبووی بکەمەوە! من ئەو چاکەیەتم لە بیر ناچێ. ببوورە، ناوی بەڕێزت چییە؟»

ـ دیمیتری ئاندرێڤیچ.

ـ زۆر باشە دیمیتری ئاندرێڤیچ، خودا دەس بە عومرت بگرێ! ئێمە پێکەوە دەبین بە هاوڕێ! ئێستا هەرکاتێک حەزت لێبوو وەرە بۆ ماڵی ئێمە. ئێمە زۆر

ساماندار نین. بەڵام هەرکاتێک میوانێک بێتە ماڵمان، دەتوانین میوانییەکی چکۆلە وەڕێ بخەین و ڕێزی لێ بگرین. من دایکم ڕادەسپێرم هەرکاتێک پێویستیت بە نقشک و ترێ هەبوو بۆت ئامادە بکات. هەرکاتێکیش هاتی بۆ پاسگا، من بۆ ڕاوکردن و تێپەڕین لە دارستان و ڕووبارەکە، یان هەرجێگایەکی حەزت لێبوو بچی، لەگەڵت دێم. دوێنێ، با هەر باسی نەکەین، دەبێ بمبووری، چونکە نەمدەناسیی، بەرازێکم ڕاو کرد! گۆشتەکەیم بە سەر کازاخەکاندا دابەش کرد. ئەگەر لەگەڵ تۆ ناسیاویم ببوایە، گۆشتم بۆ تۆش دەنارد.

ــ زۆر سپاس. بەڵام لە هێلینگە و عارەبانەی مەکە، ئەم ئەسپە قەتی عارەبانە ڕانەکێشاوە.

ـ چی؟ ئەسپ لە عارەبانە بکەم؟ پاشان دەنگی نزم کردەوە و گوتی: «ئەگەر حەزت لێ بێ شتێکی دیکەشت پێدەڵێم: من هاوڕێیەکم هەیە بە ناوی قیریخان، ئەو داوای لێکردووم لە جادەی داوێنی کێوەکە ڕاوەستم. ئەگەر پێت خۆش بوو پێکەوە دەچین. دڵنیا بە خیانەتت پێ ناکەم. من مریدی تۆم.

ـ زۆر باشە. ڕۆژێک پێکەوە دەچین.

لووکاشکا وا دیار بوو بە تەواوی هێور بۆتەوە و هەڵسوکەوتی ئۆلێنین سەبارەت بە خۆی تێدەگا. نەرمونیانی و هەڵسوکەوتی ساکاری ئۆلێنین تووشی سەرسووڕمانی کردبوو و تەنانەت هێندێک نائاساییشی دەنواند. ماوەیەکی زۆر پێکەوە قسەیان کرد و لووکاشکا ئەگەرچی زۆری خواردبۆوە، بەڵام سەرخۆش نەبوو. (ئەو هیچ کات سەرخۆش نەدەبوو). بۆ خوداحافیزی دەستی ئۆلێنینی گوشی و چووە دەرێ. شەو زرینگابۆوە و زۆر درەنگ وەخت بوو. ئۆلێنین لە پەنجەرەکەوە چاوی لە دەرێ کرد تاکوو بزانێ لووکاشکا دوای چوونە دەرێ و بەجێ هێشتنی ئەو چی دەکا. لووکاشکا بە هێواشی هەنگاوی دەنا و سەری داخستبوو، ئەسپەکەی لە حەوشەکە بردە دەرێ و پاشان سەرێکی لەقاند و وەک پشیلە گورجوگۆڵ و سووک خۆی فڕێدایە سەر پشتی ئەسپەکە. هەوسارەکەی گرت بە دەنگێکی

بەرز هێی لە ئەسپەکە کرد و بە کۆڵانەکەدا تێپەڕی. ئۆلێنین پێی وابوو لووکاشکا لەڕێوە دەچێ بۆ لای ماریانکا و باسی ئەم دڵخۆشییەی خۆی بۆ دەکا؛ بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کە ئەو کارەی نەکرد، ئۆلێنین هەستی بە خۆشی و چێژێکی دەروونی کرد. وەک منداڵێک شادی دڵی داگرتبوو و هەموو چیرۆکەکەی بۆ ژانۆ گێڕایەوە. نەک هەر باسی پێشکەش کردنی ئەسپەکەی بە لووکاشکا، بەڵکوو هۆکاری ئەو بڕیارەی و بیر و باوەڕی خۆی سەبارەت بە بەختەوەری، سەرلەبەری بۆ ژانۆ باس کرد. ژانۆ ئەم بیرۆکەی پشت ڕاست نەکردەوە و گوتی کە ئەو کارە ئاکامێکی گەوجانەی هەیە چونکە L’agrent il n’y’a psa[٤٥]

لووکاشکا بە پەلە ڕۆیشتەوە بۆماڵی خۆیان. لە ئەسپەکە دابەزی و هەوسارەکەی دایە دەستی دایکی و ڕایسپارد کە بینێرێ بۆ نێو ڕەوەی ئەسپی کازاخەکان. خۆی دەبوو هەر ئەو شەوە بگەڕێتەوە بۆ پاسگا. لاڵەی خوشکی ئاگاداریی ئەسپەکەی گرتە ئەستۆ و بە ئاماژە بە براکەی، حاڵی کرد کە ئەگەر ئەو پیاوە بناسێ وا ئەو دیارییەی پێداوە، کڕنۆشێکی وای بۆ دەکا ناوچاوانی لە زەوی بدرێ. پیرێژن دوای بیستنی قسەی کوڕەکەی سەرێکی لەقاند و لە دڵی خۆیدا بیری کردەوە کە لووکاشکا دەبێ ئەو ئەسپەی دزیبێ؛ هەربۆیە لاڵەی کچی تێگەیاند کە بەیانی بەر لە هەڵاتنی خۆر، بیگەیێنێتە نێو ڕەوەی ئەسپەکان.

لووکاشکا گەڕایەوە بۆ پاسگا و لە ماوەی ڕێگادا بەردەوام بیری لەو ڕەفتارەی ئۆلێنین دەکردەوە. سەرەڕای ئەوەی دەیزانی کە ئەو ئەسپە ئەسپێکی باش نییە، بەڵام لانیکەم چل سکەی دێنا، بۆیە لە خۆشییا پێی وەعەرزی نەدەکەوت. بەڵام ئەو پرسیارەی لەلا دروست بووبوو کە ئۆلێنین بۆ دەبێ ئەو دیارییەی پێدابێ؟ لووکاشکا هەرچی سەرێ دێنا و دەبرد، لەوە تێنەدەگەیی و کەمترین هەستی پێزانینی لە خۆیدا هەست پێنەدەکرد. بە پێچەوانە گومانێک لە مێشکیدا سەری هەڵدابوو و پیلانی مەترسیدار مێشکی

---

٤٥ ڕستەیەکی فەڕەنسییە یانی: پارە لە گوڕێدا نییە.

داگرتبــوو. ئەوەی کە دارِشــتنی ئەو پیلانــانەش دەبــێ چــۆن بــێ، تێــی نەدەگەیشت و بۆی نەدەچووەوە سەر یەک؛ بەڵام قەبووڵ کردنی ئەوەش کە کەسـێکی غەوارە، بەبـێ هـیچ پێشـینەیەک و تەنیـا لە ڕووی مێهرەبـانییەوە ئەسپێکی چل ڕۆبڵیت پێشکەش بکات، نەیدەزانی چۆنی لێکداتەوە و بە خۆی بسـەلمێنێ! ئەگەر ئۆلێنین ئەو کـارەی لە کـاتی سەرخۆشـیدا بکـردایە، دەکـرا تێی بگەی. چونکە لە کاتی سەرخۆشیدا پیاو لەوانەیە بۆ خۆنواندن کارێکی لەو جـۆرە بکـا، بەڵام ئەو ئەفسـەرە لاوە بە تەواوی وشـیار بـوو، هەربـۆیە مەبەستی ئەوە بووە کە بیکاتە بەرمنەتی خۆی و لە هەمبەر ئەو ئەسپەدا بۆ پیلانێکی ڕەش هانی بدات و تێوەی گلێنێ. لووکاشکا بیری کردەوە: «نا، وا چاکە زۆری بیر لێ نەکەمەوە! جارێ ئەسپەکە هی منە، دواتریش هەرشتێک ڕووبدا دەردەکەوێ. خۆ منیش گەمژە نیم. ماوەیەکی تر مەعلووم دەبێ کە کاممـان دەیـدۆڕێنین. ئەرێ دواتـر مەعلـووم دەبـێ!» لووکاشـکا لەو بیـر و خەیـاڵەدا بـوو و پێـی وابـوو دەبـێ وریـا بـێ نەکەوێـتە داوی ئەو کـوڕە غەوارەیە، هەربـۆیە لە نـاخی خۆیـدا هەسـتی بە جۆرێـک ڕەشـبینی کـرد سەبارەت بە ئۆلێنین. لووکاشکا بە هیچ کەسی نەگوت کە ئەو ئەسپەی چۆن وەدەست کەوتووە. لەلای هێندێ کەس دەیگوت کڕیویەتی؛ کەسانێکی دیکەش کە لێیـان دەپرسـی خـۆی لە وەڵامـدانەوە دەبـوارد. بەڵام زۆری پـێ نەچـوو هەمــوو خەڵکــی گونــدەکە مەســەلەی ئەســپەکەیان بــۆ دەرکەوت. دایکــی لووکاشــکا، ماریانکــا، ئیلــی ڤاســیلیڤیچ و زۆربەی کازاخەکــانی دیــکە کە دەستودڵبازی بێهۆی ئۆلێنینیان بۆ دەرکەوتبوو، تووشی شک و گومان بوون و لە ئـۆلێنین دەترسـان و دڵیـان لێـی ڕەش بـوو. سـەرەڕای ئەو تـرس و دڕدۆنیگیـیە، ئەم ڕەفتـارە لەلای ئەوان جۆرێـک ڕێـزی سـاکار و سـامانی دەرهەق بە ئـۆلێنین لـێ کەوتبـۆوە. یەکێـک دەیگـوت: «بیسـتووتانە! ئەم قوتابییەی فێرگەی سەربازی کە لە ماڵی ئیلی ڤاسیلیڤیچ نیشتەجێیە، ئەسپێکی داوە بە لووکاشــکا کە پەنجــا ســکە دەژی! ئەو کــابرایە زۆر پیــاوێکی ساماندارە!»

یەکێکی تر بە لەبزێکی دەغەزدارانە وەڵامی دەدایەوە: «دەزانم. لەخۆڕایی نییە. لووکاشکا دەبێ خزمەتێکی پێ بکات. جارێ ڕاوەستن مەعلووم دەبێ ئەو مەسەلەیە لە کوێوە ئاو دەخواتەوە. بەڵام ئەوەشمان لە بیر نەچێ ئەو بێباکە ناوچاوانەکەی هێناویەتی!»

سێهەمی گوتی: «ئەم خەڵکە غەوارانە یانی ئەم قوتابییانەی فێرگەی سەربازی، کەسانێکی ڕاست و پاک نین! ئەوە ڕۆژەکەیە باسی دەکەین، خۆتان دەبینن کە ئەو هەتیوە چ فەرتەنەیەک لەم گوندە دەنێتەوە، یان ئاوری کێشەیەک هەڵدایبسێنێ....»

# بیست و دوو

ژیانی ئۆلێنین لە سەر ڕەوتێک و بە ڕێکوپێکی بەڕێوە دەچوو. لەگەڵ سەرۆک و هاوقەتارەکانی کەمتر هاتوچۆ و هەڵسوکەوتی دەکرد. لە قەفقاز، بارودۆخی قوتابییەکی سامانداری فێرگەی سەربازی بەو شێوەیە جێ کەوتووە: سەرۆکەکان ئەویان نەدەنارده سەر کار و مەشقیان پێ نەدەکرد. بە هۆی بەشداری لە شەڕدا، پێشنیاری نیشانەی ئەفسەریی بۆ کرابوو و چاوەڕوانی ئەوە بوو نیشانەکانی بۆ بێتەوە، بۆیە کاریان بە سەریەوە نەبوو و هەموو ئەرکێکی لە سەر هەڵگیرابوو. ئەفسەرەکان بە چاوی ئەشراف و خانەدان لە ئۆلێنینیان دەڕوانی و زۆر بە ڕێزەوە هەڵسوکەوتیان لەگەڵ دەکرد. یاریی پاپەزێن و ئاهەنگی مەی نۆشی و بەزم و گۆرانی کە زۆر جار بەڕێوە دەچوو و ئۆلێنین لەگەڵیان ئاشنا بوو، کەمتر ئەوی بۆ لای خۆی ڕادەکێشا. هەتا ئەو جێیەی دەیتوانی خۆی دەبوارد لە کۆڕ و کۆبوونەوەی ئەفسەران و شێوەی ژیانی ئەوان لە گوندەکەدا. ماوەیەک بوو کە ژیانی ئەفسەرەکان لە گوندەکانی کازاخ بارودۆخێکی ئاشکرا و تایبەتی بە خۆوە گرتبوو؛ بە جۆرێک کە هەموو قوتابییەکی فێرگەی سەربازی یان هەموو ئەفسەرێک لە پلەوپایەی خۆیدا دەیتوانی بیرە بخواتەوە و قومار بکات، لە کۆڕەکانیشیاندا باس باسی نیشانە و بەرزبوونەوەی پلەوپایە بوو. لە گوندەکەدا ئەفسەرەکان یان قوتابییانی فێرگەی سەربازی دەیانتوانی بەردەوام لەگەڵ خاوەنماڵەکەیان شەڕاب بخۆنەوە، کچان بانگهێشتن بکەن و بە هەنگوین و شیرینی میوانداریيان لێ بکەن و وەشوێن ئەو ژنە کازاخانە بکەون کە حەزیان لێ دەکەن و هێندێ جار زەماوەندیشیان لەگەڵ بکەن. ئۆلێنین چۆن حەزی لێبوو ئاوای ڕادەبوارد و بێ ئیختیار لەو ئاکار و هەڵسوکەوتانە وەڕەز بوو کە ئەفسەر و هاوقەتارەکانی کات و ژیانی خۆیان

بۆ تەرخان کردبوو. لێرەش بە پێی ئەو دابە ئاساییەی ئەفسەران لە قەفقاز ڕەفتاری نەدەکرد و خۆی لەو کردەوە نەشیاوانە دەبوارد. لەگەڵ هەڵاتنی خۆر لە خەو هەڵدەستا، چایی دەخواردەوە و لە سەر قاڵدرمەکان ماوەیەک دادەنیشت. سەیری شاخ و کێو و گزنگی بەیان و ڕەوت و ڕۆیین و بەژنوباڵای ماریانکای دەکرد و لە دڵەوە کڕنۆشی بۆ ئەو هەموو جوانییانەی سروشت دەبرد؛ پاشان زیپوونێکی کەڵپۆسی کۆنەی لە بەر دەکرد و جووتێ کەوشی خووساوی لە پێ دەکرد کە پۆرکینیان پێدەگوت. خەنجەرەکەی لە نێوقەدی دەبەست و تفەنگەکەی ڕاست و چەپ لە شانی دەکرد. کۆڵەپشتییەکی چکۆلەی لە پشتی دەبەست کە تۆزێ نان و تووتنی تێدەنا، بانگی سەگەکەی دەکرد و بەر لە کاتژمێر شەش بەرەو دارستانەکە ملی ڕێی دەگرت. لای عەسر، دەوروبەری کاتژمێر حەوت برسی و شەکەت، بە پێنج شەش سوێسکە و کۆترەوە کە بە نێوقەدیا هەڵیدەواسی و هێندێک جار بە نێچیرێکی گەورەترەوە، دەگەڕایەوە بۆ ماڵێ، بەبێ ئەوەی دەستی لە نان و تووتنی نێو کۆڵەپشتییەکەی دابێ و مێلاکی کردبێ. ئەگەر فکر و خەیاڵ لە مێشکیدا وەک جگەرەی نێو کۆڵەپشتییەکەی جێیان بگرتایە، دەکرا بڵێین کە لەم چاردە کاتژمێرەدا تەنانەت تاقە خەیاڵێک لە مێشکی ئەودا نەبزووتووە. کاتێک دەگەیشتە ماڵێ، لە ناخەوە شاد و گەشاوە و بەهێز بوو. تەنانەت نەیدەتوانی بیر بکاتەوە کە لەم ماوەیەدا چ فکر و خەیاڵێک لە مێشکیدا بووە. یان لەوانەیە هێندێک خەیاڵ و بیرەوەری و بۆچوون و ڕەنگە ئاوێتەیەک لە هەموویان لە مێشکیدا سەری هەڵدابێ. هێندێ جار خۆی وەبیر دەهاتەوە و لە خۆی دەپرسی: «من بیر لە چی دەکەمەوە؟» هەر خۆشی بە دەندووک بە دوای خۆیەوە بوو. چونکە لە خەیاڵی خۆیدا دەیدی بۆتە کازاخێک و لەگەڵ ژنەکەی لە نێو باخێکدا کار دەکا، یان ئەبرەکێکە و لە کوێستان نیشتەجێ بووە، یان بەرازێکە لە پێش خۆیەوە هەڵدێ و دەیهەوێ خۆی دەرباز بکات؛ هەمیشە گوێقوڵاغ ڕادەوەستا و چاوی لە خاڵێکی نادیار دەبڕی و چاوەڕێ بوو باڵندەیەک بەرازێک یان بزنەکێوییەک بجووڵێتەوە و بیپێکێ.

زۆربەی ڕۆژەکان لای عەسر مامە ئیرووشکا دەهات بۆ لای. ژانۆ نیوە چارەکێک[٤٦] چیخیری دەهێنا، پێکەوە دادەنیشتن، قسەیان دەکرد و شەڕابیان دەخواردەوە، پاشان هەردووکیان ڕازی و دڵخۆش لە یەتر هەڵدەبڕان و دەخەوتن. سبەینێی ئەو ڕۆژە، سەرلەنوێ ڕاو، سەرلەنوێ شەکەتییەکی سالم، سەرلەنوێ چاوپێکەوتنی عەسرانە و خواردنەوەی شەڕاب و شادی و دڵخۆشی. هێندێ جار لە ڕۆژانی جەژن یان پشووداندا، لە ماڵ نەدەچووە دەرێ و لە ژوورەکەی دەمایەوە. لەو کاتانەشدا خۆی بەماریانکاوە سەرقاڵ دەکرد، لە بەر پەنجەرەکە دادەنیشت و تەواوی ڕەوت و ڕۆین و هەڵسوکەوتی ئەوی دەخستە ژێر چاوەدێری و چاوی لێ نەدەترووکاند. هەروا کە چاوی لە جوانییەکانی کوێستان و ئاسمان دەکرد و لە ناخەوە چێژی لێ وەردەگرت، بە دیتنی ماریانکاش خەنی دەبوو. (ئەوە خەیاڵێک بوو کە لەگەڵی دەژیا.) بەڵام قەت لە بیری ئەوەدا نەبوو کە پێوەندیی لەگەڵ دامەزرێنێ. پێی وابوو لە نێوان ئەو و ماریانکادا هیچکات ئەو پێوەندی و گەرموگوڕییە نابێ کە لە نێوان لووکاشکای کازاخ و کچەدا هەیە. تەنانەت پێوەندییەکی زۆر کەم، لەو پێوەندییانەی کە لە نێوان ئەفسەرێکی دەوڵەمەندی ڕووسی و کچێکی کازاخدا دەکرێ هەبێ. پێی وابوو ئەگەر ئەویش وەک هاوقەتارەکانی هەڵسوکەوت بکا و ڕابوێرێ، ئەو چێژە ڕۆحی و ڕەوانییە پڕ لە عەشقانەی خۆی توور دەداتە نێو بوودڕێکی پڕ لە کەسەر و داخەوە و ئاوات و تاسەکانی سەرچاوەیان کوێر دەبێتەوە و دەبێ بەردی پەشیمانی لە چۆکی خۆی بدات. لەگەڵ ئەوەشدا سەبارەت بەو کچە، ئێستا دەیویست فیداکارییەک لە خۆی نیشان بدات کە ببێتە هۆی شادی و گەشانەوەی، بەتایبەت ترسێکی تایبەت لە دڵیدا هێلانەی کردبوو و بە هیچ شێوەیەک نەیدەوێرا ئەشقی خۆی بۆ کچە دەربڕێ و ڕازی دڵی خۆی لەلا بدرکێنێ.

---

٤٦ نیوەچارەک یەک لە هەشتی چلیکێکە کە لە لیتر و نیوێک زیاترە.

ڕۆژێکی وەرزی هاوین، ئۆلێنین نەچوو بۆ ڕاو و لە ماڵێ مایەوە. کتوپڕ یەکێک لە ناسیاوانی مۆسکۆی کە کوڕێکی زۆر گەنج بوو، لێی وەژوور کەوت و بە زمانی نیوەفەڕەنسی و نیوەمۆسکۆیی گوتی:

ـ ئا، Mon che’r[٤٧] چەندەم پێخۆش بوو کە بیستم تۆ لێرەی!

پاشان میوانەکەی لەگەڵ ئەوەی سەروگوێی وشەی فەڕەنسیی دەشکاند، درێژەی بە قسەکانی دا: «بە منیان گوت «ئۆلێنین»، کام ئۆلێنین؟ لە خۆشیانا پێم وەعەرزی نەدەکەوت... چارەنووس ئێمەی لە شوێنێک گیرساندۆتەوە، دەی حاڵت چۆنە؟ چی دەکەی؟ تۆ چی و ئێرە چی؟

ئەو کوڕە کە ناوی پرەنس بیلیتسکی[٤٨] بوو، تەواوی سەربردەی خۆی بۆ گێڕایەوە کە چۆن بۆ ماوەیەکی کورت هاتۆتە نێو ئەو هەنگەوە و چۆن فەرماندەری لیوا ئەوی وەک ئاجوودانی خۆی هەڵبژاردووە، چۆنیش دوای شەڕ ئەو سەرۆکە پایەبەرزە هەروا خۆشی دەوێ؛ بەڵام ئەو گوێ بەو شتانە نادا و بە لایەوە گرینگ نییە. بیلێتسکی هەروا بێ پسانەوە قسەی دەکرد و گوتی: «مانەوە لێرە و لەم کونەدا نازانم چ کەڵکێکی هەیە؟ لانیکەم دەبێ لە بیری بەرزبوونەوەی پلەوپایەدا بین... دەبێ نیشانە و دەرەجە بەدەست بێنین ... ئێستا منیان بۆ ڕیزەکانی گاردی سپا قەبووڵ کردووە. ئەمانە، ئەگەر بۆخۆشم پێویست نەبێ، لانیکەم بۆ خزم و کەس و ئاشناوڕۆشناکانم زۆر پێویستە. شازادە زۆر بە باشی وەریگرتم. ئەو زۆر کەسێکی باش و لە دڵەوە نزیکە. بە بۆنەی ئازایەتی و بوێریم لە شەڕدا نیشانەی شانازیی بۆ پێشنیار کردووم. جارێ هەتا کاتی هۆردووکەشیی داهاتوو لێرە دەمێنمەوە و ئێرە زۆر شوێنکی باشە. ئەو هەموو ژنە جوانەی لێیە! پێم بڵێ بزانم، تۆ چی دەکەی؟ دەزانی ملازمەکەی ئێمە ستارێتسۆڤ چیی پێ گوتووم؟ دەزانی چی؟ ئەو دەڵێ ئێوە کەسێکی باش و گەمژەن ... بە منی گوت کە ئێوە بە تەواوی کێوین وەک وەحشی دەژین و لەگەڵ هیچ

---

٤٧ یانی خۆشەویستەکەم

48 Bieletski

کەس هاموشۆ و هەڵسوکەوتتان نییە. من دەزانم کە ئێوە حەز ناکەن لەگەڵ ئەفسەرەکانی ئێرە تێکەڵاویتان هەبێ. زۆر خۆشحاڵم کە ئێستا پێکەوە دانیشتووین؛ هیوادارم ببینە دوو هاوڕێی باش و دڵسۆز بۆ یەکتری. من بە لای ماڵی ڕائیددا هاتم. چ کچێکی لێ بوو، مەبەستم ئۆستینکایە. بەڕاستی دەڵێی فریشتەیە! هێندە جوانە لەوە زیاتر نازانم چۆن وەسفی بکەم.»

بیلێتسکی هەروا سێڵاوی وشەی فەڕەنسی و ڕووسی لە زاری دەڕژا. وشەگەلێک کە تایبەتی دنیایەک بوون وا ئۆلێنین پێی وابوو بۆ هەمیشە لێی دابڕاوە. بیروڕای ئۆلێنین سەبارەت بە بیلێتسکی بەم شێوەیە بوو: کوڕێکی باش و ڕۆحسووکە. لە ڕاستیدا دەکرا بڵێی بەو شێوەیەش بوو، بەڵام سەرەڕای ڕواڵەتی مێهرەبان و ڕێکوپێکی، لە بەرچاوی ئۆلێنین زۆر ناڵەبار و دزێوی دەنواند. هۆیەکەشی ئەوە بوو تەواوی ئەو شوورەیی و ڕیسواییانەی کە ئۆلێنین خۆی لێ دەبوارد، بیلێتسکی بە پیریەوە دەچوو و لە حەوا دەیقۆستەوە. ئەوەی زیاتر لە هەموو شتێک جاڕزی کردبوو، ئەوە بوو کە نەیدەتوانی و بەڕاستی لە خۆی ڕانەدەدی ئەو پیاوە لە خۆی بتارێنێ کە تایبەتی دنیا و باردودۆخێکی جیاواز بوو. چونکە هەستی دەکرد هاوڕێیەکی دێرینەیە و لە غەریبایەتی یەکتریان دۆزیوەتەوە و هەقی بە سەریەوە هەیە. ئەو تاوانەکەی دەخستە ئەستۆی خۆی و بیلێتسکی و بە پێچەوانەی ویستی خۆی، ڕستە و وشەی فەڕەنسیی تێکەڵ قسەکانی دەکرد. وای پیشان دەدا هۆگری فەرماندەری باڵا و ئاشنا و هاوڕێیانی مۆسکۆی خۆیەتی. بە بیانووی ئەوەی کە تەنیا ئەو دوو کەسە لەو گوندە کازاخ نشینە بە زمانی فەڕەنسی قسە دەکەن، سووکایەتیی بە هاوڕێیان و هاوقەتارانی دیکە و کازاخەکان دەکرد. لەگەڵ بیلێتسکی بە نەرمی دەجووڵایەوە و بەڵێنی پێدەدا بچێت بۆ بینینی و بانگهێشتنی بکات بۆ ماڵەکەی خۆی. بەڵام ئۆلێنین قەت نەچوو بۆ لای. ژانۆ تاریفی بیلێتسکی دەکرد و دەیگوت کە ئەو کوڕە بەڕاستی یەک بارینی[٤٩] حیسابییە.

---

٤٩ بارین: ئاغا، ئەرباب

بیلێتسکی لەو گوندە لەڕێوە خۆی وەک ئەفسەرێکی ساماندار نیشاندا و لە ماوەی مانگێکدا لە بەرچاوی ئۆلێنین وەک دانیشتوویەکی قەدیمیی ئەو گوندەی لێ هات. شەوانە میوانیی چکۆلەی وەڕێ دەخست و شەڕابی دەدا بە پیرەپیاوانی ئاوایی، شەوانە دەچوو بۆ ژوانی کچان و هێندە بەو بارودۆخەی خۆی دەنازی کە کچان و ژنان نازناوی باوەگەورەیان بە سەردا بڕیبوو. کازاخەکان کە بە تەواوی ناسیبوویان و بۆیان دەرکەوتبوو کە ئەو پیاوێکە ئاشقی شەڕاب و ژنانە، خۆیان لێ نزیک دەکردەوە و بێ ئەو هەڵیان نەدەکرد. بۆیە زۆر زوو جێی بە ئۆلێنین لێژ کرد و سەرنجی خەڵکی بۆ لای خۆی ڕاکێشا. خەڵکیش ئەویان لە ئۆلێنین پێ باشتر بوو، چونکە پێیان وابوو ئۆلێنین پیاوێکی ڕاست و شەفاف نییە و ئاکار و هەڵسوکەوتی وەک مەتەڵێکی لێ هاتبوو کە بۆیان هەڵندەدرا.

# بیست و سێ

کاتژمێر پێنجی بەیانی بوو. ژانۆ، لە سەر قاڵدرمەکان ڕاوەستابوو بە شووڵکێک دوودەی نێو ئاگردانی سەماوەرەکەی دادەتەکاند. ئۆلێنین بە سواری ئەسپ چووبوو بۆ تەرەک، کە لە ئاوی چۆمەکەدا خۆی بشوا. (ئەو بەینێک بوو فێر ببوو بە ئەسپەکەیەوە دەچووە نێو چۆمی تەرەک ئەسپەکەشی دەشۆرد و خۆشی مەلەی دەکرد.) ژنی خاوەنماڵ لە ژوورە چکۆلەکەی خۆی بوو. دووکەڵێکی ڕەش لە دووکەڵکێشی ژوورەکە هەڵدەستا، دیار بوو وەجاخەکەیان هەڵکردووە. کچە لە نێو گەوڕەکەدا خەریکی دۆشینی گامێشەکان بوو و بە وەڕەزییەوە دەیگوت: «قۆڕە کوشتوو، وا دیارە ناتەوێ ڕاوەستی؟» بەڵام زۆر زوو دەنگی خوشەخوشی شیردۆشین هاتە گوێ. لە کۆڵان، بە مەودایەکی زۆر کەم خرمەی پێی ئەسپێک هات و ئۆلێنین بە سواری ئەسپە خۆڵەمێشینە تۆخەکەی کە هێشتا وشک نەبووبۆوە و بریقەی دەهات، بەرەو لای دەروازە گەورەکە هاتە پێشێ. ماریانکا کە دەسماڵێکی سووری لە سەری پێچابوو، وەک خاسەکەو لە گەوڕەکە هاتە دەرێ و دیسان ون بۆوە. ئۆلێنین کراسێکی ئارمووشی سووری لە بەردا بوو و چەرکسایەکی سپیی بە سەردا کردبوو، لە سەر چەرکساکەشەوە، حەمایلێکی بەستبوو کە خەنجەرەکەی پێوە هەڵواسیبوو، کڵاوێکی درێژیشی لە سەر کردبوو. گورج و وریا لە سەر پشتی ئەسپەکەی لەگەڵ ئەوەی تفەنگەکەی بە پشتیەوە ڕاگرتبوو خۆی دانەواند تاکوو درگاکە بکاتەوە. سەروقژی هێشتا تەڕ بوو و دەموچاوی بە هۆی گەنجی و لەشساغییەوە بریقەی دەهات. ئۆلێنین خۆی بە پیاوێکی جوانچاک و گورجوگۆڵ و جیگیت دەزانی، بەڵام لە ڕاستیدا وا نەبوو؛ لە بەرچاوی هەرکام لە خەڵکی بە ئەزموونی قەفقاز، سەرەڕای تەواوی ئەو شتانە، ئەو تەنیا هەر سەربازێکی ئاسایی بوو و

بەس. هەرکە گەیشتە نێو حەوشەکە بە دەنگێکی دلێرانە و پڕ لە شادییەوە بێ ئەوەی چاو لە دەرگای گەوڕەکە بکات، گوتی: «ژانۆ، چایی ئامادەیە؟» بە ڕەزایەتەوە هەستی دەکرد کە ئەسپەکەی کەفەڵی لێک توند دەکات و لە هەلێک دەگەڕێ لەغاوەکەی داماڵێ و تەواوی ماسوولکەکانی جەستەی دەلەرزێنێتەوە و ئامادەیە بە چوار ناڵ غار بدات و بە سەر پەرژینی حەوشەکەدا باز بدات. لەو کاتەدا لە سەر قوڕەسوورەی حەوشەکە سمی لە زەوی دەکوتا. ژانۆ وەڵامی دایەوە: C'est pret.[50] ئۆلێنین هەستی کرد دەموچاوە جوانەکەی ماریانکای دیتووە کە لە نێو گەوڕەکە چاوی لێ دەکا، بەڵام ئەو سەری وەرنەسووڕاند. لە ئەسپەکەی دابەزی، بەڵام تفەنگەکەی لە لێواری قاڵدرمەکە گیرا و سەری بۆ لای دواوە وەرسووڕا و بە ترسەوە چاوی لە نێو گەوڕەکە کرد. لەوێ ئیتر هیچ کەس دیار نەبوو، بەڵام بەردەوام خوشەخوشی دۆشینی شیر دەهاتە گوێ.

ئۆلێنین خۆی کرد بە ژوورەکەی خۆیدا و دوای ساتێک بە کتێبێک و قەننەیەکەوە هاتە دەرێ و لە سووچێک کە هێشتا تیشکی کلومنجری خۆر لێی نەدابوو، لە پاڵ پیاڵە و پەرداخی چاییدا دانیشت. بڕیاری دابوو ئەو ڕۆژە دوای نان خواردنی بەیانی بۆ هیچ کوێ نەچێ و چەند نامە بنووسێ کە زۆر دواکەوتبوون. بەڵام زۆری بەلاوە دژوار بوو سەر قاڵدرمەکان بەجێبێڵێ. حەزی نەدەکرد بچێتەوە ژوورێ چونکە وەک جۆرێک بەندیخانە دەهاتە ئەژمار بە لایەوە. دایکی ماریانکا وەجاخەکەی هەڵکردبوو. کچەکەشی پاتاڵەکانی بردبووە دەرێ و ئێستا گەڕابۆوە و کیزیاکی وشکەوە بووی لە پاڵ تەیمانەکەدا لە لیژە دەدا. ئۆلێنین خەریکی خوێندنەوەی کتێب بوو، بەڵام ناوەرۆکی کتێبەکەی بۆ نەدەچۆوە سەریەک و لێی تێنەدەگەیشت. ناچار سەری لە سەر کتێبەکە هەڵگرت و لە کچەی ڕوانی کە بە بەردەمیدا دەهات و دەچوو. لە هیچکام لە ڕەوت و ڕۆین و هەڵسوکەوتی کچە غافڵ نەدەبوو. کاتێک دەچووە ژێر ساباتی فێنک و شەونم لێ نیشتووی حەوشەکە، کاتێک

---

٥٠ ڕستەیەکی فەڕەنسییە یانی ئامادەیە.

دەگەیشــتە نێوەڕاســتی حەوشــەکە و دەکەوتە بەر تیرێــژی گەرم و ڕوونــی خۆرەتاو، کاتێک بەژنوبالآی بە جلوبەرگی جوان وڕازاوەوە لە ژێر پڕشنگی خۆردا دەدرەوشـایەوە و سـێبەرێکی ڕەشـی دەخسـتە سـەر تەرکـی خۆڵینی حەوشــەکە، ئـۆلێنین بەردەوام چـاوی لەگەڵ دەگێـڕا و نەیدەویسـت چـاو لە چکۆلەترین جووڵان و هەڵسوکەوتی غافڵ بکا. ئۆلێنین بە وردی دەیڕوانییە باڵای بەرز و قەدی باریکی کچە کاتێک دادەنەوی و هەڵدەستایەوە، کراسـە سـوورەکەی کە سـەرتاپای داپۆشـیبوو، مەمکە خڕ و توندەکەی کە لە ژێـر کراسـەکەدا لەگەڵ جووڵان و هەناسەکێشانی، بەرز و نەوی دەبوونەوە و بە ئاسـتەم لەرەیـان دەهـات، داوێنـی نەرمـی کراسـەکەی کە لەگەڵ هەنگـاو هەڵێنـانەوە لە بەلەکـی دەهـاڵا و نەرمـایی پـووزە ناسـکەکەی دەنوانـد. لاقە چکۆلەکانی کە لە نێو پۆستاڵی سووری ڕەنگ بواردوودا بە ئارامی دایدەنا و هەڵیدەهێنایەوە. بە قـۆڵ و مەچەکـی بەهێـز و ماسـوولکەی سفتوسـۆڵەوە کە هەتا نزیک هەنیشکی هەڵیکردبوو و پێمەڕەکەی پێ ئەمبارەوبار دەکرد، چاوە ڕەش و گەشـــەکانی کە هێنـــدێ جـــار ئۆلێنینیـــان نازبـــاران دەکـــرد و بە سـووکەئاوڕێکی سـرک و ئاسـک ئاسـا دڵـی دادەخورپانـد. ئـۆلێنین هەمـوو ئەوانەی دەدی و هەسـتی بە چێژێکـی شـیرینی ڕۆحـی دەکـرد. کـچە بـرۆی تێکدەنا و لە چاوانیدا دیار بوو کە لە جوانی و شۆخوشەنگیی خۆی ڕازییە و زۆریش شایی بە خۆیە.

لەو کاتەدا دەنگی بیلێتسکی هات کە بە جلوبەرگی ئەفسـەرانی قەفقازەوە خۆی کرد بە حەوشەکەدا و گوتی: «دەی ئۆلێنین، وا دیـارە مـاوەیەکی زۆرە ئاوا بە پێوە ڕاوەستاوی؟»

ئـۆلێنین لەگەڵ ئەوەی دەسـتی کێشـا بـۆ لای بیلێتسـکی و تـۆقەی لەگەڵ کـرد، وەڵامـی دایەوە: «چـۆنی بیلێتسـکی! بەم بەیـانییە زووە لێـرە چـی دەکەی؟»

ـ چی دەکەم؟ لە ماڵێ وەدەریان نام. ئەمڕۆ لە ماڵی ئێمە کۆڕێکی سەما و هەڵپەڕکێمان دەبێ. پاشان ڕووی لە کچە کرد و گوتی: «تۆش خۆ دێی بۆ لای ئۆستینکا، وا نییە؟

ئۆلێنین لە دیتنی بیلێتسکی توانیی ئاوا بە ئاسانی لەگەڵ کچە قسە بکات زری پێ سەیر بوو. بەڵام ماریانکا وەک ئەوەی دەنگی بیلێتسکیی نەبیستبێ، سەری بۆ پێشەوە دانەواند، پێمەڕەکەی نایە سەر شانی و بە ڕەوت و ڕۆیینێکی پیاوانەوە ڕۆیشتەوە ژووری و دەرگاکەی پێوەدا.

بیلێتسکی لەگەڵ ئەوەی چاوی بە دوای کچەدا دەخوشی، گوتی: «وردیلە، شەرمەونیشە. دایەگەورەتان وا دیارە مانگی شەرمێیەتی!» پاشان لەگەڵ ئەوەی پێدەکەنی لە سەر قاڵدرمەکان دانیشت، ئۆلێنین گوتی: «چۆن؟ کوتت لە ماڵی ئێوە کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێ بەڕێوە دەچێ؟ کێ ئێوەی وەدەرناوە؟»

ـ بەڵێ لە ماڵی ئۆستینکا، خانەخوێکەی من، کۆڕێکی سەما و هەڵپەڕکێیان ساز کردووە و ئێوەش بانگهێشتن کراون. کۆڕی سەما یانی هێندێک خواردن و خواردنەوە و کۆمەڵێک کچی جوان و ناسک.

ـ دەی ئێمە لەوێ چبکەین؟

بیلێتسکی بە پێکەنینێکی فرتوفێڵاوییەوە چاوێکی قرتاند و بە سەری ئاماژەی بەو دەرگایە کرد کە ماریانکا پێیدا چووبووە ژووری.

ئۆلێنین شانی هەڵتەکاند و سوور هەڵگەڕا. بیلێتسکی تێگەیشت، بە ڕوویەکی خۆش و مەراییکارانەوە پێکەنی و گوتی: «زۆرم پێ سەیرە...! چۆن دەتوانی ئاوا دانیشی، تۆ لەم ماڵەدا دەژی و کچێکی ئاوا جوانیش کە لە شۆخوشەنگیدا بێوێنەیە، بەو هەموو جوانییەوە، پێم سەیرە...»

ئۆلێنین گوتی: «بەڕاستی جوانییەکەی لە تاقەت بەدەرە! لە ژیانما ئافرەتێکی ئاوا جوانم نەدیوە.»

بیلێتسکی کە بە هیچ شێوەیەک نەیدەتوانی لەو مەسەلەیە بگا، پرسی: «دەی باشە، دوای ئەوە؟»

ئۆلێنین وەڵامی دایەوە:

ـ ئەوەی دەیڵـێم ڕەنـگە بە لاتەوە سـەیر بـێ، بەڵام لێـت ناشـارمەوە. لەو کاتەوە مـن لێرەم، هـیچ ژنێک لە ژیانمـدا نەبـووە و بەڕاسـتیش بـارودۆخەکە زۆر بـاش و لەبـارە! لە نێـوان ئـێمە و ئەو ژنـانەدا چ شـتێکی هـاوبەش دەبـێ هەبــێ؟ بەڵام لەگەڵ ئیرووشــکا یەککەوتــووین. ئــێمە پــێکەوە ڕابــواردنێکی هاوبەشمان هەیە کە پێی دەڵێین ڕاو.

ـ باشە، چ شتێکی هاوبەش دەبێ لە گۆڕێدا هەبێ؟ پێم بڵـێ بـزانم لە نێـوان مـن و ئـامیلی ئیڤانۆڤنـادا[٥١] دەبـێ چ شـتێکی هـاوبەش هەبـێ، هـا؟ لێـرەش مەسەلەکە ئەوەیە. ڕەنگە بڵێی ژنانی ئێرە نەختالێ پنجڵ و تاوەسووتن، بەڵام ئەمە شتێکی ترە و لێرەدا مەسەلەکە جیاوازە. چونکە لە کاتی شـەڕدا، دەبـێ وەک کاتی شەڕ هەڵسوکەوت بکەی.[٥٢]

ئۆلێنین وەڵامی دایەوە:

ـ بەڵام من هیچ کات لەگەڵ ئەو جۆرە ژنـانە کەینوبەینم نەبـووە و قەتـیش نەمتوانیوە لەگەڵیان تێکەوم. چونکە ئەو جۆرە ژنانە پیاو نـاتوانێ ڕێزیـان بـۆ دانێ، بەڵام ژنانی ئێرە بەڕاستی شایانی ڕێزن.

ـ زۆر چاکە بە کەیفی دڵت ڕێزیان بۆ دانێ، کێ ڕێگای لێ گرتووی؟

ئــۆلێنین وەڵامــی نەدایەوە، بەڵام حەزی دەکــرد فکــری خــۆی هەتــا ئەو جێیەی دەتوانێ دەرببڕێ. چونکە ئەو فکرە دڵی خستبووە تەنگژەوە و لە نێـو ڕکەی سینگیدا ڕێکی دەگوشی.

ـ دەزانـم مـن لەگەڵ خەڵکـی جیـاوازم (دیـار بـوو زۆر پەشـۆکاوە) بەڵام ژیانی بە شێوەیەک جێ کەوتووە کە هەست بە هـیچ پێویسـتییەک نـاکەم بـۆ گـۆڕینی و ئەگەر بمـهەوێ وەک ئێـوە بـژیم، ئیتـر تەواوی بەختەوەرییەکـانی ژیـان پشـتم لـێ هەڵدەکەن و نایانبینمەوە. جگە لەوەش ئەوەی مـن بە دوایدا

---

٥١ ئەوە ئاوڵناوێکە بۆ ژنانی بەستۆکە و داوێنتەڕ

٥٢ لە دەقی سەرەکیدا ئەم ڕستەیە بە زمانی فەڕەنسییە.

دەگەڕێم، شتێکی زۆر جیاوازە. من شتێک لە ژناندا دەبینم و هەستی پێدەکەم کە لەگەڵ ڕوانگەکانی ئێوە زۆر جیاوازە.

بیلێتسکی بە حاڵەتێکی پڕ لە بێباوەڕییەوە بڕۆی هەڵتەکاند و گوتی: «سەرەڕای هەموو ئەوانەش ئەمشەو وەرن، ماریانکاش لەوێ دەبێ. من لەوێ بە یەکترتان دەناسێنم. تکات لێدەکەم وەرە. ئەگەر کۆڕەکەت بە دڵ نەبوو، زانیت وەڕەزت دەکا، بڕۆ. دەی پێم بڵێ دێی یان نا؟

- بەڵێ حەتمەن دێم. بەڵام بۆ ئەوەی ڕاستییەکەیم پێ گوتبێتی، دەترسم بارودۆخەکە کارم تێبکا و بمگۆڕێ.

بیلێتسکی دەنگی بەرز کردەوە:

- بژیی! بژیی! زۆرم پێخۆشە دێی. دڵنیا بە لەوێ دڵت ئاو دەکا و من سووکنایی بە دڵت دەبەخشم. بەڵێنت داوە! بەڵێنی پیاوانەیە، ها؟

- بەڵێ، بەڵام ڕاستت دەوێ نازانم لەوێ چبکەم! ئێمە لەوێ چ ڕۆڵێکمان هەیە؟

- تۆ وەرە، بەڵێنم پێ بدە دێی.

- بەڵێ، ڕەنگە بێم.

- پێم سەیرە، ئەو هەموو ژنە جوان و بێوێنەیە لێرە هەیە، کەچی تۆ وەک سۆفیی تەرکەدنیا ملت داخستووە و نایانبینی. جا ئەوە ژیانە تۆ هەتە؟ چ کەڵکێکی هەیە پیاو ژیانی خۆی بە فیڕۆ بدات و ئەوەی لە بەردەستیدایە چێژی لێ وەرنەگرێ؟ لەوە گەڕێین، زانیوتە یەکەکەمان بەم زووانە دەچێ بۆ وێزدڤیژنسکایا؟

- پێموانییە بچێ. وەک من بیستوومە یەکەی هەشتەم دەیهەوێ بچێ.

- نا، ئاجوودان نامەیەکی بۆ من ناردبوو؛ لەوێدا نووسیبووی کە شازادە خۆی لە شەڕەکەدا بەشداری دەکات. من ئەوەم زۆر پێخۆشە. جگە لەوە چاوم بە شازادەش دەکەوێ. ئێتر خەریکە لێرە وەڕەز دەبم.

- دەڵێن بەم زووانە هێرشەکە دەست پێدەکا.

ـ لەوە ئاگادار نیم. بەڵام بیستوومە کرینۆڤیتسین بۆ بەشداری کردن لە هێرشێکی کتوپڕدا، نیشانەی شانازیی وەرگرتووە.

بیلێتسکی پاشان بە پێکەنینەوە گوتی: «چاوەڕوانی نیشانی دووهەمیش بوو بەڵام چاوی ڕەشی کاڵ بۆوە. کرا بە ڕاسپاردەی ناوەندی فەرماندەیی ئەرتەش ...

وردەوردە ئێوارە بە سەردا هات و ئۆلێنین بیری لە شەوێک دەکردەوە کە چاوەڕوانی بوو. ئەو بانگهێشتنە زۆری ئازار دەدا. حەزی دەکرد بچێ، بەڵام سەبارەت بەو کۆڕە شتێکی سەیر، شتێکی نامۆ و هێندێ ترسناک لە مێشکیدا سەری هەڵدابوو. دەیزانی لەو کۆڕەدا پیاوان و ژنانی کازاخ بەشداری ناکەن و پڕ دەبێ لە گەورەکچ. لە خۆی دەپرسی: بڵێی لەوێ چی ڕوویدا؟ ئەو دەبێ چۆن هەڵسوکەوت بکات؟ چی بڵێ؟ ئەوان چی دەڵێن؟ چ پێوەندییەک لە نێوان ئەو و ئەم کچە سرک و ئاسک ئاسایانەدا هەیە؟ بیلێتسکی باسی هێندێ پێوەندیی سەیر و ناهێمنانە و لەگەڵ ئەوەشدا جیددیی کردبوو ... بە بڕوای ئەو سەرسوورهێنەر بوو کە ئۆلێنین لەگەڵ ماریانکا لەماڵێکدا دەژی بەڵام هێشتا لەبزیان لە لەبزی یەک نەگەڕاوە! بەتایبەت کاتێک قەڵافەتی کەڵەگەت و لەباری خۆی وەبیر دەهاتەوە، شەرمی لە خۆی دەکرد و بە کارێکی ئەستەمی دەزانی. بەڵام بیلێتسکی پێی کوتبوو کە ئەوانە زۆر شتێکی ئاساییین و بۆ پیاو وەک ئاوخواردنەوە وایە. ئۆلێنین بیری کردەوە: «بڵێی بیلێتسکی لەگەڵ ماریانکاش هەروەک ژنان و کچانی دیکە هەڵسوکەوت بکا؟» ئەوە خۆی بە لایەوە شتێکی سەرنجڕاکێش بوو. بە خۆی گوت: «نا، وا باشترە نەچم بۆ ئەو کۆڕە. ئەو کارانە زۆر پیس و خوێڕییانە و شوورەیین.» بەڵام شتێکی تر لە ناخەوە ئازاری دەدا: لەوێ چی ڕوودەدا؟، بەڵێنی بە بیلێتسکی دابوو و دەبوو لە سەر بەڵێنی خۆی سوور بێ. وەلحاسڵ بەبێ ئەوەی هیچ بڕیارێک بدات ڕۆیشت بۆ ماڵی بیلێتسکی و ڕاست خۆی کرد بە ژوورەکەدا.

ژوورەکەی بیلێتسکیش وەک ژوورەکەی ئۆلێنین وا بوو. ئەمماڵە لە سەر چێوبەستی قایم و پتەو سازکرابوو. کورسەکەی پێنج پا بەرز بوو، دوو ژووری هەبوو. ژووری یەکەم کە قاڵدرمەیەکی چکۆلەی هەبوو، چەند پشتی و مافوورە و بالیفی تێدابوو کە بە شێوازی کازاخەکان و بە شێوەیەکی جوان و هونەرمەندانە لە بن دیوارەکاندا لەسەر یەک هەڵچندرابوون. بە دیوارەکانەوە کەشەفی برنجی و هەموو جۆرە چەکێک هەڵواسرابوو، لە ژێر کورسییەکەدا هێندێک کاڵەک و کوولەکەی شەقەباخی ڕیزکرابوون. لە ژووری دووهەم، سۆبایەکی گەورە، مێزێک و چەند کورسی و چەند وێنەی کۆنی حەزرەتی مریەم وەبەرچاو دەکەوتن. بیلێتسکی لەم ژوورەیاندا نیشتەجێ بوو. چرپایەکی سەفەری و دوو جانتا و قاڵیچەیەکی دیواری کە چەند جۆر چەکی پێوە هەڵواسرابوو، کەلوپەلی ئاڕایشت و چەند وێنە، لەو ژوورەدا وەبەرچاو دەکەوتن. ڕبدۆشامبرێکی هەورێشمی لەسەر کورسییەکە کەوتبوو. بیلێتسکی بە قەڵافەتێکی شاداب و تەڕوتازەوە لە سەر تەختەکەی ڕاکشابوو و خەریکی خوێندنەوەی «سێ چەکدار» بوو.

بیلێتسکی لە ناکاو لە جێی خۆی هەستا.

- بەخێربێی! دەی ئەم ژوورەت پێ چۆنە؟ خۆ پێت خراپ نییە؟ زۆرم پێ خۆشە هاتی. کچەکان خەریکی کاروبارن. دەزانی خواردنی ئەمشەو چۆن ساز دەکرێ؟ تێکەڵێکە لە هەویر و گۆشتی بەراز و مێوژ. بەڵام مەسەلەی گرینگ ئەوە نییە. وەرە ئەو لایەی دیکە ببینە و بزانم دڵت ئاو دەکا.

کاتێک لە پەنجەرەکەوە ڕوانییان، ماڵی خاوەنماڵەکەیان زۆر قەرەباڵغ بوو. کچان هەرکامەی شتێکیان بە دەستەوە بوو، بەردەوام دەچوونە ژووریّ و دەهاتنەوە دەرێ. بیلێتسکی دەنگی هەڵێنا:

- زۆری ماوە؟

- هەر ئێستا! مەگین برسیتە، باوەگەورە؟ - دەنگی چەند پێکەنینی نەرم و نەشەبزوێن لە نێو ژوورەکەدا دەنگی دایەوە.

ئۆستینکا، خڕوخۆڵ و نەرمونۆڵ و گردومرد، بە لەشولارێکی جوان و ڕوومەتی سوور و قۆڵی هەڵکراوەوە هات لە ژوورەکەی بیلێتسکی قاپ و دەوری بەرێ. کاتێک ویستی بڕواتەوە دەرێ، بیلێتسکی باوەشی پێدا کرد و دەمی نا بە ڕوومەتە نەرم و سوورەکەیەوە. کچە بە دەنگێکی تیژ هاواری لێ هەستا:

ـ ئەیەڕۆ ئەوە بۆ وا دەکەی! خەریک بوو دەورییەکانم پێ بشکێنی.

پاشان لەگەڵ ئەوەی پێدەکەنی، ڕووی لە ئۆلێنین کرد و گوتی: «بریا تۆش بهاتبایەی بۆ یاریدەم، بەڵام شیرینیت لە بیر نەچێ.»

بیلێتسکی لێی پرسی: «ماریانکا هاتووە؟»

ـ بەڵێ هاتووە، هەویریشی هێناوە.

بیلێتسکی گوتی: «دیتووتە چەندە جوانە! ئەم کچە جلوبەرگی باشی لەبەر بکردایە و ئاڕایشتی بکردایە، لە تەواوی ژنەکانی ئێمە جوانتر دەبوو. خۆ بۆرشچۆڤا دەناسی؟ ئەویش یەکێک لەو کچە کازاخانە بوو شووی کرد بە سەرهەنگێک. نازانم ئەو هەموو شۆخوشەنگی و نەرمونیانییەی لە کوێ هێناوە؟»

ـ من بۆرشچۆڤام نەدیوە، بەڵام ئەم کچە هەر بەو جلوبەرگە ساکارەوە جوانە و لێی دەکاڵێتەوە.

بیلێتسکی دای لە قاقای پێکەنین و گوتی: «من باش دەزانم خوو بە هەموو جۆرە ژیانێک بگرم! ئێستا دەچم بۆ ژوورەکەیان بزانم چی دەکەن.»

خێرا ڕبدۆشامبرەکەی لە بەر کرد و چووە دەرێ، بە دەم ڕۆیشتنەوە بە دەنگی بەرز گوتی: «تۆش لە بیرت نەچێ، شیرینی ئامادە بکە.»

ئۆلێنین خزمەتکارەکەی خۆی نارد شیرینی بکڕێ؛ هەر لەو کاتەشدا کە پارەی کڕینی شیرینییەکەی دا بە خزمەتکارەکەی زۆر بە کارێکی ناحەز و خوێڕییانەی زانی و پێی وابوو کەسێک بێ ئابڕوو دەکا، هەر بەو هۆیە لە وەڵامی خزمەتکارەکەیدا کە پرسیی: چەندە نوقڵی نەعنایی و چەندە هەنگوینی بکڕم، وەڵامێکی ڕاشکاوانەی نەدایەوە و تەنیا گوتی: «چەندەت پێخۆش بوو

بکرە،» ژانۆ بە دەنگێکی نزم و واق وڕماوانە پرسیی: «هەموو پارەکە بدەم بە شیرینی؟ شیرینی نەعنایی گرانترە. دانەی بە شازدە کوپکە.»

ئۆلێنین گوتی: «ئەرێ هەمووی بدە بە شیرینی.» پاشان لە بەر پەنجەرەکە لەسەر کورسییەک دانیشت. سەری لە خۆی سووڕمابوو. دەتگوت بۆ کارێکی زۆر گرینگ و دزێو هەنگاوی هەڵێناوەتەوە. کاتێک بیلێتسکی چووە ژووری کچەکان دەستیان کرد بە قریشکەقریشک و قیژاندن، دوای چەند ساتێک، ئۆلێنین چاوی بە بیلێتسکی کەوت کە لەگەڵ هەرا و بگر و قریشکەی پێکەنینی کچەکاندا، بە هەڵەداوان هاتەدەرێ و بە قاڵدرمەکاندا هاتە خوارێ. بیلێتسکی هات بۆ لای ئۆلێنین و گوتی: «دەریان کردم.»

چەند سات دواتر، ئوستینکا هاتە ژوورێ و پێی ڕاگەیاندن کە هەموو شتێک ئامادەیە. بە لەبزێکی شیرین و شیلەبزەیەکی دڵڕفێنانەوە بانگی کردن بۆ بەشداری کردن لە کۆڕی سەما و هەڵپەڕکێ. کاتێک ئۆلێنین و بیلێتسکی چوونە ژووری کچەکان، هەموو شتێک ئامادە بوو. ئوستینکا بالیفەکانی بە جوانی لە بن دیوارەکان ڕیز کردبوو. مێزەکەیان بە ساتینێکی چکۆلە ڕازاندبۆوە، دۆلکەیەکی پڕ لە چیخیر و چەند ماسیی برژاویان لەسەر دانابوو. ماڵەکە تەژی بوو لە بۆنی هەویر و کشمیش. شەش کەس لەو کچانە، بەشمیتی ڕازاوەیان لە بەردا بوو، بەبێ لەچکەی ئاسایی لە سووچێکی ژوورەکە ڕاوەستابوون و سرتوخورتیان بوو؛ پێکەوە پێدەکەنین و فوویان دەکرد. ئوستینکا میوانەکانی بانگ کرد بۆ سەر سفرەکە و گوتی: «تکاتان لێدەکەم ئاغای بەڕێز، سەربەرزمان کەن.»

ئۆلێنین لە نێو گەورەکچەکاندا کە یەک لە یەکی جوانتر بوون، ماریانکای دی و هەستی بە ئازارێکی زۆر کرد کە لە باردودۆخێکی ئاوا نالەبار و ئاساییدا لەگەڵی بەرەوڕوو بووە. ئەو خۆی بە گێل و گەمژە هاتە بەرچاو و بڕیاری دا هەر کارێکی بیلێتسکی دەیکات ئەویش بیکات. بیلێتسکی بە شێوەیەکی ئاسایی و زۆر بە قوڕساخی و خاترجەمییەوە چوو بۆ لای

مێزەکە. پەرداخێکی شەڕاب بە خۆشیی ئوستینکا هەڵدا و داوای لە ئەوانی دیکەش کرد بخۆنەوە. بەڵام ئوستینکا گوتی کە کچەکان شەڕاب ناخۆنەوە.

لە نێو کۆڕی کچەکاندا دەنگێگ گوتی: «بە هەنگوینەوە بیخۆن.»

هەر لەو کاتەدا خزمەتکارەکەی ئۆلێنین بە شیرینی و هەنگوینەوە خۆی کرد بە ژووورێدا. کچەکان بانگیان کرد بۆ لای خۆیان. ئەو بە سەرنجێکی ئاوێتەی ئاوات و سووکایەتییەوە لە ئاغاکانی ڕوانی کە بە بڕوای ئەو خەریکی عەیش و نۆش و ڕابواردن بوون، پاشان بە هێواشی بەستەکەی لەسەر مێزەکە دانا کە لە کاغەزێکی خۆڵەمێشین پێچرابوو. بەستەکە پڕ بوو لە هەنگوین و شیرینی. خزمەتکارەکە دەیویست سیایی کڕینی شیرینییەکە بدات بە ئۆلێنین، بەڵام بیلێتسکی لە ژوورەکە کردیە دەرێ. بیلێتسکی پەرداخەکانی پڕ کرد لە چیخیر و پاشان هەنگوینی تێکەڵ کردن و شێواندی، هێندێکی شیرینی لەسەر مێزەکە دانا، کچەکانی بە زۆر لە سووچی ژوورەکەوە هێنا بۆ نێوەڕاست. ئەوانی لە پشت مێزەکە دانا و خۆی دەستی کرد بە دابەش کردنی شیرینییەکان. ئۆلێنین دەستی ئەسمەرەی ماریانکای دی کە دوو دانە نوقڵی نەعنایی و یەک شیرینیی قاوەیی هەڵگرت، بەڵام نەیدەزانی چی لێ بکا. سەرەڕای ئەوەی ئوستینکا و بیلێتسکی زۆربڵەییان دەکرد و هەوڵیان دەدا کۆڕەکە گەرم دابێنن، بەڵام قسەکانیان زۆر جاڕزکەر و بێتام بوو. ئۆلێنین تاقەتی نەمابوو، هەوڵی دەدا قسەیەک بکات، هەستی دەکرد سەرنجی وردبینانەی ئامادەبووانی بۆ لای خۆی ڕاکێشاوە و تەنانەت بۆتە ڕشقنجاڕی ئەوان و شەرمێونییەکەی کاریگەریی بووە لە سەریان. سوور دەبۆوە و هەستی دەکرد ماریانکا تووشی تەنگژەیەکی ناخۆش بووە. بیری کردەوە: «حەتمەن چاوەڕوانن پارەیان بدەمێ. چارەمان نییە. دەبێ زوو پارەیان پێ بدەین و بڕۆین!»

# بیست و چوار

بیلێتسکی ڕووی لەماریانکا کرد و گوتی: «چۆن تۆ کرێنشینەکەی خۆتان ناناسی؟»

ماریانکا لە ژێر پێلوویەوە لە ئۆلێنینی ڕوانی و گوتی: «خۆ ئەو بۆ تاقە جارێکیش سەری بە ماڵماندا نەکردووە، ئیتر چۆن دەبێ بیناسم؟»

ئۆلێنین بەو قسەیە داچڵەکی و سوور هەڵگەڕا. بێ ئەوەی بزانێ دەڵێ چی، گوتی: «من لە دایکت دەترسم. لە بیرتە ڕۆژی یەکەم کە هاتم بۆ ماڵتان، چ دەردێکی پێدام؟»

ماریانکا دای لە قاقای پێکەنین و گوتی: «بۆ؟ نەکا زۆر ترسابێتی!» پاشان چاوێکی لێکرد و ڕووی کرد بەولاوە.

لەو کاتەدا بوو کە ئۆلێنین هەموو دەموچاوە جوان و دڵڕفێنەکەی ماریانکای دی، چونکە پێشتر هەر کاتێک دەیدی، کچە لەچکەیەکی لە سەروچاوی هاڵاندبوو و تەنیا چاوی بە دەرەوە بوو. تازە بۆی دەرکەوت کە ماریانکا لەخۆڕا وەک جوانترین کچی ئاوایی ناوبانگی دەرنەکردووە. ئوستینکا کچێکی جوان بوو، خڕوخۆڵ و کورتەباڵا و ڕوومەتی دەتگوت بەفر و خوێنە، چاوەکانی شین و چکۆلە بوون و بەردەوام بزەیەک لێوە سوورەکانی نەخشاندبوو. هەمیشە پێدەکەنی و زۆریش چەنەوەر بوو. بەڵام ماریانکا جگە لەوەی جوان و شۆخوشەنگ بوو، خوێنشیرینیەکەشی زۆر دڵڕفێن و سەرنجڕاکێش بوو. جگە لەوەی باڵابەرز و لەبار بوو، شانوملی سپیوسۆڵ و مەمکی خڕ و توندی، چاوی ڕەش و گەورە و مژۆڵ و برۆی ڕەشتر، نیگای مێهرەبان و گەرم، ناسکی و سووریی لێوەکانی کە بە شیلەبزە وەک پەلکی گوڵ دەکرایەوە، سەرەڕای هەموو ئەو جوانییانە شکڵ و خەتی ڕوخساری زۆر پیاوانە و تا ڕادەیەک تووڕەی دەنواند. زۆر کەم

پێدەکەنی؛ کاتێک لێوی بە گوڵبزەیەک دەکرایەوە هۆش و ئیختیاری لە پیاو هەڵدەگرت و هیچ کەس نەیدەتوانی ئەو جوانی و بزە شیرینە ببینێ و تووشی دڵەکوتە نەبێ. کچەکان هەموویان جوان بوون، بەڵام هەموویان، ئۆلێنین و بیلێتسکی و تەنانەت خزمەتکارەکەشی کە شیرینی هێنابوو، خۆیان لە بیر چووبۆوە و لە ماریانکایان دەڕوانی. کاتێک ئاماژەیان بە کچەکانی تر دەکرد، مەبەستیان ماریانکا بوو. ماریانکا لە نێو ئەو کچانەدا دەتگوت مانگە دەوری بە ئەستێرە گیراوە، وەکوو مەلەکەیەکی جوان، لەخۆبایی و بێوێنەی دەنواند.

بیلێتسکی کە هەروا خەریکی چەنەوەری بوو و هەوڵی دەدا کۆڕەکە گەرم ڕاگرێ، کچەکانی ناچار دەکرد. چیخیر بۆ ئەوانی دیکە تێکەن و دەستبازیی لەگەڵ دەکردن. چەند جار سەبارەت بە جوانیی ماریانکا بە زمانی فەڕەنسی وشەی نەشیاوی لە دەم دەرپەڕی و ڕووی دەمیشی لە ئۆلێنین بوو، ئەوە هی تۆیە[٥٣] La votre. داوای لە ئۆلێنین دەکرد وەک ئەو هەڵسوکەوت بکات. ئۆلێنین جار لەگەڵ جار دڵی دەگیرا و بێتاقەت دەبوو، لە بیانوویەک دەگەڕا خۆی بدزێتەوە. لە ناکاو بیلێتسکی ڕایگەیاند کە ئوستینکا لە بەر دڵی ئەو، چیخیر بۆ میوانەکان تێدەکات و ماچیان پێکەش دەکا. ئوستینکا ڕازی بوو، بەڵام بەو شەرتەی وەک ڕێوڕەسمی زەماوەند دەورییەک بگێڕێ و پارەی بۆ دانێن. ئۆلێنین لە دڵی خۆیدا گوتی: «چ هەڵەیەکم کرد هاتم بۆ ئەم کۆڕە سووک و قێزەونە!» هەر لەو کاتەدا هەستا سەر پێ و ویستی بڕواتە دەرێ.

- دەچی بۆ کوێ؟

ئۆلێنین کە پێی وابوو دەتوانێ خۆی دەرباز بکات، گوتی: «دەمەوێ بچم تۆزێ تووتن پەیدا کەم.» بەڵام بیلێتسکی دەستی گرت و نەیهێشت بڕوات، بە زمانی فەڕەنسی گوتی: «من پارەم پێیە.»

ئۆلێنین بیری کردەوە: «نا، وا دیارە ڕێگای دەرباز بوونم نەماوە، دەبێ پارەکە بدەم.» هەر بۆیە شەرمەزار بۆوە کە ئەو ناشارەزاییەی خۆی دی.

---

٥٣ لە دەقی سەرەکیدا بە زمانی ڕووسی و فەڕەنسی هاتووە.

«بۆ ئەوەی بیلێتسکی دەیکا منیش نەیکەم؟ نەدەبوو بێم بۆ ئێرە، بەڵام ئێستا کە هاتووم، نابێ بەزم و خۆشییەکەیان لێ تێکدەم. دەبێ منیش وەک کازاخەکان شەراب بنۆشم.» یەک چاپۆڕای[٥٤] هەڵگرت و یەکبین نای بە سەریەوە. کچەکان، بە سەرسووڕمانێکی ئاوێتەی ترسەوە چاویان لێکرد. ئەم کارەی بە لای ئەوانەوە زۆر سەیر و نەشیاوی دەنواند. ئوستینکا دیسان جامی شەرابی دایە دەست ئۆلێنین و بیلێتسکی و هەریەکی دوو ماچی پێدان؛ لەگەڵ ئەوەی ئەو چوار سکەی کە بیلێتسکی و ئۆلێنین پێیان دابوو دەیخستە نێو دەورییەکەوە، گوتی: «بڕوانن کچەکان! ئێستا ڕابواردن دەستی پێکرد.»

ئۆلێنین ئیتر ناڕەحەت نەبوو. زمانی کرابۆوە. بیلێتسکی دەستیماریانکای گرت و گوتی: «دەی گوڵی جوان، ئێستا نۆبەی تۆیە شەرابمان بۆ تێکەی و ماچمان بدەیەی.»

ماریانکا دەستی بەرز کردەوە و لەگەڵ ئەوەی لێی ڕاسایەوە گوتی: «ئێستا پیشانت دەدەم چ ماچێکت دەدەمێ!»

دەنگێکی تر گوتی: «بەبێ پارەش دەکرێ باوەگەورە ماچ کەین.»

ئەو کچەی ئەو قسەی کردبوو هاتە بەردەمی و هێشتا دانەنەویبۆوە، بیلێتسکی باوەشی بە کەمەریدا کرد و گوتی: «ئەمەش زۆر جوان و ناسکە.» شەققەی لە ڕوومەتی کچە هێنا و مۆری ماچێکی تەڕی بە کولمە ناسکەکەیەوە نا، بەڵام لەگەڵ ماچەکەش چاوی هەر لە ماریانکا بوو و گوتی: «تۆ دەبێ تەنیا شەراب تێکەی. لە خێری ماچەکەت گوزەراین. وەرە میوانداری لە کرێنشینەکەت بکە.»

پاشان هەستا دەستی ماریانکای گرت و کێشای بۆ لای کورسییەکە و لە پاڵ ئۆلێنیندا داینیشاند. سەری کچەکەی گرت بۆ لای خۆی وەرسووڕاند و لەگەڵ ئەوەی هەردوو ڕوومەتە جوانەکەی ماچ کرد گوتی: «چەندە جوانە!»

---

٥٤ چاپۆڕا: پەرداخی دارین کە نزیکەی دوو لیتر دەبێ.

ماریانکا ئیتر پارێزگاریی لە خۆی نەدەکرد و دەستی هەڵنەدەهێناوە. بە بزەیەکی لەخۆباییانەوە سەری بۆ لای ئۆلێنین سووڕاند. بیلێتسکی دیسان گوتی: «چەندە کچێکی جوانە!»

ڕوانینی ماریانکا دیار بوو بەردەوام دەڵێ: «من چەندە جوانم!» ئۆلێنین بێ ئەوەی ئاگای لێ بێ، باوەشی بە ماریانکادا کرد و ویستی ماچی بکات، بەڵام ماریانکا بە توندی خۆی ڕاپسکاند و بیلێتسکی و تەواوی ئەو شەڕاب و شیرینییەی لە سەر مێزەکە بوو دای بە زەویدا و پرش و بڵاوی کردەوە؛ بە سەر مێزە بەلادا کەوتووەکەدا بازی دا وڕۆیشت بۆ لای وەجاخەکە. دەنگی قریشکە و پێکەنین ژوورەکەی داگرت. بیلێتسکی سرتاندی بە گوێی کچەکاندا و لە ناکاو هەموویان پێکەوە دەرپەڕین بۆ دەرێ و دەرگاکەیان داخست. ئۆلێنین و ماریانکا لە ژوورێ مانەوە.

ئۆلێنین لە ماریانکای پرسی: «بۆچی بیلێتسکیت ماچ کرد بەڵام من ماچ ناکەی؟»

ماریانکا لەگەڵ ئەوەی لێوی خوارێ و بڕۆی دەجووڵانەوە گوتی: «لەبەر ئەوەی پێم خۆش نییە، حاڵی بووی؟»

بە پێکەنینەوە گوتیشی: «ئەو، ئەو باوەگەورەیە.» پاشان چوو بۆ لای دەرگاکە، بە توندی لێیدا و هاواری کرد: چەتیوە شەیتانانە، بۆ ئەو دەرگایەتان داخستووە؟

ئۆلێنین لێی چووە پێشێ و گوتی: «قەیناکا، با دەرگاکە داخەن. با ئەوان لە دەرەوە بن، ئێمەش لە ژوورێ.»

ماریانکا نێوچاوانی گرژ کرد و پاڵی بە سینگی ئۆلێنینەوە نا و لە خۆی دوور خستەوە. جوانییەکەی وەهای دڵی ئۆلێنین داخورپاند کە هۆشی هاتەوە بەر خۆی و لە شەرمانا سوور هەڵگەڕا، بەپەلە ڕۆیی بۆ لای دەرگاکە و پاڵی پێوەنا.

ـ بیلێتسکی ئەو دەرگایە بکەوە. ئەو کارە گەوجانەیە چییە دەیکەی؟ بۆ دەتەوێ ئابڕووم بەری؟

ماریانکا سەرلەنوێ بەو زەردەخەنە شیرین و دڵڕفێنەیەوە گوتی: «لە من دەترسی؟»

ـ بەڵێ، لێت دەترسم. چونکە تۆش وەک دایکت تووڕە و بێڕەزای.

ـ تۆ وا چاکە هەر لەگەڵ ئیرووشکا بی، ئاوا بێ، کچان تۆیان خۆشدەوێ.

ئەو هەروا پێدەکەنی و لە نزیکەوە ڕاست چاوی لە چاوی ئۆلێنین بڕیبوو.

ئۆلێنین نەیدەزانی بڵێ چی. لە ناکاو گوتی: «ئەگەر بێم بۆ ماڵی ئێوە!»

ئەو لەگەڵ ئەوەی سەری دەلەقاند، گوتی: «ئەوە، ئەوە بابەتێکی ترە.»

لەو کاتەدا بیلێتسکی بە توندی پاڵی بە دەرگاکەوە نا و کردیەوە، ماریانکاش گورج دەرپەڕی و لە ئۆلێنین دوور کەوتەوە. ئەوەندە بە توندی هەڵات کە بەلەکی لە کەمەرەکەی درا.

ئۆلێنین لە دڵی خۆیدا گوتی: «ئەوەی تا ئێستا بیرم لێدەکردەوە چەندە گەوجانە بوو! ئەشق و فیداکاری و لووکاشکا. بەختەوەری تەنیا لە ڕێگایەکەوە بەدەستدێ. ئەو کەسەی بەختەوەرە، هەقی بە دەستە.» پاشان بە وزەیەکەوە کە خۆشی چاوەڕوانیی نەدەکرد، باوەشی بە ماریانکای شۆخوشەنگدا کرد و دەستی کرد بە ماچ کردنی ڕوومەتی ناسک و لێوە سوورەکانی. ماریانکا تووڕە نەبوو، بەڵام دای لە قاقای پێکەنین و هەڵات بۆ لای کچەکان.

کۆڕی شەونشینی بەم شێوە کۆتایی پێ هات. دایکی ئوستینکا کە لە کاری ڕۆژانە گەڕایەوە، دەستی کرد بە پرتەوبۆڵە و کچەکانی لە ماڵەکەی وەدەرنا.

# بیست و پێنج

ئـۆلێنین کاتێـک بەرەو مـاڵێ دەگەڕایەوە، بیـری کـردەوە: «بەڵـێ، ئەگەر تۆزێ هـۆش و ئیختیـارم لە دەسـت بدایە، لەوانە بـوو ئاشـق و شـەیدای ئەم کچە کـازاخە بـم.» هەر بەو خەیاڵەشـەوە لە جێگـاکەی خـزا؛ بەڵام لە خەیـاڵی خۆیدا پێـی وابـوو هەمـوو شـتێک بە زووتـرین کـات دوایـی پێـدێ و دەتـوانێ وەک جاران ژیانی خۆی دەست پێبکاتەوە.

بەڵام ژیـانی ڕابـردوو ئیتـر نەگەڕایەوە. پێوەنـدیی ئەو لەگەڵ ماریانکـا بە تەواوی گۆڕانی بە سەردا هاتبوو، ئەو دیوارەی لە نێوانیانـدا بـوو و لە یەکـی جیـا دەکـردنەوە، تێـک ڕووخـابوو. ئیتـر هەر کاتێـک ئـۆلێنین کـچەی دەدی چاکوخۆشـیی لەگەڵ دەکـرد و خـولکی دەکـرد بـۆ ژوورەکەی خـۆی. کاتێـک خاوەنمـاڵ بـۆ وەرگرتنـی کرێـی مـاڵەکەی چـوو بـۆ لای ئـۆلێنین و بـۆی دەرکەوت چەندە دەوڵەمەند و دەستودڵبازە، بانگهێشتنی کرد بۆ ماڵی خۆیان. دایکی ماریانکا بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازیی لێکرد و لەو شـەوە بە دواوە ئۆلێنین زۆربەی ڕۆژەکـان، چـایی عەسـرۆژەی لە لای ئەوان دەخـواردەوە و هەتا درەنگانێ لە ماڵی ئەوان دەمایەوە. هەوڵی دەدا لە گوندەکەدا، بە شێوەی ڕابـردوو هەڵسـوکەوت بکـات، بەڵام لە نـاخەوە گـۆڕانی بە سـەردا هـاتبوو. ڕۆژانە لە بەیانییەوە هەتا ئێوارە لە دارستانەکە دەمـایەوە و نـزیکەی سـەعات هەشت، کاتی ئاوابوونی خۆر، بە تەنیا یان لەگەڵ مامە ئیرووشکا دەگەڕایەوە بۆ لای خانەخوێکەی. ئەندامانی بنەماڵەی ماریانکا، وەها خوویان پێگرتبـوو و خۆشیاندەویست کە کاتێک ئەویـان لە نێوان خۆیانـدا نەدەدی بە دڵ تاسـەیان دەکـرد. ئۆلێنین زۆر دەسـتودڵبازانە پـارەی شـەڕابەکەی دەدا. هێمنـایەتییەک ڕۆحـی داگرتبـوو. ژانـۆ چـایی بـۆ لێدەنا. ئـۆلێنین لە سـووچی ژوورەکە و لە نزیـک ئوجـاخەکە دادەنیشـت. پیرێـژن خـۆی بە کارەکـانی خـۆیەوە سـەرقاڵ

دەکرد و کاتێک بۆ خواردنەوەی چایی و چیخیر دادەنیشتن، سەبارەت بە کازاخەکان و جیرانەکانیان قسەیان دەکرد. ئۆلێنین باسی ڕووسیای بۆ دەکردن و ئەوانیش لەو بارەوە پرسیاریان لێ دەکرد. هێندێ جار کتێبێکی بە دەستەوە دەگرت و بە هێواشی خەریکی خوێندنەوەی دەبوو. ماریانکا وەک ئاسکی سڵ لە سەر وەجاخەکە چوارمەشقی دادەنیشت یان لە سووچی تاریکی ژوورەکە ئەژنۆی لە باوەش دەگرت. ئەو نەدەپەڕییە نێو قسەکان، بەڵام ئۆلێنین چاوی لە سەر ڕوخساری جوان و بە شیلەبزە نەخشاوی هەڵنەدەگرت. بە وردی چاوی لە هەڵسوکەوتی دەکرد. گوێی لە قرتەی ترووکاندنی توو گوڵەبەڕۆژەکەی دەبوو، هەستی دەکرد کاتێک قسە دەکا، ماریانکا بە دڵ و بە گیان گوێی شل دەکات و کاتێکیش خەریکی خوێندنەوەیە، هەست بە بوونی دەکا. ئەو وەختانەی خۆی دەشاردەوە ئۆلێنین وای دەنواند کە بە تەواوی دڵی لە لای وتەکانی دایکی ماریانکایە، گوێی بۆ دەنگی هەناسەکێشان و هەموو هەڵسوکەوتی ڕادەگرت و چاوەڕوانی سەرنجێکی ئەو بوو. هێندێ جار کاتێک ئۆلێنین دەچوو بۆ ژووری خاوەنماڵەکەی، ماریانکا هێشتا نەگەڕابۆوە بۆ ماڵێ، لە ناکاو ترپەی پێی دەهات و لە کەلێنی دەرگاکەوە کراسە شینە درێژەکەی وەدیار دەکەوت. ماریانکا هەتا نێوەڕاستی ژوورەکە دەهاتە پێشێ و چاوی لە ئۆلێنین دەکرد. بزەیەکی شیرین و پڕ لە دڵۆڤانی لە چاوانیدا دەبیندرا و هەستێکی ئاوێتەی شادی و ترس سەرتاپای ئۆلێنینی دادەگرت. ئۆلێنین هیچ چاوەڕوانییەکی لە ئەو نەبوو. هیچ شتێکی لە ئەو نەدەویست. بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ زیاتر هەستی دەکرد کە پێویستی بە دیتنی ئەو شۆخە بەدەوەیە.

ئۆلێنین وەها تێکەڵ ژیانی گوند بووبوو و خووی پێگرتبوو، کە ڕابردوو بە تەواوی لە داڵغەیدا کاڵ بووبۆوە و داهاتووش هەروا. بەتایبەت لە دەرەوەی ئەو دنیایەدا کە ئەو تێیدا دەژیا، هیچ چەشنە حەز و خۆشییەک نەبوو. کاتێک نامەیەکی لە خزم و هاوڕێیانی بە دەست دەگەیشت و بۆی دەردەکەوت کە بۆ حاڵی ئەو بەداخن و وەک کەسێکی فەوتاو و

لەدەستچووی دەهێننە ئەژمار، دەتگوت چەقۆ بە جەرگیدا دێنن؛ چونکە ئێستا ئەو بوو کە تەواوی ئەو کەسانەی بە فەوتاو دەزانی کە لە دەرەوەی ئەو گوندەدا دەژیان و ژیانێکی دیکەیان هەبوو. ئۆلێنین بە گیان و دڵ هاتبووە سەر ئەوەی کە لە ژیانی ڕابردووی خۆی دابڕێ و پێ بنێتە نێو ژیانێکی نوێ و دوورەپەرێزەوە کە جێگای هیچ چەشنە پەشیمانییەک نەبوو. ئەو کاتانەی کە ئەرکێکی سەربازیی پێ دەسپێردرا یان لە پاسگا دەمایەوە، زۆر دڵخۆش بوو. بەڵام کاتێک هەستی بە چێژی شیرینی ژیان دەکرد کە شان بە شانی ئیرووشکا دەچوو بۆ ڕاو یان لە نێو دارستانەکە و کۆخی بەردینی ئەوپەڕی گوندەکە دادەنیشت، یان بەتایبەت ئەو کاتانەی لەگەڵ بیرەوەریی ماریانکا و لووکاشکا دەژیا. لەو کاتانەدا بوو کە شوێنی پڕ لە درۆ و دۆلاب و دەهۆی بە ڕوونی دەهاتە بەرچاو کە پێشتر تێیدا ژیابوو. ئێستا نەک لەو شوێنە و لەو چەشنە ژیانە بێزار بوو، بەڵکوو ئەو بارودۆخەی ڕابردووی زۆر قۆڕ و بێمانا دەهاتە بەرچاو. لەم گوندەدا ڕۆژ لە دوای ڕۆژ خۆی ئازادتر و ئینسانتر دەهاتە بەرچاو و ژیان بە لایەوە شیرین و پڕمانا دەبوو. قەفقاز لە بەرچاوی بە شێوەیەکی دیکە خۆی دەنواند و ئەو شتە نەبوو کە پێشتر بیری لێدەکردەوە. هیچ شتێکی ئەم ناوچە و مەڵبەندە شێوەی ئەوە نەبوو کە پێشتر دەیهێنایە بەرچاوی یان خوێندبوویەوە و بیستبووی. پێی وابوو: «نە کڵاوی لمەدی هەیە، نە هەڵدێر، نە ئامالاتبەگ و نە پاڵەوان و پیاوکوژ و نە چەتە و ڕێگر. خەڵکی وەک سروشت دەژین؛ لە دایک دەبن، پێکەوە شەڕ دەکەن، دەخۆن و دەخۆنەوە، شادی دەکەن و دەمرن. ژیانی ئەوان ڕاست وەک ئەو وزەیە وایە کە سروشت سەپاندوویەتی بە سەر هەتاو و گیاوگژ و ئاژەڵ و دارەکاندا. هەر ئەوەیە و هیچ یاسا و ڕێسایەکی تر بوونی نییە...»

هەر بەو هۆکارەوە بە هەڵسەنگاندنی خۆی لەگەڵ خەڵک، ئەوانی وەک کەسانێکی جوان و بەهێز و ئازاد دەهاتە بەرچاو. کاتێک چاوی لێ دەکردن، خەم دایدەگرت و هەستی بە شەرمەزاری دەکرد. زۆر جار ئەو ئاواتە لە

ناخیدا سەری هەڵدەدا کە دەست لە هەموو شتێک بەردا! واز لە نەژادی خۆی بێنێ و ببێتە کازاخ، ماڵێک و چەند سەر ئاژەڵ بکڕێ، لەگەڵ کچێکی کازاخ زەماوەند بکات، بەڵام ئەو کچە ماریانکا نەبێ، چونکە ئەوی بۆ لووکاشکا دانابوو. لەگەڵ مامە ئیرووشکا ژیان ڕابوێرێ. لەگەڵ ئەو بچێ بۆ ڕاو، ماسی بگرێ و شان بە شانی کازاخەکان شەڕ بکات. لە خۆی دەپرسی: «بۆ ئەو بڕیارە نەدەم؟ چاوەڕوانی چیم؟» هەر لەو کاتەدا ورەی وەبەر خۆی دەنا و خۆی سەرکۆنە دەکرد: «ڕەنگە لەو بڕیاردانە بترسم و بە کارێکی باش و ماقووڵانەی نەزانم؟ یان ڕەنگە پێم وابێ ئاواتی بوونە کازاخ و ژیان لە باوەشی سروشتدا، ئازار بە خەڵک نەگایاندن و تەنانەت چاکە کردن لەگەڵ هەمووان، باش نییە! یانی ئەم خولیایانە لە خولیاکانی ڕابردووی من، خولیای بوونە وەزیر و سەرهەنگ، قۆڕ و گەوجانەترە؟» بەڵام دەنگێک لە ناخەوە پێی دەگوت پەلە نەکات و جارێ بڕیار نەدات. هەستێکی نادیار بووبووە بەربەستی سەر ڕێگاکەی و پێی دەگوت کە هیچ کات ناتوانێ وەک لووکاشکا و مامە ئیرووشکا بژی. چونکە بەختەوەریی ئەو لە شوێنێکی دیکەیە. بڕوادار بوون بەوەی کە بەختەوەری لە گیانفیداییدایە، وای لێکردبوو نەتوانێ بڕیار بدات. هەڵسوکەوتی لەگەڵ لووکاشکا بۆ ئەو مایەی خۆشحاڵی بوو و بەردەوام بە دوای بارودۆخێکدا دەگەڕا کە خۆی لە ڕێگای خەڵکیدا بەخت بکات و ئەو بارودۆخەش هیچ کات هەڵنەدەکەوت. هێندێ جار، ئەو تۆزە بەختەوەرییەش کە پێشتر بە دەستی هێنابوو، لە بیری دەچۆوە و هەستی دەکرد دەتوانێ ژیانی خۆی لەگەڵ ژیانی مامە ئیرووشکا تێکەڵ بکات. بەڵام پاشان، لە ناکاو وەخۆ دەهاتەوە و خەیاڵی فیداکارییەکی ئاگادارانە، سەرتاپای دادەگرت و لەوانە بوو لەبەریەکی بەرێ، هەر لەو کاتەدا وزەی ئەو خەیاڵە وای لێدەکرد، بە وردی بڕوانێتە هێمنایەتی و غورووری خەڵک و بەختەوەرییەکانیان.

# بیست و شەش

بەر لە کاتی دروێنە و خەرمان هەڵگرتن، لووکاشکا بە سواری ئەسپ هات بۆ سەردانی ئۆلێنین. لە هەموو کاتێک شاد و بەکەیفتر بوو. ئۆلێنین بە ڕوویەکی خۆشەوە پێشوازیی لێکرد و لێی پرسی: «دەی برام، کەنگێ زەماوەندەکە ساز دەکەی؟»

لووکاشکا ڕاست و ڕەوان وەڵامی نەدایەوە و قسەکەی گۆڕی.

ـ دەزانی چی؟ من ئەسپەکەی ئێوەم بە ئەسپێکی ئەوبەری ڕووبارەکە گۆڕییەوە. چاوی لێکە چەند ئەسپی چاکە! لە ڕەگەزی کاباردایە. داغی لۆڤی پێوەیە. من زۆر باش لە ئەسپ دەگەم.

پاشان هەردووکیان دەستیان کرد بە پشکنین و چاولێکردنی ئەسپەکە و لە نێو حەوشەکەدا تاقییان کردەوە. لە ڕاستیدا یەکسمێکی کەم وێنە بوو. ئەسپێکی کوێتی یەختەکراو، بریقەدار و یالوبژ درێژ، کلکی پڕ و نەرم، دیار بوو نێرگزەی کلکی قەمچ کراوە، بۆیە قیت و پڕژ وەک تاڤگەیەکی قەتران داچۆڕابوو. دیار بوو زۆر لەوەڕیوە کە ئاوا چوار هەنگڵ بووە. لووکاشکا گوتەنی دەتتوانی لە سەر پشتی ڕاکشێی. سم و چاو و گوێچکە و لمبۆزی هەمووی جوان و کەم وێنەی دەنواند و دیار بوو ڕەسەنە. ئۆلێنین زۆری تاریف کرد. ئەو تا ئێستا لە قەفقاز ئەسپێکی ئاوای نەدیتبوو. لووکاشکا دەستێکی بە یالی ئەسپەکەدا هێنا و گوتی: «ئەگەر بزانی چەندە گورج و نەرم غار دەدا! دەستێک و لاقێکی پێکەوە هەڵدێنێتەوە! هێندە زیرەک و کەوییە خۆی بە دوای خاوەنەکەیدا دەڕوا.»

ئۆلێنین گوتی: «زۆرت باقی داوەتەوە؟»

لووکاشکا زەردەیەکی گرت و گوتی: «پارەم نەداوە، یەکێک لە هاوڕێیانم بۆی هێناوم.»

ئۆلێنین گوتی: «بەڕاستی سەیرە. بە چەندی دەفرۆشی؟»

ـ سەد و پەنجا سکەیان پێداوم، بەڵام نەمفرۆشت. بەڵام بۆ ئێوە هیچم ناوێ، هەرئاوا پێشکەشە. هەر ئەوەندە بفەرمووی دەتەوەێ، من پێشکەشتانی دەکەم. ئێستا زینەکەی لێ دادەماڵم. ئێوەش لە جیاتی ئەوە بۆ کاتی خزمەت ئەسپێکی دیکەم بدەنێ.

ـ نا، زۆر سپاس، لێت وەرناگرم.

ـ باشە، من بە پێشکەشیم[55] بۆ هێناوی، پێشکەشییە. پاشان کەمەربەندەکەی کردەوە و یەکێک لەو دوو خەنجەرەی کە پێوەی هەڵواسیبوو، دای بە ئۆلێنین و گوتی: «من ئەوەم لەوبەری چۆمەکە بە دەست هێنا.»

ـ زۆر سپاس.

ـ دایکیشم بەڵێنی داوە خۆی ترێت بۆ دێنێ.

ـ پێویست بە زەحمەت ناکا. ئێمە ئیتر هیچ حیسابێکمان پێکەوە نییە. خۆ پارەی خەنجەرەکەت ناوێ، ها؟

ـ نا، نا! ئێمە پێکەوە هاڕێین! قیریخان کە خەڵکی ئەوبەری ڕووبارەکەیە، منی برد بۆ ساکلیای[56] خۆیان و گوتی: هەرچیت دەوێ هەڵگرە. منیش ئەم خەنجەرەم هەڵگرت. ئەوە دابونەریتی وڵاتی ئێمەیە.

ئۆلێنین و لووکاشکا چوونە ژووری و دەستیان کرد بە شەڕاب خواردنەوە. ئۆلێنین لێی پرسی: «دەی، کەوایە تۆ لێرە دەمێنیەوە؟»

ـ نا، من بۆ خوداحافیزی هاتووم. منیان کردۆتە ڕاسپاردەی یەک سۆقنیا[57] کە لەوبەری تەرەک هەڵکەوتووە. ئەمڕۆ لەگەڵ ناسایری هاوڕێم وەڕێدەکەوم.

ـ ئەی زەماوەندەکەت دەبێ بە چی؟

---

٥٥ پێشکەش، لە دەقی ڕووسییەکەشیدا هەر ئەو وشەیە نووسراوە.ل

٥٦ ساکلیای: ماڵ

٥٧ لە هەنگی کازاخەکاندا، یەکەیەکی سەربازییە

لووکاشکا بە پێچەوانەی ویستی خۆی گوتی: «بۆ شیرینی خواردن و دیاری کردن زوو دەگەڕێمەوە. پاشان دەچمەوە سەر خزمەتەکەم.

ـ چۆن؟ تۆ ناتەوێ چاوت بە دەزگیرانەکەت بکەوێ؟

ـ ئاوایە ئیتر. بۆ دەبێ چاوم هەر لە دەزگیرانەکەم بێ. هەرکاتێک ڕێت کەوتە ئەوبەری چۆمەکە لەو گوندەی ئێمە سۆراخی لووکاشکاه حەیتە بگرە. نازانی چەندەی بەراز لێیە. من دوو دانەم ڕاو کردووە، ئێوەش ڕێنوێنی دەکەم.

ـ باشە خوداحافیز. حەزرەتی مەسیح ئاگادارت بێ.

لووکاشکا سواری ئەسپەکەی بوو، بێ ئەوەی بچێ بۆ لای ماریانکا، بە وێرغە ئەسپەکەی بردە کۆڵان، کە ناسایر لەوێ چاوەڕوانی بوو. ناسایر ئاماژەی بەماڵی ئیانکا کرد، چاوێکی قرتاند و گوتی: «دەی، مەگین ناچین بۆ ئەوێ؟»

لووکاشکا وەڵامی دایەوە: «ئەرێ، ئەرێ، دەچین! ئەم ئەسپەی من ببە بۆ ئەوێ. ئەگەر من درەنگ هاتم، ئالیکی بدەیە با تێر بێ. سبەینێ بەیانی خۆم دێم بۆ گوندەکەی ئەوبەر.»

ـ یۆنکەر[58] ئیتر هیچی پێ نەدای؟

لووکاشکا لەگەڵ ئەوەی بازی دایە خوارێ و هەوسارەکەی دایە دەستی ناسایر، گوتی: «نا، خودا ڕوحمی کرد بە خەنجەرێک ڕازیم کرد، دەنا خەریک بوو ئەسپەکەم لێ بستێنێ.»

پاشان لووکاشکا بە بەر پەنجەرەی ژوورەکەی ئۆلێنیندا بە ماتەماتە ڕۆیشت بۆ حەوشەی خاوەنماڵەکە و چووە بەر پەنجەرەی ژوورەکەیان. هەوا بە تەواوی تاریک بووبوو. ماریانکا بە کراسی خەوەوە، خەریک بوو قژی شانە دەکرد. کازاخی لاو بە سرتەسرت گوتی: «ماریانکا، منم!»

ماریانکا سەرەتا خۆی گێل کرد. بەڵام هەرکە ناوی خۆی بیست، تا ڕادەیەک پەشۆکا. شاد و ترساو دەربیجەکەی کردەوە و خۆی دانەواند.

---

٥٨ قوتابیی فێرگەی سەربازی. مەبەستی ئۆلێنین بوو.

ـ چییه؟ لێره چ دەکەی؟

لووکاشکا گوتی: «پەنجەرەکە بکەوه با بێمه ژووری. ئەگەر بزانی چەنده وەڕەزم. خەریکه شێت بم.» پاشان سەری ماریانکای گرت و دەمی به ڕوومەته نەرم و ناسکەکەیەوه نا و ماچی کرد. گوتیشی: «ده بیکەوه دەی!»

ـ خۆت شێت مەکه، چۆن شتی وا دەبێ؟ نایکەمەوه! دەی پێم بڵێ، کەنگێ دەگەڕێیەوه؟ زۆرت پێدەچێ؟

لووکاشکا وەڵامی نەدایەوه و دیسان ماچی کردەوه. ئەویش ئیتر پرسیاری لێ نەکرد. لووکاشکا به سرته گوتی: «بەزیاد نەبێ، لەو دەربیجه چکۆلەیەوه ناتوانین به جوانی یەکتری ماچ بکەین.»

دایکی لووکاشکا لەوسەری ژوورەکەوه دەنگی هەڵبڕی: «ڕۆڵه ماریانکا گیان، لەگەڵ کێ قسه دەکەی؟»

لووکاشکا بۆ ئەوەی ژنه نەیبینێ، کڵاوەکەی له سەری داگرت و له بن دیوارەکەدا خۆی مەڵاس دا. ماریانکا به دەنگێکی نزم گوتی: «لووکاشکا زوو برۆ،» پاشان وەڵامی دایکی دایەوه: «دایەگیان لووکاشکا هاتبوو، کاری به باوکم بوو.»

ـ دەی باشه کچم، پێی بڵێ بێته ژووری.

ـ ڕۆیشت، دەیگوت وەختێکی تر دێمەوه.

لووکاشکا به هەنگاوی سووک و به کۆمەکۆمه به نێو حەوشەکەدا تێپەڕی، به سەر تەیمانەکەدا بازی دا و چووه کۆڵان. لەوێشەوه گورج هەڵات و خۆی گەیانده ماڵی ئیانکا؛ بەڵام ئۆلێنین چاوی پێی کەوت. دوای ئەوەی لووکاشکا و ناسایر دوو چاپۆڕایان چیخیر خواردەوه، سواری ئەسپەکانیان بوون له گوندەکه وەدەرکەوتن. شەوێکی تاریک و کپ و شێدار بوو. لووکاشکا و ناسایر بێ ئەوەی قسه بکەن شان به شانی یەک دەڕۆیشتن و تەنیا خرمەی پێی ئەسپەکانیان دەهات. لووکاشکا تێی هەڵکرد له گۆرانیی منیگالی کازاخ، بەڵام بەر له تەواو کردنی بەندی یەکەم، بێدەنگ بوو، سەری بۆ لای ناسایر وەرسووڕاند و گوتی: «نەیهێشت بچمه ژوورەکەی.»

ناسـایر وەڵامـی دایەوە: «ئەهـا، دەمزانـی. ئیانکـا پێـی گـوتم کە یـۆنکەر وردەوردە پێی بۆ مـاڵی ئەوان کراوەتەوە. مـامە ئیرووشـکاش زۆر بە خـۆی دەنــازی کە ماریانکــای داوە بە یــۆنکەر و لە جیــاتی ئەو کــارابینێکی لــێ وەرگرتووە.»

لووکاشـکا بە تـووڕەیییەوە گـوتی: «درۆ دەکـا پیرەسـەگ! ماریانکـا بـۆ فرۆشتن نابێ. هەرئێستا دەچم پێستی سەری دادەماڵم.»

پاشــان دەســتی کــرد بە چڕینــی گــۆرانییەک کە زۆری حەز لێـدەکرد و هەمیشە دەیگوتەوە:

**لە گەڕەکی ئیسماعیلوو،**

**لە باخی ڕازاوەی تێزار،**

**هەڵۆیەکی سپی فڕی،**

**ڕاوچییەکی لاو وەدووی کەوت،**

**داوای لە هەڵۆکە دەکرد لە سەر دەستی ڕاستی ئەو بنیشێتەوە.**

هەڵۆی سپی وەڵامی دایەوە:

**«تۆ نەتتوانی لە نێو ڕکەی ئاڵتوونیدا بەندم بکەی،**

**توانات نەبوو لە سەر دەستی ڕاستی خۆشت بمپارێزی،**

**ئێستاکە من دەفڕم بە سەر دەریای شینا**

**دەچم تاکوو قوویەکی سپی ڕاو کەم و**

**تێر بم لە گۆشتە ناسکەکەی.»**

# بیست و حەوت

خاوەنماڵەکەی ئۆلێنین ڕێوڕەسمی شیرینی خواردنی وەڕێخستبوو، لووکاشکا هاتبۆوە بۆ گوند بەڵام نەچووبوو بۆ لای ئۆلێنین. ئۆلێنینیش بانگهێشتنەکەی ملازم دووهەمی قەبووڵ نەکردبوو. هێندە دڵتەنگ و لەشداگیراو بوو لەو کاتەوە هاتبوو بۆ ستانیتسا هەستی بە کەسەرێکی ئاوا نەکردبوو. لای عەسر، لووکاشکای دی بە جلوبەرگی نوێوە لەگەڵ دایکی چوون بۆ لای خاوەنماڵەکەی و ئەو فیکرە زۆری ئازار دەدا: بۆچی لووکاشکا ئاوا لەگەڵی ساردوسڕە؟ ئۆلێنین دەرگاکەی لە خۆی پێوەدا و دەستی کرد بە نووسینی بیرەوەریی ڕۆژانە.

«لە ڕۆژانی ڕابردوودا زۆرم بیر کردۆتەوە و زۆریش گۆڕاوم، ئێستاش بەو شتە گەیشتووم کە لە کتێبی ئەلفوبێدا نووسراوە. بۆ بەختەوەری تەنیا شتێک پێویستە. خۆشویستن، خۆشویستن و فیداکاری، خۆشەویستیی هەمووان و تەپکەی ئەشق نانەوە بۆ ئەوەی هەرکەسێک حەزت لێبوو، پێوەبێ. بەم شێوەیە من و ژانۆ، مامە ئیرووشکا، لووکاشکا و ماریانکا پێکەوە کەوتووینە نێو ئەو داوەوە.»

ئۆلێنین کە گەیشتە ئێرە، مامە ئیرووشکا دەرگای کردەوە و هاتە ژوورێ. مامە ئیرووشکا، لە هەموو کاتێک زیاتر شاد و بەکەیف بوو. چەند ڕۆژ لەمەوبەر، ئۆلێنین چاوی پێی کەوتبوو لە حەوشە بە لای بەرازێکی کوژراوەوە دانیشتبوو خەریکی کەوڵ کردن و لەتوکوت کردنی گۆشتی بەرازەکە بوو. دەستەیەک سەگ و لەگەڵ ئەوان سەگە خۆشەویستەکەی خۆشی، لەولاوە وەرکەوتبوون و کلکەسووتێیان دەکرد. منداڵان لە پشت تەیمانەکەوە چاویان لێدەکرد و سەریان نەدەخستە سەری. جیرانەکان کە ڕێزیان بۆ دادەنا و وەک ڕیش‌سپیی گوندەکە چاویان لێدەکرد، هەریەکی

شتێکیان بۆ هێنابوو. یەکێک جەڕەیەک شەڕاب، یەکێکی تر قاپێک شیر و یەکی تر هێندێ ئاردی بۆ هێنابوو. ڕۆژی دوایی، مامە ئیرووشکا بە گیانی خوێناوییەوە، لە ماڵەکەی خۆی دانیشتبوو و گۆشتی تازەی بەرازی بەش بەش دەکرد. هەموو ئەوانەی ئارد و شەڕاب و شیریان بۆ هێنابوو، ئەویش گۆشتی پێدەدان. لە ڕوخسارێدا دەتتوانی ئەوە بخوێنیەوە: «نێوچاوانەکەم هێناویەتی و بەرازێکم ڕاو کردووە؛ ئێستا ئیتر مامە پیر و لەکارکەوتوو نییە.» شکی تێدا نییە هەر بەو هۆیە بوو کە شەڕابی دەخواردەوە و بێ ئەوەی لە گوندەکە بڕواتە دەرێ، چوارەمین ڕۆژ بوو بە سەرخۆشی ڕایدەبوارد. هەڵبەت لە کۆڕی شیرینی خواردنەکەشدا قوولەی بە شەڕاب خواردنەوە دەکرد.

مامە ئیرووشکا، مەست و کەلەلا لە ژووری خاوەنماڵەکەوە هات بۆ ژوورەکەی ئۆلێنین؛ سوور هەڵگەڕابوو، بە ڕیشێکی ئاڵۆزاوەوە، بەڵام بەشمیتێکی نوێی مەنگوڵەداری لە بەردا بوو و بالالایکایەکی[59] بە دەستەوە بوو کە دیار بوو لە قامیشەڵانەکەی ئەوبەری تەرەک بڕیویەتی.. ماوەیەک بوو بەڵێنیی بە ئۆلێنین دابوو نەهێڵ بێتاقەت بێ و ئێستا بە نەشە و هەستێکی تایبەتەوە هاتبوو بۆ لای. کە خۆی کرد بە ژووریدا و دیتی ئۆلێنین خەریکی نووسینە، نەشەی شکا، بە دەنگێکی کزەڵۆکانە، وەک ئەوەی مەکر بکات، لە بەردەمی ئۆلێنین ڕاوەستا، لە دڵی خۆیدا دەترسا بەو هاتنە لەناکاوەی ئۆلێنینی تووڕە کردبێ. گوتی: «مامە گیان، بنووسە، بنووسە!ـ پاشان هێواش و بەبێ خشپە لە سەر عەرزەکە دانیشت. مامە ئیرووشکا ئەو کاتانەی سەرخۆش دەبوو، حەزی دەکرد لە سەر عەرزی دانیشێ. ئۆلێنین سەری هەڵێنا و دەستووری دا شەڕاب بێنن؛ هەرخێراش دەستی کردەوە بە نووسین. خواردنەوەی شەڕاب بە تەنیا بۆ مامە ئیرووشکا خۆش نەبوو، هەستی بە لەش داگیران دەکرد. دەیویست قسە بکا. تۆزێ خۆی ئەمبارەوبار

---

٥٩ بالالایکا: جۆرێک دووزەلەیە

کرد و گوتی: «من له کۆڕی شیرینی خواردن بووم. گەمژەی هیچوپووچانە! لێیان بێزار بووم! هاتم بۆ لای تۆ.»

ئۆلێنین هەروا کە خەریکی نووسین بوو، لێی پرسی: «ئەو بالالایکایەت لە کوێ هێناوە؟»

مامە ئیرووشکا، بەو دەنگە کزەڵۆکانەیەوە گوتی: «من لەوبەری تەرەک بووم مامە گیان. لەوێ ئەم بالالایکایەم هێناوە. هیچ کەس وەک من ناتوانێ هەوای تورکی و کازاخیی ئەعیان پەسەند و سەربازی بژەنێ. هەرچۆنێکت بوێ بۆت لێدەدەم.»

ئۆلێنین دیسان سەری هەڵێنا، چاوێکی لە مامە ئیرووشکا کرد، زەردەیەکی گرت و دەستی کردەوە بە نووسین. ئەم زەردەیەی ئۆلێنین پیرەپیاوی هان دا و لە ناکاو بە دەنگێکی لێبڕاوانەوە گوتی: «گوێی مەدەیە مامە گیان! گوێی مەدەیە! سووکایەتییان پێکردووی، قەیناکا، گوێی مەدەیە و وا بزانە بای دێ! تف لە چارەی هەموویان! تۆش هەر خەریکی نووسینی، ئەم هەموو نووسینە چییە؟ بە کاری چی دێ؟»

پاشان بە نووکی قامکە ئەستوورەکانی لە تەرکی ژوورەکەی دەدا و بەو کارە دەیویست ئۆلێنین بیری ئاڵۆز بێت و نەتوانێ بنووسێ. دەموچاوی چەپوچیر دەکرد و دەمی خوار دەکردەوە، کارەکەی جۆرێک سووکایەتیی پێوە دیار بوو.

ـ ئەم هەموو ناڵە و سکاڵایە بە کەڵکی چی دێ؟ بڕۆ خۆش ڕابوێرە، بڕۆ بۆ سەیران، با ببی بە پاڵەوان.

ئیرووشکا پێی وا بوو نووسین تەنیا بۆ سکاڵا و ئازاردانی خەڵک بەکاردێ. ئۆلێنین دای لە قاقای پێکەنین. ئیرووشکاش پێکەنی و بە تەکانێک هەستایە سەر پێ و دەستی کرد بە ژەنینی هەوای تورکی. دوای ئەوەی هەوایەکی نەرمی ژەنی، گوتی: «پیاوی چاک نووسین بە کەڵکی چی دێ؟ گوێ بگرە من ئاوازت بۆ دەژەنم، هەتا ماوی پڕ بە دڵ گوێ بۆ مۆسیقا و

گۆرانی ڕاگرە، چونکە کاتێک دەمری، ئیتر گوێت لە هیچ ئاوازێک نابێ. وەرە با ساتێک بە خۆشی ڕایبوێرین.»

سەرەتا گۆرانییەکی گوت کە ئاوازەکەی خۆی دانابوو و لەگەڵ چڕینی گۆرانییەکەدا سەمای کرد:

**ئای لالای لالای لالای**

**لە کوێ ئەوت دیتووە؟**

**لە بازاڕ و لە دووکان**

**خەریک بوو دەرزیی دەکڕی**

پاشان گۆرانییەکی دیکەی دەست پێکرد کە ئاجوودانەکەی پێشووی فێری کردبوو:

**دووشەممە ئاشق بووم،**

**سێ شەممە هەناسەم هەڵکێشا،**

**چوارشەممە پێمگوت**

**پێنج شەممە چاوەڕوانی وەڵام بووم**

**هەینی وەڵامەکەی هات!**

**سووکنایی بە دڵم دا!**

**شەممەش ڕۆژی جێژنی فەتیر**

**بڕیارم دا ماڵئاوایی لە ژیان بکەم**

**بەڵام بۆ ڕزگار کردنی گیانی خۆم**

**یەک شەممە بڕیارم گۆڕی.**

سەر لەنوێ:

**ئای لالای لالای لالای**

**لە کوێ ئەوت دیتووە؟**

پاشان چاوێکی قرتاند و شانی هەڵتەکاند و بە سەما کردنەوە چەند هەنگاوی هەڵێنایەوە و دەستی کردەوە بە گۆرانی گوتن:

**لە ئامێزت دەگرم و ڕاتدەمووسم**

**پشتێنێکی سوورت لە پشت دەبەستم**
**تۆ ناو دەنێم هیوای گەورە و گرانم**
**تۆ ئەی هیوای هەموو ژیانم**
**ڕاستە تۆ خۆشت دەوێم؟**

ئیرووشکا هەروا سەمای دەکرد و گەرم داهاتبوو، شاد و بەنەشە بالالایکای دەژەنی، ئاوازی وەک ئای لالای لالای و ئاواری ئەعیان پەسەندی بۆ ئۆلێنین دەچڕی. بەڵام دوای ئەوەی سێ پەرداخی دیکەی چیخیر خواردەوە، کەوتەوە یادی سەردەمی زوو، بۆیە دەستی کرد بە چڕین و ژەنینی ئاواز و گۆرانیی ڕەسەنی کازاخی و تورکی. یەکێک لەو ئاوازانەش ئەو ئاوازە بوو کە بە دڵ دەیگوت و بەشێک لە ڕۆح و گیانی بوو. لە ناکاو دەنگی لەرزی و بێدەنگ بوو. بەڵام هەروا خەریکی ژەنینی بالالایکا بوو. سەری هەڵبڕی و گوتی: «ئاخ دۆستی بەڕێز!»

ئۆلێنین دەنگی گڕ و دڵپڕانەی ئیرووشکای بیست و سەری وەرسووڕاند. پیرەپیاو دەگریا، فرمێسک لە چاویدا قەتیس مابوو. فرمێسکی چاوی کەلاوڕێژی کرد و بە خوڕ بە ڕوومەتیدا هاتە خوارێ. بە کوڵ دەگریا و بە دەم قوڵپی گریانەوە دەیگوت: «ئای سەردەمی زووی ژیانم! تۆ ڕۆیشتی و ئیتر ناگەڕێیتەوە. لە ناکاو بە دەنگێکی نووساوەوە بێ ئەوەی فرمێسکی چاوی بسڕێ، دەنگی هەڵێنا: «شەڕاب، بنۆشە، بۆ نانۆشی!»

یەکێک لە خەماویترین ئاوازەکان بۆ ئیرووشکا، ئاوازێکی تاقلین[٦٠] بوو. ئەو ئاوازە وشەکانی کەم بوو، بەڵام تەواوی جوانییەکانی لەم سەربەندەدا گونجابوو: «ئاخ! ئاخ! مخابن!» ئیرووشکا ئاوازەکەی بەم شێوەیە وەرگێڕایەوە: «پاڵەوانێک مێگەلەکەی خۆی لە گوندەکەوە برد بۆ کوێستان. ڕۆمییەکان هێرشیان هێنا و گوندەکەیان سووتاند، تەواوی پیاوەکانیان کوشت و ژنەکانیان بە دیل گرت. پاڵەوان لە کوێستان گەڕایەوە. ئەو شوێنە کە جاران گوند بوو، ئێستا وێرانەیەکی وشک و کاتۆر و سووتاو بوو. نە

٦٠ تاقلین: یەکێک لە خێڵە چکۆلەکانی باکووری قەفقازە.

دایکی، نە براکەی و نە ماڵەکەیان؛ تەنیا تاقەدارێک بە پێوە مابوو. پاڵەوان لە ژێر دارەکە دانیشت و فرمێسکی هەڵوەراند. وەک تۆ تەنیا بوو، هەروا بە تەنیا مایەوە و گۆرانیی دەگوت: «ئاخ! ئاخ! مخابن!»

پیرەپیاو ئەم سەربەندە خەماوی و دڵتەزێنەی چەندین جار دووپات کردەوە. پیرەپیاو هەرکە دوایین سەربەندی چڕی، لە ناکاو تفەنگەکەی لە دیوارەکە کردەوە، بەپەلە هەڵات بۆ حەوشە و هەر دوو گوللەکەی پێکەوە تەقاند. پاشان خەمبارتر لە پێشوو دەستی کردەوە بە چڕینی: «ئاخ! ئاخ! مخابن!» دوای ئەوە بێدەنگ بوو. ئۆلێنین بە دوایدا هاتبوو بۆ سەر قاڵدرمەکان، چاوی لەولایەی ئاسمان بڕیبوو کە بە چەخماخەی گوللەکە درەوشابۆوە و ئەستێرە بە سەر سینگی ڕەشییەوە سریوەیان دەهات. شۆقی چەند چرا لە ژووری خاوەنماڵەکەیدا وەبەرچاو دەکەوت و چەند دەنگ دەهاتە گوێ. لە حەوشە کچان لە بەر قاڵدرمەکان و پەنجەرەکاندا کۆ بووبوونەوە و لە هەمارەکەوە دەچوون بۆ دالانەکە و دەهاتنەوە دەرێ. چەند کەس لە کازاخەکان لە ماڵێ هاتبوونە دەرێ و هەروا قرموقاڵیان وەڕێخستبوو و پێشوازییان لە دوایین بەندی گۆرانی و تەقە کردنی مامە ئیرووشکا دەکرد. ئۆلێنین پرسی: «دەی، ئەو شیرینی خواردنە چۆن بوو؟»

پیرەپیاو دیار بوو لە ژووری خاوەنماڵەکە قسەیەک لە دڵی گران هاتووە، گوتی: «قوڕ بە سەریان! خودا فەوتیان کا! من حەزم لەو جۆرە کۆڕانە نییە! بڕوانە چەند کەس هاتن! با بگەڕێینەوە بۆ ژوورەکەی خۆمان! واز لەوانە بێنە، با بچین بۆخۆمان کەیف بکەین.»

ئۆلێنین گەڕایەوە بۆ نێو ژوورەکەی: «دەی، ئەی لووکاشکا دەڵێ چی؟ ڕازییە؟ نایە بۆ دەیدەنیی من؟»

ئیرووشکا هەروا بە دڵپڕی گوتی: «لووکاشکا؟ شەیتان و شۆفار کۆڵێکیان درۆ و دەلەسە بۆ هەڵڕشتووە. گوتوویانە من دەمەوێ کچە بە تۆ بفرۆشم. مەگین ئەو کارە هێندە گرانە؟ ئەگەر بمانهەوێ و تۆ حەزت لێبێ، بە

دەست خۆمە؛ تۆ پارەم بدەیە و کارت نەبێ. بەڵێنی پیاوانەت دەدەمێ کارەکەت بۆ دەسازێنم.»

ـ نا، نا! ئەگەر ئەو خۆی دڵی بە منەوە نەبێ، پارە هیچ کارێکی پێ جێبەجێ نابێ. ئیتر لەو بارەوە قسەم لەگەڵ مەکە.

ئیرووشکا لە ناکاو دەنگی هەڵبڕی: «من و تۆ هیچ کەس خۆشی ناوێین و ددانی خێرمان پێدانانێ. چەندە بێکەس و پشت و پەناین.» ئەوەی گوت و دیسان دەستی کردەوە بە گریان. ئۆلێنین هەروا کە گوێی لە قسە و چیرۆکی پیرەپیاو گرتبوو، لە ڕادە بەدەر شەڕابی خواردبۆوە. بیری دەکردەوە: «چاکتر، ئێستا لووکاشکای من بەختەوەرە.» بەڵام ئەویش خەمبار بوو. ئەو شەوە پیرەپیاو هێندەی شەڕاب خواردەوە کە بێهۆش و کەلالا لە تەرکی ژوورەکەدا تخیڵ بوو. ژانۆ ناچار بوو چەند سەرباز بانگ بکات بۆ یارمەتی و پیرەپیاو بەرنەوە بۆ ماڵەکەی خۆی. لە ڕێگا ژانۆ هێندەی ڕق هەستابوو چەقۆت لێدایە خوێنی نەدەهات. هێندەی ئەو کارەی پیرەپیاو پێ ناحەز بوو تفی دەکردەوە و ئیتر یەک وشەی بە زمانی فەڕەنسی قسە نەدەکرد.

# بیست و هەشت

مانگی ئووت بە سەردا هاتبوو. چەند ڕۆژێک بوو پەڵەیەک هەور بە ئاسمانەوە نەدەبیندرا؛ هەتاو بە قرچە و کوڵەکوڵی خۆی بێبەزەییانە هەموو شتێکی دەسووتاند. لە بەیانییەوە بایەکی گەرم هەڵیکردبوو و غوبارێک لمی گەرم لە بارۆن[61] و جادەکان هەڵدەستا و بە سەر قامیشەڵان و دارستان و گوندەکاندا دەباری. گەڵای گژوگیا و دارەکان توێژێک تۆز و لمیان لێ نیشتبوو. ڕێگاکان و شۆرەکاتە ڕووت و پڕ قەڵشتەکان بە هۆی وشکییەوە لە ژێر پێدا قرچەیان دەهات، ماوەیەک بوو ئاوی تەرەک لە کەمیی دابوو، چەند گۆم و شوێنی مەند ئاوی تێدا مابوو و لە شوێنە خوڕێن و پاناوکەکان باریکاوێک ماریلەی دەکرد. هەسێڵی پڕ لە قوڕ و لیتە و قەوزەی گوندەکە هەمووی جێ سمی ئاژەڵ بوو. لە تەواوی ماوەی ڕۆژدا هەرا و هاواری کچان و کوڕان دەهاتە گوێ. لە ئیستیپ بنگەڕ و قامیشەڵانەکان وشک بووبوون و ئاژەڵەکان هەموو ڕۆژێ بە بۆڕەبۆڕ و باڕەباڕ هەڵدەهاتن بۆ نێو مەزراکان. دەبوو مێگەلەکان وردەوردە بەرەو لای هەوار و کوێستانەکانی ئەوبەری ڕووبارەکە بەرن و لەوێ بیانلەوەڕێنن. پوورەی مێشوولە، وەک هەوری ڕەش بە سەر گۆم و ئاوەڕۆی گوندەکانەوە لەنگەریان دەگرت. تەمومژێکی تەنک کوێستانە پڕ بەفرەکانی دادەپۆشی. هەواکەی قورس و بۆگەن بووبوو. دەنگۆ بڵاو بووبۆوە کە ئەبرەکەکان بە هۆی وشک بوونی ڕووبارەکەوە هاتوون بۆ ئەمبەر و ئێستا لەو دەوروبەرانە بۆسەیان ناوەتەوە. هەموو ئێوارەیەک خۆر لە ئاسۆیەکی سوور و ئاورین ئاوا دەبوو. وەرزی کاری قورس بوو. هەموو خەڵکی ئاوایی لە نێو ڕەز و بێستانەکانیاندا

٦١ بارۆن: تەپۆڵکی لم

سـەرقاڵی کـار بـوون. پـووش و بـابردەڵە بە دەم بـاوە ڕەپـێچەک دەدران و خۆیـان لە نێو شـیو و جۆگە و سـێبەری باخەکانـدا دەشـاردەوە و ئۆقرەیـان دەگـرت. هێشـووی قورسـی ترێـی گەیشـتوو لە ژێـر گەڵای پـان و بـریقەداردا ڕەش هەڵـدەگەڕان. لە قەراغ ڕێگـای پـڕ لە تـۆز و خـۆڵەمڕە چەنـد ڕەز و بـاخ هەڵکەوتبـوون کە سـەرتاپایان زەنـگەتە و هێشـووی ڕەشـی پێـوە بـوو. تەرزوتوولی ڕەزەکان هەتا سەر ڕێگاکە کشابوون و هێشووی پڕ ئاوی تـرێ لە ژێر تایەی عارەبانەکاندا دەفلیقانەوە. کوڕان و کچان کراسەکانیان بە شیلە و ئاوی ترێ خووسابوو و بە دەست و دەمی پڕ لە ترێوە بە دوای دایکیانـدا هەڵدەهاتن. کرێکارانی بەرگ شڕ قەرتاڵەی پڕ لە ترێیان دەخستە سـەر شـانە بەهێزەکانیـان و دەیـانبرد بـۆ نێـو عارەبانەکـان. ژنـانی بنەمـاڵە لەچکەیـان لە سەریان پێچابوو و گایەکانیان بە عارەبانەوە بەملا و بەولادا لێدەخوڕی. ئەو سەربازانەی کە لەسـەر ڕێگاکە تووشـی عارەبانەیەک دەبوون داوای ترێیـان دەکرد. پیرێژنی کازاخ هەروا کە عارەبانەکە دەڕۆیشت، پێدا هەڵـدەڕووچکا و باوەشـێکی تـرێ پێدەدان. ئێسـتا لە زۆربەی ماڵەکـان ترێیـان دەفلیقانـدەوە و بۆنی تڵتەی ترێ وڵاتی داگرتبوو. لە ژێر ساباتەکان، بانکەی پڕ لە ئاوی ترێ سـووری دەکـردەوە و دەتگـوت لێـوڕێژی خـوێنن. کرێکـارانی نووقـانی دەرەلینگی پانتۆڵەکانیـان هەڵکردبوو و بە لاقوقولی سـوور و شـیلاوییەوە بە نێو حەوشـەی ماڵەکانـدا هاتوچۆیـان دەکرد. بەرازەکـان نووڕەیـان دەهـات و تامەزرۆیانە تڵتەی ترێیان هەڵمەقووت دەکرد. سەربانی تەختی گەوڕەکـان بە هێشووی هەڵخراوی ترێ ڕەشی دەکردەوە و هێشـووە تـرێ لە ژێـر تیرێژی خۆردا چرچ هەڵـدەگەڕان. قەلەسـابوونە و قشـقەڕە گلارە ترێیـان بە دەنـووک هەڵـدەگرت و دەفڕین و لە سـەر گوێسـوانە و سـەربانەکان بە پۆل دەنیشـتنەوە و قاڕەیان دەهات. گوندنشینەکان، شـاد و دڵخۆش بەرهەمـی سـاڵێک زەحمەتـی خۆیان کۆ دەکردەوە و داهاتی ئەو ساڵەیان زۆر و زەوەند و بێوێنە بوو. لە نێو باخ و ڕەزەکاندا و لە نێو دەریای سەوزی گەلامێودا، لە هەمـوو لایەکەوە

دەنگی قاقاکێشان و گۆرانیی ژنان دەهاتە گوێ، کراسە ڕەنگاوڕەنگەکانیان لە نێو ئەو دیمەنە جوانەدا بووبوو بە کۆلکەزێڕینە و زۆر سەرنجڕاکێش بوو.

لای نیوەڕۆ ماریانکا کە لە باخەکەی خۆیان لە ژێر سێبەری دارەکۆخێک دانیشتبوو، هەستا چوو لە ژێر عارەبانەیەک خواردنی نێوەڕۆی بنەماڵەکەیانی دەرهێنا و هاتەوە بۆ ژێر سێبەری دارەکە. ملازم دووهەم کە لە فێرگەی سەربازی گەڕابۆوە بەرەوڕووی ئەو لە سەر دۆشەکچەیەک دانیشتبوو و بە ئاوی گۆزە دەستوپلی دەشۆرد. کوڕێژگەیەک، برای ماریانکا، کە تازە لە هەسێڵەکە هاتبووە دەرێ، سەروچاوی خۆی بە سەرقۆڵی کراسەکەی سڕی و چاوی هەر لە دایکی و خوشکی بوو، دیار بوو برسییەتی و چاوەڕوانە نانی نیوەڕۆ دانێن. زۆری مەلە کردبوو و ماندوویەتی خستبوویە هەناسەبڕکێ. دایکی ماریانکا قۆڵی هەڵکردبوو، ترێ و ماسیی خوێکراو و نان و نۆشکی لە سەر کورسییەکی گردی دارین و پێچکە کورت دانا. ملازم دووهەم دەموچاوی وشک کردەوە، کڵاوەکەی لە سەری داگرت و دوای ئەوەی خاچی خۆی کێشا، لە مێزی خواردنەکە نزیک بۆوە. کوڕە گۆزەکەی هەڵگرت و وەک سیوشکەهەڵاتوو قومی لە ئاوەکە دەدا. دایک و کچ لە بەر مێزەکەدا چوارمەشقی دانیشتن. تەنانەت لە بەر سێبەرەکەش ئەو گەرمایە ئازاری دەدان و لەگەڵ هاڵاوی گەرما بۆنێکی ناخۆش لە نێو باخەکەدا شەپۆلی دەدا. بای توند و پڕ هاڵاو کە بە نێو لکوپۆپی دارەکاندا تێدەپەڕی، هەواکەی فێنک نەدەکردەوە و تەنیا چڵەپۆپەی دارەکانی ڕادەوەشاند و خواری دەکردنەوە. داری کۆخ و هەرمێ و هەڵووژە بە دەم هاژەی بایەکەوە دەلەرزین. ملازم دووهەم دوای ئەوەی سەرلەنوێ دۆعایەکی خوێند، لە پشت خۆیەوە گۆزەیەکی پڕ لە شەڕابی لە ژێر بنجی گوڵەباخێک دەرهێنا و قومێکی لێدا و پاشان گۆزەکەی دایە دەست ژنەکەی. ملازم کراسێکی ساکاری یەخە ئاوەڵای لە بەردا بوو کە سینگە کوڵکن و پڕ ماسوولکەکەی بەدیار کەوتبوو. ڕوخسارە ناسک و عەیارەکەی شاد و بەکەیف دیار بوو. جۆری دانیشتن و دەنگی، هیچکام چکۆلەترین ئاکاری

دیپلۆماسیی ئاساییی ئەوی نەدەنواند. هەڵسوکەوتی زۆر بەدەماخ و سروشتی دیار بوو. هەروا کە خەریکی سڕینی ڕیشی شەڕاب پێداڕژاوی بوو، گوتی: «ئەمڕۆ بڵێی ئەو لایەمان بۆ تەواو بێ؟»

ژنەکەی وەڵامی دایەوە: «ئەگەر تۆزێ درەنگ دەست هەڵگرین، تەواو دەبێ. ماڵی دەمکین هێشتا کارەکەیان نیوەش نەبووە. ئەوەی کار دەکا، تەنیا ئوستینکایە و ئەویش بە تەنیا لەوە زیاتری لە دەست نایە.»

ملازم لووت بەرزانە گوتی: «ئەوان هێشتا نەگەیشتوونە ئەو سەرە.»

دایکیماریانکا گۆزە شەڕابەکەی بۆ لای کچەکەی بردە پێشێ و گوتی: «هانێ، ماریانکا گیان، بخۆوە، چاکە شوکور بۆ خودا پارەی زەماوەندەکەی تۆش دەستەبەر بوو.»

ملازم تۆزێ نێوچاونی تێکنا و گوتی: «جارێ زۆری ماوە!»

ماریانکا سەری داخست. دایکی گوتی: «کوا زۆری ماوە؟ ئەو کارە ئیتر تەواو بووە و زۆریشی نەماوە بۆ کاتی زەماوەندەکە.»

ملازم دیسان گوتی: «جارێ پەلەی لێ مەکە! جارێ تەنیا دەبێ کار بکەین.»

ژنە لێی پرسی: «ئەسپە تازەکەی لووکاشکات دیوە؟ ئەوەی کە دیمیتری ئاندرێڤیچ پێی دابوو، لووکاشکا بە دڵی نەبوو. ئێستا لەگەڵ دانەیەکی دیکە گۆڕیویەتەوە.»

ـ نا نەمدیوە. بەڵام ئەمڕۆ لەگەڵ نۆکەری کرێنشینەکەمان قسەم کرد. دەیگوت دیسان هەزار ڕۆبڵیان بۆ دیمیتری ئاندرێڤیچ ناردووە.

ژنە قسەی مێردەکەی پشت ڕاست کردەوە و گوتی: «زۆر ساماندارە، خوداپێداوە بەڕاستی.»

هەموو ئەندامانی بنەماڵەکە شاد و ڕازی بوون. کارەکەیان بە باشی دەچووە پێشێ. باخە مێوەکەیان قوڕی پێوەدابوو و داهاتی ئەمساڵیان هێندە باش بوو کە قەتیان ئەو چاوەڕوانییە لێی نەبوو. ماریانکا دوای ئەوەی نانەکەی خوارد، هێندێ گیای کردە بەر گایەکان، بەشمیتەکەی خۆی قەد کرد

نایە ژێر سەری و لە بن سێبەری عارەبانەکەدا، لە سەر گیاوگژی شێدار ڕاکشا. تەنیا سوورۆچکایەکی بە خۆیدا دابوو. لەچکەیەکی هەوریشمینی بە سەردا دابوو و کراسێکی پەمۆی شینی لە بەردا بوو کە داوێنی ئەویشی هەڵدابۆوە. دیار بوو زۆری گەرمایە، دەموچاوی دەسۆڵایەوە، لاقی لە ژێر سێبەرەکەدا جێی نەدەبۆوە و چاوەکانی بە هۆی خەو و شەکەتییەوە قورس بووبوون. لێوی بێ ئیختیار دەکرایەوە و سینگی بە قورسی هەڵدەستا و دەنیشتەوە. پازدە ڕۆژ بوو کار دەستی پێکردبوو و کچە بەبێ وچان کاری دەکرد و ئەرکێکی تاقەتپڕووکێن کەوتبووە سەر شانی. کەڕەی بەیانی، لە خەو هەڵدەستا، بە ئاوی سارد دەموچاوی دەشۆرد، لەچکەکەی لە سەری دەپێچا و بە پێخاوسی هەڵدەهات بۆ تەویلە. بەپەلە کەوشەکانی لە پێ دەکرد، بەشمیتەکەی لەبەر دەکرد و تۆزێ نانی لە چارەکەیەک دەپێچا، گایەکانی لە عارەبانە دەکرد و بەرەو مەزرا دەکەوتە ڕێ و هەتا بانگی شێوان کاری دەکرد. کە دەگەیشتە نێو باخەکە، بەرکۆشی هەڵدەدا و دەستی دەکرد بە ڕنینی هێشووە ترێ. بە دوو بەرکۆش قەرتاڵەیەکی پڕ دەکرد و لە سەر عارەبانەکەی دادەنا. لای ئێوارە شاد و دڵخۆش، بەبێ هەستی ماندوو بوون، گایەکانی لە عارەبانەکە دەکرد و بە شووڵکێکی درێژ لێی دەدان و بەرەو ئاوایی دەگەڕایەوە. سەر لە ئێوارە، دوای ئەوەی ئالفی بۆ گا و ئاژەڵەکان تێدەکرد، هێندێکی تووی گوڵەبەڕۆژە دەکردە کۆشیەوە و دەچوو بۆ سووچێکی کۆڵانەکە و لەگەڵ دەستەخوشکەکانی دەستیان دەکرد بە گاڵتەوگەپ و پێکەنین. بەڵام کاتێک هەوا تاریک دادەهات، دەگەڕایەوە بۆ ژووری و لە بەرهەیوانەکە بەبێ چرا لەگەڵ باوکی و دایکی و براکەی شێویان دەخوارد. شاد و دڵخۆش، بە ڕوخسارێکی گەشاوە و بزە تێزاوەوە دەهات بۆ ژوورەکە، لە سەر کورسییەک دادەنیشت و بە دەم وەنەوزدانەوە گوێی بۆ چەنەوەرییەکانی کرێنشینەکەیان ڕادەگرت. کاتێک ئۆلێنین لە ژوورەکەیان دەچووە دەرێ، ئەویش دەچووە سەر پێخەفەکەی و خۆی لە گەز دەدا؛ هەر خێراش خەوێکی قورس دایدەگرت و هەتا بەیانی لە سەر

بارێــک دەخەوت. بەیــانیش لەگەڵ قــووقەی کەڵەشــێر خەبەری دەبــۆوە و سەرلەنوێ هەموو شتێک دەستی پێدەکردەوە. دوای ڕۆژی دیاری کردن و شــیرینی خــواردنی خــۆی، ئیتــر چــاوی بە لووکاشــکا نەکەوتبــوو، بەوپەڕی هێمنــــایەتی و لەســــەرخۆییەوە چــــاوەڕوانی ڕۆژی زەماوەنــــدەکەی بــــوو. سەبارەت بە یۆنکەریش دەبێ بڵێین ماریانکا وردەوردە خووی پێگرتبوو و لەوەی کە دەیــدی بە وردی چــاوی لێــدەکات و هەمــوو هەڵســوکەوتێکی خستۆتە ژێر چاوەدێری، هەستی بە چێژێکی زۆر دەکرد. هەستی کچانەی دەبزوا و غوروورێکی شیرین خۆی لە ڕۆحی ناسکی دەپێچا.

# بیست و نۆ

ئەگەرچی لەو هەوا گەرمەدا هیچ کەس نەیدەزانی پەنا بۆ کوێ بەرێ و پوورەی مێش و مێشوولە لە ژێر سێبەری فێنکی عارەبانەکەدا ویزەیان دەهات و دەچوونە نێو چاو و گوێچکەوە، کوڕە چکۆلەش لە پەستا خۆی دەتلاندەوە و لەقەی دەخست، ماریانکا دەسماڵەکەی کێشابوو بە سەر خۆیدا و خەریک بوو خەوی لێ بکەوێ، لە ناکاو ئۆستینکای دەستەخوشکی بە هەڵەداوان هات. لە ژێر سێبەری عارەبانەکە خۆی کوشمەڵە کرد و لە پەنا ماریانکادا ڕاکشا، هەروا کە خەریک بوو جێگای خۆی دەکردەوە گوتی: «زووکەن، ڕاکشێن؛ کاتی خەوە! با بخەوین!» پاشان دەرپەڕییە دەرێ و گوتیشی: «نا نا! جارێ پەلە مەکەن، ئاوا نابێ.» هەستا سەر پێ، چەند لق و پەلی داری شکاندەوە و بە هەردوو لای تایەی عارەبانەکەدا شۆڕی کردەوە، پاشان بەشمیتەکەی خۆی بە سەردا دا. ئەنجا خۆی خزاندە ژێر عارەبانەکە و بە کوڕە چکۆلەکەی گوت: «تۆزێ بڕۆ ئەو لاوە با منیش بخەوم. دەبێ ئەوەش بزانی پیاوان نابێ لەگەڵ کچان بخەون، زوو بڕۆ دەرێ!»

کاتێک ئۆستینکا لەگەڵ دەستەخوشکەکەی دووبەدوو مانەوە، لە ناکاو بە هەردوو دەستی، ماریانکای لە باوەش گرت و خۆی پێوە نووساند، ڕوومەت و لاجانگ و گەردنی ماچباران کرد و بە پێکەنینەوە گوتی: «ئۆف خۆشەویستەکەم، کوڕی جوان!»

ماریانکا لەگەڵ ئەوەی هەوڵی دەدا لە خۆی دوور خاتەوە گوتی: «وا دیارە زۆر شت لە باوەگەورەوە فێر بووی، باشە بەرم دە، لە کۆڵم بەوە!»

هەردووکیان دایان لە قاقای پێکەنین و دایکی ماریانکا هاواری لێ بڵیند بوو. ئۆستینکا بە سرتە گوتی: «یانی تۆ حەزت لەو شتانە نییە؟»

ـ تۆش قسەی وا دەکەی! با بخەوین! باشە تۆ چ کارێکت هەیە هاتووی بۆ ئێرە؟
بەڵام ئۆشینکا هەدای نەدەدا:
ـ ئاخ، ماریانکا گیان! دەمەوێ شتێکت بۆ باس بکەم! ئەگەر خەزت لێ بێ.
ماریانکا هەستایە سەر هەنیشکی و دەسماڵەکەی ڕێکوپێک کرد.
ـ دەی دەتویست چی بڵێی؟
ـ من شتێک لە بارەی کرێنشینەکەتانەوە دەزانم.
ماریانکا بە سەرسووڕمانەوە گوتی: «سەبارەت بە کرێنشینەکەی ئێمە هیچ شتێک نییە کە کەسێک بیزانێ.»
ئۆستینکا قۆڵی ماریانکای گرت و بە پێکەنینەوە گوتی: «هەی چەتیوە عەیارە! خۆت ناتەوێ باسی بکەی، هەموو شەوێ دێ بۆ ماڵتان. مەگین وا نییە؟»
ـ با، وایە. دەی چ بووە؟
لە ناکاو ماریانکا سوور هەڵگەڕا. ئۆستینکا بزەیەکی هاتێ و گوتی: «بەڵام من کچێکی دەم نەسرەوتووم و لە لای هەموو کەس باسی دەکەم. تۆ بۆ لە منی دەشارییەوە؟» ڕوخسارە شاد و خەیاڵاوییەکەی گەشایەوە و گوتیشی: «مەگین من بە کەسێکەوە هیلاکم؟ بڕوا بکەم کارم بە هیچ کەس نییە. من تەنیا ئەوە لای تۆ دەدرکێنم، ئەوم خۆش دەوێ.»
ـ باوەگەورەت خۆش دەوێ؟
ـ ئەرێ.
ماریانکا بە واق وڕمانەوە گوتی: «دەی نازانی ئەوە گوناحە.»
ـ نا، وا مەڵێ ماریانکا گیان! ئەم دوو ڕۆژە عومرەیە. هەتا کچین، دەتوانین تۆزێ خۆشی ڕابوێرین. دوو ڕۆژی دیکە شوو دەکەین، منداڵمان بە تووشەوە دەبێ و ئەرک و زەحمەت سواری شانمان دەبێ. تۆ شوو بکە بە لووکاشکا، جا ئەوکات دەزانی من دەڵێم چی. ئیتر دوای شوو کردن نابێ بیر لە هیچ خۆشی و ڕابواردنێک بکەیەوە، منداڵ یەک لە دوای یەک دێن و

ژیانت لێ تاڵ دەکەن. ئەو کاتە ئیتر دەبێ تەواوی مێشک و بیرت لە لای کار و زەحمەت و منداڵ بەخێو کردن بێ.

ماریانکا بە ئارامی وەڵامی دایەوە: «تۆش قسەی وا دەکەی! زۆر ژن و مێردم پێ شک دێ کە ژیانێکی خۆش و بەختەوەرانەیان هەیە. ئەوەش بە جێی خۆی، ئەو قسانە چییە تۆ دەیکەی؟»

- بەڵام پێم بڵێ لەگەڵ لووکاشکا چیت کردووە؟

- دەتەوێ چیم کردبێ؟ ئەوە خۆت دەزانی هاتە خوازبێنیم. باوکم سەرەتا گوتی ساڵێکی تر، بەڵام لە کۆتاییدا ڕازی بوو و بڕیار وایە ئەم پاییزە زەماوەند بکەین.

- دەی خۆی چیی پێ گوتی؟

ماریانکا زەردەیەکی گرت:

ـ دەی دیارە، دەتەوێ چی بڵێ؟ گوتی خۆشی دەوێم. بەردەوام دەڵێ پێکەوە دەچین بۆ نێو ڕەز و باخەکە.

ـ دیتووتە، چەندە فێڵەزانە! باشە، هیوادارم لەگەڵی نەچووبێتی. بەڵام نەتزانیوە چەندە عەیاشێکی شەشدانگە! هەقیشیەتی، یەکەم جیگیتی ئەم ناوچەیەی ئێمەیە. لە پاسگاش کاتی خۆی بە فیڕۆ نادا. چەند ڕۆژ لەمەوبەر سیریاکی ئێمە هاتبۆوە دەیگوت لووکاشکا ئەسپێکی وەگیر کەوتووە دەڵێی ڕەخشی ڕۆستەمە! لەگەڵ ئەوەشدا، لووکاشکا لای تۆ بێتاقەتە و گیانی دادەگیرێ، وا نییە؟ دەی، چیی دیکەشی دەگوت؟

ماریانکا بە پێکەنینەوە گوتی: «دەتەوێ هەموو شتێک بزانی؟ باشە، جارێکیان بە سواری هاتە بەر پەنجەرەی ژوورەکەم، تەواو سەرخۆش بوو. دەیویست بێتە ژوورێ.»

- دەی، خۆ دەرگاکەت بۆ نەکردەوە، ها؟

ماریانکا بە لەبزێکی جیددییەوە وەڵامی دایەوە: «دەرگای بۆ بکەمەوە؟ ڕاست و ڕەوان پێم گوت نابێ و بڕایەوە! قورس و قایم، وەک گاشەبەرد لە هەمبەریدا ڕاوەستاوم!»

- چەندە گەنجێکی دڵتەر و عەیاشە! هەر کچێکی حەزی لێبێ دەستی لەگەڵ تێکەڵ دەکات و هیچ کەس ناتوانێ بەرگریی لێ بکات.

ماریانکا بە لووت بەرزییەوە گوتی: «دەی کەیفی خۆیەتی، با بڕوا بۆ لای کچانی دیکە!»

- تۆ دڵت پێی ناسووتێ؟

- چۆن دڵم پێی ناسووتێ، زۆریش؛ بەڵام من خۆم سووک ناکەم. حەزم لەو کارانە نییە.

ئۆستینکا لە ناکاو سەری خستە سەر سینگی نەرمی ماریانکا و بە هەردوو دەستی باوەشی کرد بە نێوقەدیدا، هەر لەو کاتەدا کوڵی پێکەنینێک گرتی کە خەریک بوو هەناسەی ڕاوەستێ. بە دەم هەناسەبڕکێوە گوتی: «گەمژەی پەتیارە! تۆ پشت لە بەختەوەریی خۆت دەکەی!» دیسان دەستی کردەوە بە ختیلکەدانی ماریانکا. ماریانکا بە دەم پێکەنینەوە دەنگی هەڵبڕی: «کچێ لە کۆڵم بەوە! بۆ ئاوا ئاورت گرتووە؟ لازۆتکای فەقیرت پلیشاند.»

دایکی ماریانکا لە پشت عارەبانەکەوە دەنگی هەڵێنا: «ئەو چەتیوە حەشەرییانە بۆ وا دەکەن! وا دیارە نایانهەوێ بخەون.» ئۆستینکا هەستا دانیشت و بە سرتە گوتی: «تۆ پشت لە بەختەوەریی خۆت دەکەی، بەڵام بڕوا بکە نێوچاوانەکەت هێناویەتی و خۆت نازانی. تەواوی خەڵکی تۆیان خۆش دەوێ! تۆ ئەگەرچی تووڕە و تۆسنی، بەڵام خۆشیان دەوێی. ئاخ! ئەگەر من لە جێی تۆ دەبووم، دەمزانی لەگەڵ ئەو کرێنشینەتان چ بکەم! ئەو شەوەی لە ماڵی ئێمە بوون، من دیتم چۆن چاوی لێدەکردی! بڕوا بکە دەیویست بە چاوی هەڵتلووشێ. باوەگەورەی من، خۆ زۆریش ساماندار نییە، بەڵام شتی وای پێداوم مەگەر خودا بزانێ! کرێنشینەکەی ئێوە پێموایە یەکێک لە ساماندارەکانی ڕووسیایە. نۆکەرەکەی دەیگوت چەند خزمەتکاری هەیە.»

ماریانکاش هەستا دانیشت و بە حاڵەتێکی خەیاڵاوییەوە پێکەنی، پاشان لەگەڵ ئەوەی لقە گیایەکی بە ددانی گرتبوو، گوتی: «بەڵام کرێنشینەکەی

ئێمە دەیگوت بە ئاواتەوەیە کازاخ بوایە. بە منی دەگوت حەزم دەکرد لە جێی لووکاشکا بووایەم یان برا چکۆلەی تۆ لازۆتکا بوایەم. مەبەستی لەو قسانە دەبێ چی بووبێ؟»

ئۆستینکا وەڵامی دایەوە: «وا دیارە هەرچی بە مێشکیدا هاتووە بە تۆی گوتووە! کرێنشینەکەی ئێمەش لەو قسانە زۆر دەکا! وا دیارە گەمژەیە!»

ماریانکا سەری کردەوە سەر بەشمیتەکەی کە بە جێی بالیف دانابوو، قۆڵی لە سەر شانی ئۆستینکا خزا خوراێ و چاوی قووچاند. دوای تۆزێ بێدەنگی گوتی: «ئەمڕۆ دەیویست لەگەڵمان بێت بۆ باخەکە و کارمان لەگەڵ بکات. باوکیشم داوای لێ کرد بێ لەگەڵمان.»

ماریانکا ئەوەی گوت و خەوی لێکەوت.

# سی

هەتاو ئێستا لە پشت داری هەڵووچەیەک کە سێبەری بۆ عارەبانەکە کردبوو هاتبووە دەرێ و تیشکە کەشوتووشەکەی تەنانەت لە کەلێنی ئەو لکوپۆپانەوە کە ئۆستینکا بە قەراغی عارەبانەکەدا شۆڕی کردبۆوە، دەموچاوی کچەی گەرم گەرم داهێنابوو کە لەو ژێرەدا خەوتبوو. ماریانکا خەبەری بۆوە و دەسماڵەکەی توند لە سەری پێچا. هەروا کە چاوی لە دەوروبەری خۆی دەکرد، کرێنشینەکەیانی دی تفەنگەکەی لە شان کردووە و لەگەڵ باوکی قسە دەکا. ماریانکا بە هەنیشکی لە ئۆستینکای کوتا و بێ ئەوەی قسە بکا، ئۆلێنینی پێ نیشان دا. ئۆلێنین بە پەشۆکاوییەوە چاوی بە دەوروبەری خۆیدا دەگێڕا، بەڵام ماریانکای نەدەدی کە لە بن عارەبانەکە و لکوپۆپی چڕوپڕدا خۆی شاردبۆوە و دەیگوت: «دوێنێ چووم بۆ ئەوێ، بەڵام هیچی لێ نەبوو.»

ملازم دووهەم کە خێرا ڕاوێژی قسەکانی گۆڕیبوو گوتی: «لەو لایەوە ڕاست برۆ. لەو باخە وشک بووەدا کە پێی دەڵێن زەویی بەیار، چەندەت کەروێشک بوێ، لێیەتی.»

دایکی ماریانکا بە لەبزێکی گاڵتەئامێزەوە گوتی: «لە کاتی کاردا نابێ بە دوای کەروێشکدا هەڵێن، وا چاکە هێندێک یارمەتیی ئێمە بدەن. دەکرێ لەگەڵ کچەکان کار بکەن؟» پاشان دەنگی هەڵبڕی: «کچەکان، خەو بەسە! هەستن. ئیتر خۆتان مەخافڵێنن.»

ماریانکا و ئۆستینکا بە سرتە قسەیان دەکرد و لە ژێر عارەبانەکەدا ددانیان بە خۆیداندا گرتبوو کە پێنەکەنن. لەو کاتەوە ئۆلێنین ئەسپێکی پێشکەش بە لووکاشکا کردبوو کە لانیکەم پەنجا سکە دەژیا، دایک و باوکی ماریانکا، بە چاوێکی دڵسۆزانەوە لێیان دەڕوانی و بەتایبەت ملازم دووهەم پێی ناخۆش نەبوو کە ئۆلێنین هۆگری کچەکەیەتی. ئۆلێنین کە هەوڵی دەدا

چاو لە نێوان لقوپۆکان نەکات کە کراسی شین و لەچکەی سووری ماریانکا دیار بوو، گوتی: «بەڵام من شارەزا نیم، دەبێ چۆن کار بکەم؟»

دایکی ماریانکا گوتی: «لەوە گەڕێ! جارێ وەرە بۆ ئێرە با هێندێک قەیسیت بدەمێ.»

ملازم دووهەم بۆ ڕوونکردنەوە و ڕاستکردنەوەی قسەی ژنەکەی گوتی: «ئەمە بە پێی دابی میوانداریی کازاخەکان جۆرێک خوڵکی خۆمانەیە، بەڵام لە ڕاستیدا بە گەوجێتییەکی ژنانە دێتە ئەژمار. لە ڕووسیا پێموایە ئێوە تەنیا قەیسییە وشکە و دۆشاو و کۆنسێروی ئاناناس دەخۆن، وا نییە؟

ئۆلێنین گوتی: «کەوایە ئەو جۆرەی باست کرد، دەبێ باخە کۆنەکە کەروێشکی لێ بێ؟ کەوایە من دەچم بۆ ئەوێ.» دوای ئەوەی چاوێکی خێرای لە نێوان لق و گەڵای دەوری عارەبانەکە کرد، کڵاوەکەی لەسەری داگرت و بە نێو دێراوی ڕاستی ڕەزەکاندا تێپەڕی و لە چاو ون بوو.

کاتێک ئۆلێنین گەڕاوە بۆ نێو باخی ڕەزەکە و گەیشتە لای خانەخوێکەی، هەتاو لە پشت دارستانەکەوە بەرەو ئاوا بوون دەڕۆیشت و پڕشنگی کەشوتووشی لە نێوان گەڵای سەوز و ناسکی ڕەزەکاندا دەدرەوشایەوە؛ وردەوردە بایەکەی خست و فێنکایی دەمەو ئێوارە ئۆخژنی بە جەستەی شەکەت و شەلاڵی ئارەقەیان بەخشی. ئۆلێنین لە دوورەوە بە پێی هەستێکی خۆماک، کراسە شینەکەی ماریانکای لە نێو ڕەزەکاندا ناسییەوە و هەروا کە خەریکی چنینی هێشووی ترێ بوو لێی نزیک بۆوە. سەگە زگەڕۆکەشی جاروبار قەپی بە هێشووە ترێکانی لای خوارووی بنجە مێوکاندا دەکرد. ماریانکا بە دەموچاوێکی سوورهەڵگەڕاوەوە لەگەڵ ئەوەی قۆڵی هەڵکردبوو و دەسماڵەکەی هەتا خوار چەنەی داکشابوو، هێشووی قورسی ترێی لێ دەکردەوە و لە نێو قەرتاڵەکەدا بە جوانی دەیچنی. کە چاوی بە ئۆلێنین کەوت، بێ ئەوەی دەست لەو هێشووە بەردا کە خەریک بوو لێی دەکردەوە، ڕاوەستا، شیلەبزەیەک کەوتە سەر ڕوخساری و سەرلەنوێ دەستی بە کار کردەوە. ئۆلێنین لێی نزیک بۆوە، بۆ ئەوەی هەردوو دەستی ئازاد بێ،

تفەنگەکەی ڕاست و چەپ لە شان کرد، دەیویست بڵێ: «دەی ماریانکا گیان، دایکت و باوکت لە کوێن؟ ماندوو نەبی! بە تەنیای؟» بەڵام هیچی نەگوت و تەنیا کڵاوەکەی لە سەری داگرت. کاتێک لەگەڵ ماریانکا تەنیا دەکەوت، دەپەشۆکا و دەتگوت لە سەر ئەوە پێداگرە خۆی ئەشکەنجە بدات. دیسان لێی نزیکتر بۆوە، ماریانکا گوتی: «تۆ بەو تفەنگەت لەوانەیە ژنان بکووژی.»

ـ نا، تەقە ناکەم.

هەردووکیان بێدەنگ بوون.

ـ ناتەوێ تۆزێ یارمەتیم بدەی؟

ئۆلێنین چەقۆکەی لە گیرفانی دەرهێنا و بێ ئەوەی قسە بکا، دەستی کرد بە هێشووچنین. دوای چەند ساتێک لە ژێر لق و گەڵا پانەکاندا، هێشوویەکی گەورەی دۆزییەوە کە لانیکەم سێ لیوێر[٦٢] دەبوو دەنکە ترێکانی ئەو هێشووە وەها پێکەوە نووسابوون کە دەنکەکان جێیان بۆ گەورە بوون نەبوو. ئۆلێنین هێشووەکەی پیشان ماریانکا دا.

ـ ئەمانە بۆ چنین دەبێ؟ ئەمەیان سەوز نییە؟

ـ بیدە بە من.

دەستیان لە دەستی یەک خشا. ئۆلێنین دەستی نەرم و ناسکی کچەی گرت، بە بزەیەکی شیرینەوە چاوی لە چاوی بڕی و بە دەنگێکی لەرزۆک گوتی: «باشە، یانی تۆ بەم زووانە شوو دەکەی؟»

ماریانکا بێ ئەوەی وەڵامی بداتەوە، ڕووی وەرگێڕا و بە شێوەیەکی جیددی چاوی لێکرد.

ـ تۆ لووکاشکات خۆش دەوێ؟

ـ ئەوە چ پێوەندییەکی بە تۆوە هەیە؟ دەتەوێ بیزانی.

ـ حەز دەکەم بیزانم.

ـ پێم سەیرە، بەڕاستی پێم سەیرە.

ـ تۆ زۆر کچێکی جوانی!

---

٦٢ لیوێر: هاوسەنگی نیو کیلۆیە.

که ئەوەی گوت، لە ناکاو هەستێکی ئاوێتەی خەم چنگی لە دڵی گیر کرد. ئەو قسانەی زۆر بە لاوە ناحەز و دێمۆدە بوو. سوور هەڵگەڕا، بە شێوەیەکی شڵەژاوانە هەردوو دەستی ماریانکای گرت. ماریانکا گوتی: «هەرچۆنێک بم، بۆ تۆ نیم. بۆ پێدەکەنی؟» بەڵام چاوی دەیگوت دەزانێ کە ئۆلێنین پێناکەنێ.

ـ پێکەنین! ئەگەر دەتزانی...

ئەم وشانەش دێمۆدە بوون و لەگەڵ ئەو شتەی دەیویست بیڵێ زۆر جیاواز بوو؛ لەگەڵ ئەوەشدا درێژەی بە قسەکانی دا:

ـ نازانم چیت پێ بڵێم، ناتوانم بیڵێم کە ئامادەم چ کارێک لە بەر دڵی تۆ بکەم ...

ـ لە کۆڵم بەوە، بێشەرم!

بەڵام ڕوخساری و چاوە گەشەکانی، مەمکی قوت و بازۆڵە ناسکەکانی شتێکی دیکەیان دەگوت. ئۆلێنین پێی وابوو ئەو تێدەگا ئەو قسانەی کردوویە، چەندە دێمۆدە و بێتامن، بەڵام ئەو لووتبەرزتر لەوە بوو ئەو چاوەڕوانییەی لێی هەبێ. ئۆلێنین پێی وابوو لەمێژە ماریانکا تێگەیشتووە کە چیی لە دڵدایە و ناتوانێ بیدرکێنێ. بە خۆی دەگوت کە ئەو چۆن دەکرێ لەو شتانە تێنەگا، لە کاتێکدا ئەوەی ئەو دەیویست پێی بڵێ سەبارەت بە بوونی ئەو بوو، سەبارەت بە ماریانکا خۆی بوو؟ بەڵام نەیدەویست تێبگا و نەیدەویست وەڵام بداتەوە.

لە ناکاو لە شوێنێکی نزیک و لە نێو لکوپۆپی ڕەزەکانەوە، دەنگی ناسکی ئۆستینکا کە ئاوێتەی پێکەنینێکی زایەڵەدار بوو، کەوتە بەر گوێ کە دەیگوت: «هۆی! هۆی دیمیتری ئاندرێڤیچ، وەرە بۆ ئێرە یاریدەی من بدە!» پاشان لەگەڵ ئەوەی دەموچاوە خڕ و خوێنشیرینەکەی لە پشت گەڵاکانەوە لە چاو ون بوو، ڕووی دەمی لە ئۆلێنین دەنگی هەڵبڕی: «من بەتەنیام، وەرە بۆ یاریدەی من!»

ئۆلێنین وەڵامی نەدایەوە و لە جێی خۆی نەبزووت.ماریانکا هەروا کە خەریکی ترێ چنین بوو، لە ژێرەوە چاوی لە ئۆلێنین دەکرد و وای دەنواند کە گرینیگی پێ نادا. ئۆلێنین دەیویست شتێک بڵێ، بەڵام ددانی بە خۆیدا گرت. لە ناکاو شانی هەڵتەکاند و تفەنگەکەی لە شانی داماڵی، وەرسووڕایەوە و بە هەنگاوی توند و خێرا دوور کەوتەوە.

# سی و یەک

ئۆلێنین دوو جار ڕاوەستا و گوێی بۆ زایەڵەی پێکەنینی ماریانکا و ئۆستینکا ڕاگرت. دەنگی قاقا و قریشکەی ماریانکا و ئۆستینکا تێکەڵ بووبوو و لە نێو ڕەز و باخەکەدا دەنگی دەدایەوە. ئەو ڕۆژە هەر لە عەسرەوە هەتا ئێوارە ئۆلێنین لە نێو باخە کۆنەکەدا سووڕایەوە بەڵام هیچی بۆ ڕاو نەکرا و دوای ڕۆژئاوا گەڕایەوە بۆ ماڵێ. هەروا کە بە نێو حەوشەکەدا تێدەپەڕی، لە کەلێنی ژووری خاوەنماڵەکەیەوە کراسە شینەکەی ماریانکای دی. بۆ ئەوە تێیانبگەیێنێ گەڕاوەتەوە بۆ ماڵێ، بە دەنگی بەرز بانگی ژانۆی کرد. لە سەر قاڵدرمەکان لە شوێنی ئاسایی خۆی دانیشت. خانەخوێکانی تازە لە باخی گەڕابوونەوە و دوای تۆزێ ڕاوەستان لە گەوڕەکە ڕۆیشتن بۆ ژوورەکەی خۆیان، بەڵام خولکی ئۆلێنینیان نەکرد. لە تاریکوڕوونی حەوشەکەدا ئۆلێنین وای بۆ دەرکەوت کە ماریانکا ئاوڕی داوەتەوە و چاوی لێکردووە. ئۆلێنین بەوپەڕی بێدەسەڵاتییەوە هەڵسوکەوتی کچەی خستبووە ژێر چاوەدێری، بەڵام نەیدەوێرا لێی نزیک بێتەوە. کاتێک ماریانکا چووە ژوورەکەی خۆی، ئۆلێنین هەستا و لە نێو حەوشەکەدا دەستی کرد بە پیاسە کردن، بەڵام ماریانکا لە ژوورەکەی نەهاتە دەرێ. ئۆلێنین ئەو شەوە هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوی و لە حەوشەکە مایەوە و گوێی بۆ هەموو دەنگ و جووڵەیەکی ژووری خاوەنماڵەکەی شل کردبوو، دەنگی ئاخافتنیان، تەقوکوتی کەوچک و قاپ و قاچاغ کاتی شێو خواردن و جێگا ڕاخستن و پرخەی خەوەکەیانی گوێ لێ بووبوو؛ قاقای پێکەنینی ماریانکا و سرتەکردنی ملازم دووهەمی بیستبوو. ملازم دووهەم خەریک بوو بە سرتە قسەی لەگەڵ ژنەکەی دەکرد و کەسێکی تر پرخەی دەهات. ئۆلێنین گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی. ژانۆ بە جلوبەرگەوە خەوتبوو، ئۆلێنین ئاواتی خواست بە

جێی ژانۆ بوایه و دیسان گەڕایەوە بۆ حەوشە و دەستی کرد بە پیاسە کردن و چاوەڕوانی کێشان. بەڵام هیچ کەس نەدەهاتە دەرێ. هیچ کەس نەدەجووڵایەوە و تەنیا پرخەی نەرم و ڕێکوپێکی سێ کەس دەهاتە گوێ. ئۆلێنین پرخەی ماریانکای دەناسییەوە و گوێی بۆ شل دەکرد. گوێی بۆ کوتەکوتی دڵی خۆشی ڕادەگرت. گوندەکە لە باوەشی بێدەنگیدا بوو؛ مانگ کە درەنگ هەڵاتبوو، زۆر بەرز و ڕووناک تریفەی لە ڕووی دەباراند. ئەو ئاژەڵانەی لە حەوشەی ماڵان وەرکەوتبوون، بە ئارامی هەڵدەستان و دەخەوتنەوە و بە جوانی دیار بوون. ئۆلێنین بە ڕقەوە لە خۆی پرسی: «چاوەڕوانی چیم؟» بەڵام نەیدەویست خۆی لە چنگی ئەم شەوە درێژە دەرباز بکا. لە ناکاو ترپە و خشپەی چەند هەنگاوی لە ژووری خاوەنماڵەکەیەوە بیست. لەڕێوە هەڵات بۆ لای دەرگاکە. بەڵام جگە لە دەنگی هەناسە کێشان هیچ شتێکی دیکە نەدەبیسترا، دیسان مانگاکە لە سووچی حەوشە هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا و بەرەو لایەکی دیکە وەرسووڕا، سەرەتا لە سەر دەستی، پاشان هێزی دایە سەر پاشووی و هەستا و کلکی ڕاوەشاند، بە هێواشی چەند جار سمی لە زەوی کوتا و پاشان لە بەر تریفەی مانگەشەو چەند هەناسەی قووڵی هەڵکێشا و سەرلەنوێ خەوتەوە ... ئۆلێنین لە خۆی دەپرسی: «دەبێ چ بکەم؟» بڕیاری دا بچێ بخەوێ. دیسان گوێی لە خشپەیەک بوو و لە خەیاڵی خۆیدا ماریانکای دی کە بەو مانگەشەوە بەرەو حەوشە لەنجە دەکا؛ دیسان هەڵاتەوە بۆ بەر پەنجەرەکە و دیسان گوێی لە چەند دەنگ بوو. بەر لەوەی گزنگی خۆر لە ئاسۆوە دەرکەوێ، جارێکی تر چوو بۆ بەر پەنجەرەکە و گوێی پێوەنا؛ دەنگی هەناسەی ماریانکا و چەند خشپەی پێ بە جوانی دەبیسترا. ئاڵقەڕێزی دەرگاکەی گرت و بە هێواشی لێیدا. کەسێک بە پێخاوسی کە هەوڵی دەدا بە هێواشی لاقی لە سەر تەرکی ژوورەکە دانێ، هاتە پشت دەرگاکە و تەقەی پشت بەستەکەی هات و دەرگاکە بەبێ جیرە کرایەوە و بۆنی گەلامێو و کوولەکە هات بە سەریدا، بەژنوباڵای ماریانکا لە نێو دەرگاکەدا وەک مانگ

هەڵات. ئۆلێنین بۆ ساتێک ڕوخساری کچەی لەبەر تریفەی مانگەشەو دی. کچە دەرگاکەی پێوەدایەوە و لە دوای پرتەوبۆڵەیەک بە ئارامی ڕۆیشتەوە بۆ ئەوسەری ژوورەکە. ئۆلێنین دیسان لە دەرگای دایەوە، بەڵام هیچ کەس دەرگای لێ نەکردەوە. بەپەلە هەڵاتەوە بۆ بەر پەنجەرەکە و گوێی پێوەنا، لە ناکاو دەنگێکی بەرز و شێوە گوڕاندنی پیاوێک وەخۆی هێنایەوە. کازاخێکی کورتەباڵا بە کڵاوێکی سپییەوە لە لای تەیمانی حەوشەکەوە هات بۆ لای و گوتی: «وایە! من هەموو شتێکم دی، وایە؟»

ئۆلێنین ناسایری ناسییەوە. بەڵام هیچی نەگوت. لە ڕاستیدا نەیدەزانی چی بکات و چی بڵێ.

ـ وایە! من دەچم بۆ دایرەی قەزا و لەوێ بەڵگەی تەواو پیشانی باوکی کچە دەدەم. جەنابی ملازم! ئەوکاتە دەردەکەوێ کە چیت لە ژێر سەردایە!

ئۆلێنین گوتی: لێرە چ دەکەی؟ چیت لە من دەوێ؟

ـ هیچ، ئەمە دەبێ لە دایرەی قەزا ڕوون بکرێتەوە.

ناسایر بە دەنگی بەرز و خێراخێرا قسەی دەکرد.

ـ بڕوانە! دەبێ ئەوە تێبگەی. جەنابی یۆنکەر وا دیارە زۆر کۆنەکار و لە کڵ دەرهاتووی!

ئۆلێنین دەلەرزی و ڕەنگی هەڵبزرکابوو.

ـ وەرە، وەرە بۆ ئێرە!

ئۆلێنین دەستی گرت و بە زۆر ڕایکێشا بۆ لای ژوورەکەی خۆی.

ـ خۆ هیچ ڕووی نەداوە، دەرگاکەی لێ نەکردمەوە، منیش خۆ هیچم نەکردووە ... ئەو کچێکی داوێنپاکە...

ـ زۆر باشە، زۆر باشە، من دەتوانم مەسەلەکە پووشبەسەر بکەم ...

ـ بەڵام من دەمهەوێ شتێکت پێ بدەم... تۆزێ ڕاوەستە...

ناسایر بێدەنگ بوو. ئۆلێنین بە هەڵەداوان خۆی کرد بە ژووریدا و دە ڕۆبڵی بۆ کازاخی لاو هێنا.

ـ دەزانی چی! هیچ نەبووە، نە من دەنگ و نە تۆ دەنگ ... بەڵام منیش بە هەڵەچووم. هانێ ئەمە بۆ تۆ! بەڵام تکات لێدەکەم با ئەم مەسەلەیە هەر لێرەدا چاڵ بکەین و کەس تێینەگا! ئەگەرچی هیچ شتێکیش ڕووی نەداوە!

ناسایر بە پێکەنینەوە گوتی: «خەمت نەبێ! دیزە بە دەرخۆنەی دەکەم!» پاشان بە پڕتاو هەڵات و دوور کەوتەوە.

ئەوشەوە ناسایر بۆ ئەنجام دانی کارێک لە لایەن لووکاشکاوە ڕاسپێردرابوو بێتە گوندەکە، تاکوو شوێنێک بدۆزنەوە بۆ ئەوە ئەسپەی دزیبوویان، کاتێک گەیشتبووە نێو ئاوایی و بە کۆڵانەکەدا تێپەڕیبوو، گوێی لە ترپەی پێی ئۆلێنین بووبوو و بە پێدزکە نزیک بووبۆوە، بە سەر تەیمانەکەدا بازی دابووە نێو حەوشەکەی ماڵی ماریانکا و ئەو دیمەنەی دیبوو. ناسایر بەیانی زوو گەیشتەوە پاسگا. بۆ خۆنواندن لەلای هاوڕێکەی گوتبووی کە بە شێوەیەکی زۆر لێهاتووانە دە ڕۆبڵی بە دەست هێناوە. ئەو ڕۆژە سەرلەبەیانی، ئۆلێنین چاوی بە ئەندامانی خاوەنماڵەکەی کەوت. بەڵام باسی هیچیان نەکرد. لەگەڵ ماریانکا قسەی نەکرد و کاتێک ئەویش ئۆلێنینی دی زەردەیەکی گرت. شەوی دواییش ئۆلێنین هەتا بەیانی خەو نەچووە چاوی، لە نێو حەوشەکەدا پیاسەی کرد، ڕۆژەکەشی هەتا ئێوارە خەریکی ڕاو بوو. ئێوارە لە سەحرا گەڕایەوە و بۆ هەڵاتن لە دەست ئەو تەنگژە ڕۆحییە چوو بۆ لای بیلێتسکی. لە خۆی دەترسا و بڕیاری دابوو کە ئیتر ناگەڕێتەوە بۆ لای خاوەنماڵەکەی. شەوی دوایی لە نیوەشەودا، ئاجوودان ئۆلێنینی لە خەو هەستاند. دەبوو لیواکەیان زۆر بەپەلە بۆ هەڵمەتێکی شەوانە وەڕێ بکەوێ. ئۆلێنین شادی لە دڵی گەڕا و پێی وابوو ئیتر ناگەڕێتەوە بۆ ئاوایی. هێرشەکەیان چوار ڕۆژی خایاند. سەرکردەی هەڵمەتەکە کە خزمی ئۆلێنین بوو ناردی بە شوێنیدا و داوای لێکرد لە سەرکردایەتی بمێنێتەوە. ئۆلێنین ئەو داوایەی ڕەد کردەوە. لەو شەڕەدا نیشانەی خاچی تایبەتی سەربازەکان، کە ماوەیەکی زۆر بوو بە هیوای بوو، پێی بەخشرا. ئێستا ئۆلێنین بە هۆی ئەو نیشانەیەوە گۆڕانێکی زۆری بە سەردا هاتبوو. زۆری نەمابوو بەو پلەیە

بگـا کە چـاوەڕوانی بـوو. ئەویـش پـلەی ئەفسـەری بـوو. ئـۆلیێنین لەگەڵ ژانـۆ وەڕێکەوتـن و چەنـد کـاتژمێر زووتـر لە لیواکەیـان گەیشـتنەوە گونـدەکە. ئەو ڕۆژە هەتـا ئێـوارە لە سـەر قاڵـدرمەکان دانیشـت و سـەیری بەژنوبـاڵای ماریانکـای کـرد. شەوەکەشـی بەبیٚ ئەوەی بیـر بکـاتەوە، لە نێـو حەوشـەکەدا پیاسەی کرد.

# سی و دوو

ڕۆژی دوایـی ئـۆلێنین درەنـگ لە خەو هەسـتا. خاوەنماڵەکـان لە مـاڵێ نەبوون. ئۆلێنین ئەو ڕۆژە نەچوو بۆ ڕاو. هێندێ جار کتێبێکی بە دەستەوە دەگرت، هێندێ جاریش دەچوو لە سەر سەکۆی قاڵدرمەکان دادنیشت، دوای تاوێ سەرلەنوێ خۆی دەکردەوە بە ژووریدا و لە سـەر قەرەوێڵەکەی خۆی ڕادەکشـا. ژانـۆ پێـی وا بـوو ئاغـاکەی نەخۆشـە. لای عەسـر، ئـۆلێنین بە حاڵەتێکی لێبڕاوانە هەستا و دەستی کرد بە نووسین، هەتا چەند کاتژمێری لە شەو لای دا هەروا خەریکی نووسین بوو. ئەوەی نووسیبووی نامەیەک بوو بـۆ یەکێـک لە هاوڕێکـانی. بەڵام نەیـدا بە پۆسـتخانە چـونکە هـیچ کەس نەیدەتوانی تێبگا کە ئەو چیی دەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا جگە لە خۆی هیچ کەس بە پێویسـتیی نەدەزانـی لە خواسـتی دەروونـی ئەو تێبگـا. ئەمەش دەقـی نامەکەی بوو:

«هێنـدێ نامەم لە مۆسکۆوە پێدەگا کە پڕن لە دڵسـۆزی. لەوە دەترسـێن لەم وڵاتە پـڕ ئـاژاوەیەدا بفەوتـێم. سـەبارەت بە مـن دەڵـێن: ئـۆلێنین دڵـڕەق دەبـێ، لە هەمـوو دابونەریتێـک دادەبـڕێ، فێـری خـواردنەوە دەبـێ، لەوانەیە لەگەڵ کچێکی قازاخ ژیانی هاوبەش پێکبێنێ. ئەرمیلۆڤ گوتەنی: هەرکەس دە ساڵ لە قەفقاز بمێنێتەوە یان لە شـەڕابدا نوقم دەبێ و دەخنکێ، یان لەگەڵ سەڵیتەیەک زەماوەند دەکا. داخێکی گەورەیە، وا نییە؟ یانی جێگای داخ نییە کە بە جێـی ئەوەی شـانازیی مەزنـی هاوسـەرگیریی لەگەڵ کـۆنتس ب... بە دەست بهێنم و ببمە مۆربەدەستی شاهانە یان سـەرۆکی خانەدانەکان، ئـاوا خـۆم تووشـی ڕۆژەڕەشـی بـکەم؟ ئێـوە هەمووتـان چەنـدە لە بەرچـاوم سـووکوچرووک و جێگـای بەزەیی پێداهاتنن! ئێوە لە مانـای بەختـەوەری و ژیان تێناگەن. تەنانەت ئەگەر بۆ جارێکیش بێ، پێویستە تامی ژیان بە هەموو

جوانییە سروشتییەکانیەوە بچێژن. ئەوەی من هەموو ڕۆژێ بە چاوی خۆم دەیبینم، ئێوەش ببینن. ئەو بەفرانەی کە بە لووتکەی کوێستانەوەن و هەتاهەتایە ناتوێنەوە، ژنێکی شۆخوشەنگ لەگەڵ ئەو جوانییە سەرەتاییە، لەڕاستیدا ئەو جوانییە ژنانەیە کە بۆ یەکەم جار لە کارگەی ئافراندنی خوا هاتۆتە دەرێ. ئەو کاتە ئێوە تێدەگەن کێ دەمێنێ و کێ دەفەوتێ! بۆتان دەردەکەوێ کێ لە دنیای ڕاستەقینەدا دەژی و کێ لە نێو گێژاوی درۆدا ئەوق دەبێ! تێدەگەن ئەوە منم یان ئێوە. خۆزگە دەتانتوانی تێبگەن من چۆن دەرهەق بە ئێوە هەستی بەزەیی و سووکایەتی لە ناخمدا سەرهەڵدەدا! کاتێک بە جێی ماڵە خنجیلانەکەی خۆم، بە جێی دارستان و بە جێی ئەشقی خۆم، ئەو تەلارانە و ئەو ژنانە بە قژی ڕۆن لێدراو و کەزیەی لوولدراوی دەستکردەوە، ئەو لێوانەی لە خۆڕا دەجوولێنەوە و بزەی ساردیان تێدەگەڕێ، ئەو لەشولارە لاواز و نالەبارانەی کە لە ژێر هەزاران بەرگ و بزگوڕدا خۆیان حەشار داوە و ئەو وڕێنە بێمانایانەی کە بەبێ هیچ هەقێک ناوی دانووستانی شیرینیان پێدراوە، دەبینم، ڕق و بێزارییەکی لەڕادە بەدەر لە ناخی خۆمدا هەست پێدەکەم. دیمەنگەلێک لە بەرچاوم زەق دەبنەوە: ئەم دەموچاوە خڕانە، ئەم دەزگیرانییە وشک و ساماندارانەیەی کە ڕوخساریان لە دوورەوە هاوار دەکا: وەرنە پێشێ؛ مەترسن لەوەی کە ساماندارم، قەیناکا! ئەم هەڵسوکەوت و ئاکارانە، ئەم جێگۆڕکێ و ڕادەست کردنەوەیەی کورسی، ئەم دۆخە بوێرانەیەی ململانێ و ئەم دابونەریتە بڕیار لەسەر دراوانە، هەموو بۆ خۆتان. یەکێک دەبێ تەوقەی لەگەڵ بکەی، یەکێکی تر دەبێ بە ئاماژەی سەر بیدوێنی و سێهەمی تەنیا دەبێ یەک دوو قسەی لەگەڵ بکەی. وەلحاسڵ ئەو خەم و خەفەتەی لە ڕێگای خوێنەوە بەرە بۆ بەرە دەگوێزرێتەوە، هەموو ئەوانە ئاگادارانە و بە بیانووی ئەوەی کە زەرووریە ئەنجام دەدرێن و هەموو ئەوانە لە بەرچاوم زەق دەبنەوە. دەبێ ببینی و تێبگەی کە مانای ڕاستەقینەی جوانی و هەقیقەت چییە؟ ئەو کاتە هەموو وتە و بیرەکانتان و تەواوی ئەوانەی بۆ بەختەوەریی خۆتان و من

دەتانویست وەک تەپوتۆز بە ئاسمانا دەچیٚ. بەختەوەری یانی لە باوەشی سروشتدا گیرسانەوە و تیٚگەیشتن لیٚی و ڕازونیاز کردن لەگەڵی. «هیٚشتاش لەوانەیە ـ خودا نەخواستە ـ لەگەڵ کچیٚکی سادەی کازاخ ژیانی هاوبەش پیٚک بیٚنیٚ، ئەوکاتە دەبیٚ هەموو کەس وەک کەسیٚکی لە دەستچوو چاوی لیٚ بکەن.» بەڵیٚ، بە بۆچوونی من، خەڵکی بە لەبزیٚکی پڕ لە دڵسۆزی سەبارەت بە من ئەوە دەڵیٚن ـ لە حاڵیٚکدا تەنیا ئاواتی من هەر یەک شتە، ئەو شتەی ئیٚوە بیری لیٚ دەکەنەوە و لیٚی دەترسن، تەنیا ئاواتی منە و دەمەهەویٚ لە دەست بچم و بە ئاواتەوەم لەگەڵ کچیٚکی سادەی کازاخ ژیانی هاوبەش پیٚکبیٚنم، ئەگەر ئەوەش نەکەم، هۆکارەکەی ئەوەیە کە ئەو کارە بۆ من بەختەوەرییەکی هیٚندە گەورە دەبیٚ کە خۆم بە شایانی نازانم.

ئیٚستا سیٚ مانگ بە سەر ئەو ڕۆژەدا تیٚپەڕیوە کە بۆ یەکەم جار چاوم بە ماریانکا کەوت، بیر و خەیاڵیٚک کە لە دنیاکەی چووبوومە دەریٚ، هیٚشتا گڕوتین بە ناخم دەبەخشیٚ. ئەو کاتە پیٚم وا بوو دەتوانم ئەو کچەم خۆش بویٚ. چەندم پەسنی شاخ و چیا و ئاسمان دەدا، بەو ڕادەیەش پەسنی ئەو کچەم دەدا، من نەمدەتوانی چاوپۆشیی لیٚ بکەم، چونکە ئەویش وەک ئاسمان و چیاکان جوانە. پاشان بۆم دەرکەوت سەیر کردنی ئەو جوانییە بۆتە پیٚویستییەکی حاشاهەڵنەگری ژیانم. وردەوردە لە خۆمم پرسیی: یانی ئەوم خۆش ناویٚ؟ بەڵام هیچ شتیٚکی وەک ئەو هەستەم لە دەروونمدا شک نەدەرد کە پیٚشتر بیرم لیٚ دەکردەوە و دەمهیٚنایە بەرچاوی خۆم. ئەوەی هەستم پیٚدەکرد شتیٚک بوو وەک خەمی تەنیایی و ئارەزووی ژن هیٚنان، نە شیٚوەی ئەشقی ئەفلاتوونیی دەدا و نە لەویش کەمتر، وەک ئەشقی هەوەساوی بوو. دەبوو چاوم پیٚی بکەویٚ، گویٚم لە دەنگی بیٚ، هەست بکەم لە پەنامە و بەتایبەت دەبیٚ بڵیٚم لەو حاڵەدا خۆم بە بەختەوەر دەزانی و هەستم بە جۆریٚک ئۆخژن و ئاسوودەیی دەکرد. دوای ئەو کۆڕە شەونشینییە کە خۆم لەو کچە نزیک کردەوە و لیٚوم ڕچەی گۆنای شکاند، وا هەست دەکەم پیٚوەندییەکی لە پسان نەهاتوو لە نیٚوان من و ئەو کچەدا هەیە کە هیٚشتا لە

چۆنیەتییەکەی تێنەگەیشتووم، بەڵام توانایی ململانێشم لەگەڵیدا نییە. دایمە لەگەڵ خۆم لە کێشەدا بووم و بە خۆمم دەگوت: بڵێی خۆشویستنی ئافرەتێک کە لە تامەزرۆیی و تاسەی ڕۆحی من تێناگا، بلوێ بۆم؟ یانی دەکرێ کچێکت تەنیا لە بەر جوانییەکەی، یانی ژنێکی پەیکەرەت خۆش بوێ؟ بەڵێ هەمیشە ئەو پرسیارانەم لە خۆم دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خۆشم دەویست، ئەگەرچی قەبووڵ کردنی ئەو هەستە بە لامەوە زۆر مەحاڵ بوو.

دوای ئەو کۆڕە شەونشینییە، کە بۆ یەکەم جار قسەم لەگەڵ کرد، پێوەندیمان گۆڕانی بە سەردا هات. هەتا ئەو کاتە ئەو کچە بۆ من شتێکی زۆر سەیر و مەزن لە سروشتی دەرەوە دەهاتە ئەژمار، بەڵام لە دوای ئەو شەوە، کچە بە لای منەوە بوو بە مرۆڤ. ئەو کاتە بوو کە ناسیم. لەگەڵی دەدوام، هێندێ جار کاتی کارکردن دەچووم بۆ لای باوکی، شەوانە و زۆربەی کاتەکان لەگەڵ ئەوان بووم و لەماڵیان دەمامەوە. لەو قۆناخەدا کە پێوەندییەکی خۆمانەتریش لە نێوانماندا دامەزرا، ئەو هەروا لە بەرچاوم پاک و بەرز و دەست پێڕانەگەیشتوو بوو. هەمیشە بەوپەڕی لەسەرەخۆیی و شاد و ڕووخۆشییەوە وەڵامی پرسیارەکانی دەدایەوە. هێندێ جار مێهرەبان دەبوو، بەڵام زۆربەی کاتەکان، ڕوانین و ئاخافتن و هەڵسوکەوتی کە ساردوسڕییەکی سووکایەتی ئامێزی پێوە دیار نەبوو، بەڵکوو حاڵەتێکی ڕووخێنەر و هەڵخەڵەتێنەری لە خۆ دەگرت، لە ناخەوە دەیهەژاندم. هەر ڕۆژەی بزەیەکی ئانقەست لە سەرلێو هەوڵم دەدا ڕۆڵێک بگێڕم و بە دڵێکی پڕ لە ئازار و ئەشق و هیواوە، گاڵتەوگەپم لەگەڵ دەکرد. وای لێ هات ئیتر ئەو بارودۆخەم بۆ تامڵ نەدەکرا. بەتایبەت ڕقێک لە ناخەوە هەڵیدەچۆقاندم. هەتا ئەو کاتەی ڕووداوێک لە نێو ڕەزەکان ڕووی دا: من هەوڵم دەدا سەبارەت بە ئەشقی خۆم لەگەڵی بدوێم و بۆ ئەو کارە وشەی وام بەکار دەهێنا کە تەنانەت کاتێ بیریشی لێ دەکەمەوە، لەوانەیە لە شەرمەزاریدا بتوێمەوە. شەرمەزاری بۆ ئەوەی کە نەدەبوو قسەی ئاوای لەگەڵ بکەم، چونکە دەمزانی ئەو زۆر زۆر بەرزتر لەو وشە و هەستانەیە کە دەمویست

بەو شێوەیە دەریبڕم. لەو کاتەوە بێدەنگ بووم و ئیتر ڕۆژ لەگەڵ ڕۆژ بارودۆخی ڕۆحیم دژوار و ئاڵۆز بوو، وای لێهات کە ئیتر ئۆقرەم لێبڕا. من نەمدەویست هەتا ڕادەی ڕاگرتنی پێوەندیی سەردەمی منداڵی، نزم ببمەوە و هەستم دەکرد نەمتوانیوە ڕێگایەکی ڕاست و سادە هەڵبژێرم بۆ ئەوەی پێی بگەم. هیوابڕاوانە لە خۆم دەپرسی: چ بکەم؟ چیم لە دەست دێ؟ لە خەون و خولیاکانمدا هێندێ جار بە گراوی خۆمم دادەنا و هێندێ جاریش بە ژنی خۆم. جاری واش بوو بە ڕقەوە ئەو فکر و خەیاڵانەم لە خۆم دەتاراند. دەست تێکەڵ کردن لەگەڵ ئەو کچە لە خەیاڵدا نەدەگونجا. کردنی ئەو بە خاتوون و بە ژنی دیمیتری ئاندریڤیچ و چاو لێکردنی وەکوو ژنێکی کازاخ کە لەگەڵ یەکێک لە ئەفسەرانی خۆمان ژیانی هاوبەش پێکبێنێ، ئەوە ئیتر زۆر بە لامەوە مەحاڵی دەنواند. من ئەگەر بمتوانیبایە ببمە پیاوێکی کازاخ، کەسێکی وەک لووکاشکا، ئەسپ بدزم، چیخیر بخۆمەوە، گۆرانی بڵێم، خەڵک بکووژم و شەوانە بە سەرخۆشی خۆم بگەیەنمە بەر پەنجەرەکەی و لە بیر خۆمی بەرمەوە کە کێم و بۆچی دەژیم، ئەوکاتە بارودۆخەکە بە بارێکی تردا دەشکایەوە و ئێمە دەمانتوانی لە یەکتر تێبگەین و من دەمتوانی بەختیار بم. چەندین جار هەوڵم داوە خۆم تەسلیمی ئەم جۆرە ژیانە بکەم و ترس و دڵەخورپەکانم برەوێنمەوە. بەڵام وەک بیری لێ دەکەمەوە داهاتوویەکی پڕ لە بێ هیواییم لە پێشە. هەموو ڕۆژێ دەڕوانمە دیمەنی کوێستانە پڕ بەفرەکان و ئەم ژنە پڕ شکۆ و بەختەوەرە، بۆم دەردەکەوێ تەنیا ڕێگای بەختەوەری لەم دنیایەدا لە من گیراوە، ئەو کچە بۆ من نابێ و چارەی لە من نەنووسراوە! ترسناکترین و لەگەڵ ئەوەشدا شیرینترین خاڵی بارودۆخی ژیانی من ئەوەیە کە هەست دەکەم من لەو تێدەگەم بەڵام ئەو هەرگیز لە من تێناگا. نەک ئەوەی ئەو لە ڕادەی مندا نەبێ، بە پێچەوانە، ئەو نابێ لە من تێبگا. ئەو بەختەوەرە، ئەو وەک سروشت وایە؛ بێخەیاڵ و ئارام و سەرقاڵی خۆی. بەڵام من کە بوونەوەرێکی لاواز و دەستەوستانم، بە ئاواتەوەم ئەو لە سەرسووڕمان و ئەشکەنجە و ئازارەکانی ڕۆحم تێبگا. بە درێژایی شەو،

بەبێ هیچ مەبەستێک لە بەر پەنجەرەی ژوورەکەی ڕاوەستاوم، بەبێ ئەوەی بزانم لە ڕۆحی خۆمدا چی ڕادەبرێ.

ڕۆژی هەژدەهەمی ئەم مانگە، دەستەکەی ئێمە فەرمانی پێدرا بۆ هێرشێک خۆی ئامادە بکات. ماوەی سێ ڕۆژ دوور لە گوندەکە بووم و لەو ماوەیەدا زۆر دڵتەنگ و بێتاقەت بووم. لە نێو یەکەکەماندا گۆرانیبێژی و یاریی پاپەزێن و بەزم و ڕابواردن و مەی خواردنەوە و قرموقاڵ هەمووی بە لامەوە نگریس و دزیو بوون. ئێستا گەڕاومەتەوە بۆ ماڵێ، ئەو و ژوورە چکۆلەکەم و مامە ئیرووشکام دیوەتەوە. لە سەر قاڵدرمەکانی بەر ژوورەکەمەوە سەرلەنوێ چاو لە کوێستانە پڕ بەفرەکان دەکەم و هەستی شادییەکی نوێ وەها ڕۆحی لە ئامێز گرتووم کە هەموو شتێک تێگەیشتووم. من بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا ئەو کچەم وەک ئەشقێکی ڕاستەقینە قەبووڵ کردووە و خۆشم دەوێ. ئێستا تێگەیشتووم چیم دەوێ. لەوە ناترسم کە بە هۆی ئەو هەستەوە سووک بم، ئەم ئەشقەی خۆم بە شوورەیی نازانم و زۆریشی شانازی پێوە دەکەم... ئەگەر ئاشق بووم خەتای خۆم نییە. بێ ئیختیار ئەو هەستە لە ناخمدا سەری هەڵداوە. بۆ دەربازبوون لە دەست ئەو ئەشقە دەستەوداوێنی فیداکاری و لەخۆبردوویی بووم و تەنانەت ئەو ئەشقەی لووکاشکای کازاخ دەرهەق بە ماریانکا چێژ و عەشقێکی ڕۆحیی پێ بەخشیوم، بەڵام بە تێپەڕینی زەمان ئەو ئەشقە لە ناخمدا وەک وەرهەمێکی لێهات و هەستم کرد بۆتە ئێرەیی و خەریکە ئارا و قارام لێ هەڵدەگرێ. بۆم دەرکەوتووە ئەوەی کە هەستم دەکرد ئەو ئەشقە پاک و بێوێنە یان ئەوینێکی پڕ شکۆ نییە کە پێشتر بیرم لێ دەکردەوە و لایەنگری بووم. ئەمە ئەو تامەزۆریی و جەزبەیە نییە کە مرۆڤ بە هۆی ئەوەوە چێژ لە سەیر کردنی ئەشقی خۆی وەردەگرێ و سەرچاوەی تەواوی هەستەکانی خۆی لە وجوودی خۆیدا دەدۆزێتەوە. خۆی لە جێگای هەمووان دادەنێ و هەموو شتێک دەکاتە خۆی. لەو حاڵەتەش گەیشتووم. ئەوەی ئێستا هەستی پێدەکەم ئاواتی شادی و تێگەیشتن لە چێژی ڕۆحیش نییە، بەڵکوو شتێکی زۆر

جیاوازە. ڕەنگە من لە وجوودی ئەو کچەدا جوانییەکانی سروشتم دیتبێ و شەیدای بووبێتم. بەڵام لەو کارەدا ئازاد نیم. ئەوەی لە ناخی مندا ئەو کچەی خۆشدەوێ، وزەیەکی سەرەتایی و ساکارە کە تەواوی دەزگاکانی ئافراندن لە خۆ دەگرێ؛ تەواوی سروشت ئەو ئەشقە لە ڕۆحی مندا دەگوورێنێ و دەڵێ: ئاشق بە! من ئەوەم نەک هەر لە ڕێگای بیر و خەیاڵەوە، بەڵکوو بە ڕۆح و گیانەوە خۆشمدەوێ. لە کاتی خۆشەویستی ئەودا من خۆم بە بەشێکی جیانەکراوە لە تەواوی جیهانی پاک و پڕشکۆی خودای دلۆڤان هەست پێدەکەم.

ئێستا من بیر و باوەڕێکی نوێم لە ژیانی تەنیایی و دوورەپەرێزیی خۆم دەرکێشاوە و هێناومەتە سەر شانۆ؛ بەڵام هیچ کەس ناتوانێ تێبگا ئەم بیر و باوەڕە بە چ نزخێکگ لە نێو ڕۆحی مندا گووراوە و بە چ شادی و حەزێکەوە تێی گەیشتووم. هیچ کەس ناتوانێ تێبگا چۆن پێشوازی لەو ڕێگا نوێیە دەکەم کە لە بەر پێی ژیانمدا کراوەتەوە. من، هیچ شتێکم لەو بیر و باوەڕە خۆشەویستتر نەبووە .... دەی ئەوا ئەشق ئاوێتە ڕۆحم بوو و تەواوی ئەو بیر و باوەڕانەم بەبێ هیچ داخێک لە ناخمدا مرد و لە نێو چوو! تەنانەت تێگەیشتن لەو بابەتە بۆ من زۆر دژوارە کە چۆن دەمتوانی حاڵەتێکی ڕۆحی کە ئەو هەمووە بۆ من یەک لایەنە و ساردوسڕە و ئەو هەموو تەنگژە و گوشارە ڕۆحییەی لەگەڵدا بوو، بە لامەوە خۆشەویست بێ؟ جوانی هاتۆتە ئاراوە و تەواوی ئەو گرفت و کێشە دەروونییانەی سڕیوەتەوە و خەفەت بۆ هیچ شتێک ناخۆم کە ئاوا لە نێو چووە! لەخۆبردوویی، گەوجێتییە، ئەوپەڕی شێتییە. جۆرێک خۆپەرستییە، داڵدایەکە لە هەمبەر ئەو چارەڕەشییانەدا کە هەقی خۆمانە و شایانی ئەوەین. کەرەسەیەکی ڕزگار بوونە لە هەمبەر ئێرەییەکدا کە بە هۆی بەختەوەریی خەڵکەوە ڕۆحی داگرتووین. زیندوو بوون لە بەر خەڵکی! چاکە کردن! کاتێک ڕۆحی من لێوڕێژە لە ئەشقی خۆم و جگە لە خۆشویستنی ئەو هیچ ئاواتێکم نییە و دەمەوێ تەواوی پاشماوەی تەمەنم لەگەڵ ئەودا بم، ئەم قسانە چ کەڵکێکیان هەیە؟ ئەمڕۆ ئیتر

خۆشەویستیم بۆ خەڵکی، تەنیا بۆ خەڵکی و بۆ لووکاشکا ناویێ، ئێستا ئیتر ئەو خەڵکە، ئەو خەڵکەم خۆش ناویێ. پێشتر بە خۆمم دەگوت: «ئەم کارە خراپە، هەزار پرسیارم بۆ دەهاتە پێشێ و ئازاریان دەدام: چارەنووسی ئەو، چارەنووسی من و چارەنووسی لووکاشکا چیی لێدێ؟ ئێستا هەموو شتێک بۆ من یەکسانە. من لەبەر خۆم زیندوو نیم؛ شتێکی بەهێزتر لە خۆم، من بەرەو ڕێگایەکی نوێ پەلکێش دەکا، من ئازار دەکێشم، ئەوە ڕاستە، بەڵام پێشتر مردووویەکی بزۆک بووم و هیچی تر. ئێستاش زیندووم و هەناسە دەکێشم و دەژیم. هەرئێستا دەچم بۆ لایان و هەموو شتێکیان پێ دەڵێم.»

# سی و سێ

ئۆلێنین دوای ئەوەی ئەو نامەیەی نووسی، لای عەسر چوو بۆ ژووری خاوەنماڵەکەی. دایکی ماریانکا، لە پشت وەجاخەکەوە لە سەر ئەسکەملێک دانیشتبوو خەریکی شی کردنەوەی قۆزاخەی کرمی هەورێشم بوو. ماریانکا بە سەری ڕووتی لە بەر شۆقی مۆمێک خەریکی دروومان بوو. هەرکە چاوی بە ئۆلێنین کەوت هەستا، لەچکەکەی لە سەری پێچا و ڕۆیشت بۆ لای وەجاخەکە. ژنە گوتی: «ماریانکا گیان، مەڕۆ لە لای ئێمە دانیشە.»

ـ نا نا! سەرم ڕووتە.

پاشان ڕۆیشت بۆ پشت وەجاخەکە.

ئۆلێنین پەلوپووزی جوان و سپیوسۆڵی ماریانکای دی کە بە لێواری وەجاخەکەدا شۆڕ بووبۆوە. ئۆلێنین هەستا چایی بۆ دایکی ماریانکا تێکرد. ژنەش ماریانکای نارد نقشک بۆ ئەو بێنێ. ماریانکا قاپێکی نقشک هێنا لە سەر مێزەکەی دانا و سەرلەنوێ چووەوە سەر وەجاخەکە. ئۆلێنین هەستی بە ڕوانینی کچە دەکرد. ماوەیەک سەبارەت بە ماڵەکە قسەیان کرد. ژنە زۆر میوانگر و دەستودڵباز بوو. ترێ و نانەناسکە و شەڕابی بۆ ئۆلێنین دانا، هەموو هەڵسوکەوتێکی ژنە هەستی میواندۆستی و تایبەتی خەڵکێکی پێوە دیار بوو کە ئەو هەستە تووڕە و لەخۆباییی بوونە تەنیا لای کەسانێک هەیە کە نانی خۆیان بە ڕەنجی شان و ئارەقەی نێوچاوان بەدەست دەهێنن. ژنە بە جوانی میوانداریی لە ئۆلێنین کرد. ئەم ژنە کە سەرەتا تووڕەیی و ڕقەکەی ئۆلێنینی زویر کردبوو، ئێستا بەو هۆیەوە کە ئۆلێنین کچەکەی خۆشدەویست تەواو دڵی نەرم بووبوو و ڕێزی بۆ دادەنا.

ـ بۆ دەبێ لە خودا ناڕازی بین، خۆشەویستەکەم! شوکر بۆ خودا هەموو شتێکمان هەیە! چیخیرمان داناوە و خوێمان لێ داوە، دەتوانین سێ چلیکی

گەورە شەڕاب بفرۆشین و زۆریش بۆ خۆمان دەمێنێتەوە. تۆ جارێ لێرە بمێنەوە و بەجێمان مەهێڵە، بۆ زەماوەندەکەی ماریانکا بانگهێشتت دەکەین.

ئۆلێنین کە هەستی کرد سوور هەڵگەڕاوە و دڵی بە توندی لێدەدا، پرسیی: «زەماوەندەکە کەنگێیە؟»

لە پشت وەجاخەکەوە هەستی بە جووڵەیەک کرد و قرتەی تروووکاندنی تووی گوڵەبەڕۆژەی بیست.

ژنە زۆر سادە و لەسەرەخۆ، وەک ئەوەی ئۆلێنین هەر لەوێش نەبێ وەڵامی دایەوە: «بەڵێ حەوتووی داهاتوو زەماوەندە، ئێمە بە تەواوی ئامادەین. من هەموو شتێکم بۆ ماریانکا گیان ئامادە کردووە. ماریانکا بەختەوەر دەبێ. تەنیا شتێک تووشی دوودڵیی کردووین، ئەویش ئەوەیە لووکاشکا خەریکی کاری خۆیەتی و زۆر بە دڵ تێوەچووە! بەڕاستی کوڕێکی عەجوول و گونجڕە! لەم ڕۆژانەدا یەکێک لە کازاخەکان لە پاسگاوە هاتبوو دەیگوت لووکاشکا زۆربەی کات دەچێ بۆ لای نووقانییەکان.

ئۆلێنین گوتی: «خۆی بە کونێکەوە نەنێ!»

ـ منیش ئەوەم پێگوتووە. دەڵێم لووکاشکا گیان ئەوەندە سەرەڕۆ مەبە. بەڵام خۆت دەزانی گەنج هێندە کەللەپڕن خۆ بە گوێی هیچ کەس ناکەن. ئەوە ڕاستە لاوێکی بەهێز و بەجەرگە، لە هێرشێک خۆی دەرباز کردووە، ئەسپێکی دزیوە، پیاوێکی ئەبرەکی کوشتووە، بەڵام خۆ دەبێ ژیانێکی ئارامیشی هەبێ. ئەگەر واز لەو سەرەڕۆیی و شەڕەنگێزییانە نەهێنێ، بارودۆخەکە زۆر خراپ دەکەوێ.

ئۆلێنین بە لاچاوێک لە پشت وەجاخەکەی ڕوانی و گوتی: «وایە، منیش دوو جارم لە پاسگا دیتووە، هەمیشە سەرقاڵی کاری خۆیەتی، دیسان ئەسپێکی دیکەی دزیوە.»

دوو چاوی گەش و ڕەش تێی ڕامان و بە حاڵەتێکی جیددی و تۆسنانەوە چاوی تێبڕی. ئۆلێنین لەوەی گوتبووی پەژیوان بۆوە و سوور هەڵگەڕا. لە ناکاو ماریانکا گوتی: «دەی مەگین چی بووە؟ خۆ ئەو هیچ کەس ئازار نادا.

بە پـارەی خـۆی ڕایـدەبوێرێ.» پاشـان لاقـی بە لێـواری وەجـاخەکەدا شـۆڕ کردەوە و بـازی دایە خـوارێ، بەپەلە بەرەو لای دەرگـاکە ملـی پێوەنـا، چـووە دەرێ و دەرگاکەی بە توندی پێوەدا.

ئـۆلێنین هەتـا ئەو کـاتەی ئەو لە ژوورەکە بـوو، چـاوی بە دوایـدا دەگێـڕا. دوای ئەوە چـاوی لە دەرگـاکە بـڕی. مـاوەیەک چـاوەڕوان مـایەوە و وەهـا عەبەسرابوو، ئەوەی ئۆلیتـای پیر دەیگوت تێنەدەگەیشـت. چەنـد سـات دواتـر میوانەکان وەژوور کەوتن. پیرەپیاوێک کە بـرای ئۆلیتـا بـوو، مـامە ئیرووشـکا و بە دوای ئەویشـدا ماریانکـا و ئۆسـتینکا هـاتنە ژوورێ. ئۆسـتینکا گـوتی: «دەی، ئەمڕۆت چۆن ڕابواردووە؟» پاشـان ڕووی قسـەی لە ئـۆلێنین گـوتی: «هەمیشە خەریکی خۆشگوزەرانیی، دیارە چاکی بۆ گرتووی.»

ئۆلێنین وەڵامی دایەوە: «بەڵێ، بەڵێ.»

دیسان هەستی بە تریق بوونەوە کرد، بێ ئەوەی بزانێ هۆکارەکەی چییە. ئۆلێنین دەیویست بڕوا، بەڵام نەیدەتوانی. بێدەنگ بوونیش ئەستەم بوو بۆی، بـاش بـوو پیرەپیـاو لەو پەشـۆکاوی و نـاڕەحەتییە دەریهێنـا. داوای لێکـرد لەگەڵـی بخـواتەوە و پێکەوە دەسـتیان پێکرد. پاشـان لەگەڵ مـامە ئیرووشـکا خــواردیەوە و هەرچــی زیــاتری دەخــواردەوە، زیــاتر دڵــی دەگیــرا. بەڵام پیرەپیاوەکان هەروا دەیانخواردەوە. ماریانکا و ئۆستینکا لەسـەر ئۆجـاخەکە دانیشـتن، سـرتەیان دەکـرد و چاویـان لە پیرەپیاوەکـان دەکـرد. بەڵام ئەوان هەتـا درەنگانێ هەر خواردیـانەوە. ئـۆلێنین هیچـی نەدەگـوت و لە هەموویـان زیـاتری دەخـواردەوە. کازاخەکـان دەسـتیان کـرد بە چڕەوگـوڕە. پیرێـژن دەیویســت دەریانکــاتە دەرێ و ئیتــر چیخیــری بــۆ تێنەدەکــردن. کچەکــان گاڵتەیان بە مامە ئیرووشکا دەکرد، نزیکەی کاتژمێر دە بوو کە هەموویـان لە ژوورەکە چــوونە دەرێ و لە ســەر قاڵــدرمەکان ڕاوەســتان. پیرەپیاوەکــان خۆیـان بانگهێشـتن کـرد کە دوابەشـی میـوانییەکە لە لای ئـۆلێنین ڕابـوێرن. ئۆستینکا ڕۆیشتەوە بۆ ماڵی خۆیان. ئیرووشکا و پیرەپیاوی کازاخ چوون بۆ لای ژانۆ. دایکی ماریانکـاش چـوو بـۆ ئـاغەڵەکە تـاکوو بە ئاژەڵەکان ڕابگـا و

ماریانکا بە تەنیا لە ژووریٚ مایەوە. ئۆلێنین هەستی دەکرد شاد و بەدەماغە و تین و گوڕی هاتۆتەوە بەر، دەتگوت تازە لە خەو هەستاوە. ئەو هەموو شتێکی دیتبوو. ڕاوەستا هەتا پیرەپیاوەکان ڕۆیشتن و خۆی دیسان گەڕایەوە بۆ ژووری خاوەنماڵەکەی. ماریانکا دەیویست بخەویٚ، ئۆلێنین چوو بۆ لای. ویستی شتێک بڵیٚ، بەڵام دەنگی لە گەروویدا قەتیس ما و زمانی لە گۆ چوو. ماریانکا لە سەر قەرەوێڵەکەی دانیشت، چوارمەشقی لە نێو جێگاکەیدا خۆی کۆ کردەوە، لێفەکەی لە خۆی ئاڵاند و سرک و ترساو چاوی لە ئۆلێنین بڕی. دیار بوو دەترسیٚ. ئۆلێنین تێگەیشت و هەستێکی داخاوی و پڕ بەزەیی ناخی داگرت. لەگەڵ ئەوەشدا، لەوەی کە توانیبووی لانیکەم هەستێکی ئەوتۆ لە وجوودی ماریانکادا بجووڵێنیٚ، ڕەزایەتێکی ئاوێتەی غوروری لە خۆیدا هەست پێکرد و گوتی: «ماریانکا، تۆ دڵت پێم ناسووتیٚ؟ تۆ نازانی من چەندەم تۆ خۆشدەویٚ؟»

ئەو دیسان دوورتر کەوتەوە.

ـ دیتووتە شەڕاب بۆتە هۆی ئەوەی قسەی ئاوا بکەی؟ نا، من هیچ کارێکم بە تۆ نییە.

ـ نا، شەڕاب وای لیٚ نەکردووم، شوو بە لووکاشکا مەکە. شوو بکە بە من.

هەر لەو کاتەدا کە ئەو قسانەی دەکرد، بە بیریدا هات: «ئەوا من چی دەڵێم؟ یانی سبەینێش ئەو قسانە دەکەم؟!» دەنگێک لە ناخی خۆیەوە وەڵامی دایەوە: «بەڵیٚ، دەیڵێم، هەرئێستاش دووپاتی دەکەمەوە.»

ـ تۆ دەبیتە هاوسەری من؟

ماریانکا بە شێوەیەکی واق وڕماوانە چاوی لێکرد. لەوە دەچوو ترسەکەی ڕەویبێتەوە.

ـ ماریانکا، خەریکە شێت دەبم. من ئیتر خۆم نیم، تۆ هەرچی بڵێی من وا دەکەم. ـ وشەی پڕ لە خۆشەویستی بیٚ ئیختیار لە زاری ئۆلێنین دەهاتنە دەریٚ.

ماریانکا دەستی ئۆلێنینی گرت کە بەرەو لای ئەو ڕایگرتبوو و گوتی: «ئەوە چییە تۆ دەیڵێی؟» ـ بەڕاستی دەستی ئۆلێنینی بەرنەدا و بە قامکە ئەستوورە بەهێزەکانی گوشیی، پاشان گوتی: «مەگین ئاغاکان لەگەڵ کازاخی هەژار و بێ ماڵوحاڵ ژیانی هاوبەش پێکدێنن؟ بڕۆ! ئیتر لەو قسانە مەکە!»

ـ شووم پێدەکەی؟ هەموو شتێک ...

ماریانکا دەستی کرد بە پێکەنین.

ـ ئەی لووکاشکا چی لێ بکەم؟ بیرت لەوە کردۆتەوە؟

ئۆلێنین دەستی لە دەستی ماریانکا دەرکێشا و بەژنوباڵا نەرم و لەبارەکەی لە باوەش گرت و توند بە خۆیەوە گوشی. بەڵام ماریانکا وەک هەڵووک لە جێی خۆی دەرپەڕی و بە قەڵەمبازێک خۆی گەیاندە سەر قاڵدرمەکان. ئۆلێنین وەخۆ هاتەوە، ترسێک سەرتاپای داگرت. دیسان خۆی زۆر سووک هاتە بەرچاو و هەستی دەکرد قەت شایانی ئەوە نییە ببێتە هاوژینی کچێکی ئاوا زیرەک و بەجەرگ. بەڵام بێ ئەوەی بۆ ساتێک لە قسەی خۆی پاشگەز بێتەوە، گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی و بێ ئەوەی چاو لە پیرەپیاوەکان بکات کە خەریکی خواردنەوە بوون، لە سەر قەرەوێڵەکەی خۆی لە گەزدا و خەوێکی قورس دایگرت، خەوێک کە لە مێژ بوو باوەشی لە ڕۆح و جەستەی وەرنەهێنابوو.

# سی و چوار

سبەینێی ئەو ڕۆژە جێژن بوو. دوانیوەڕۆی ئەو ڕۆژە خەڵکی گوندەکە ڕژابوونە کۆڵانەکان و جلوبەرگە ڕازاوەکانیان لە بەر تیشکی خۆر درەوشایەوە. زیاتر لە جێژنەکانی دیکە شەڕابیان ئامادە کردبوو و هەموو خەڵکی لە کاری ڕۆژانە گەڕابوونەوە. مانگێکی تر کازاخەکان دەچوون بۆ هەوار و زۆربەی بنەماڵەکان خەریکی ئامادە کردنی کاروباری زەماوەند بوون. گۆڕەپانی بەر دایرەی کارگێڕیی گوند و لە نزیک و دوور دووکانی شیرینی فرۆشی و بەزازییەک کە لەچکە و دەسماڵ و قوماشی لۆکەیی دەفرۆشت، لە هەموو شوێنێک قەرەباڵغتر بوو. پیرەپیاوەکان، زیپوونی خۆڵەمێشین و ڕەشی بەبێ مەنگوڵە و ڕازاوەیان لە بەر کردبوو، بە قەڵافەتێکی قیتوقۆز و قورساخەوە لە سەر سەکۆی دایرەکە دانیشتبوون. بە دەنگێکی نەرم و ئارام سەبارەت بە داهاتی ساڵانە و گەنجان و کاروبارەکانی گوند و ساڵانی ڕابردوو دەدوان، بە چاوێکی پڕ سەرکۆنە و بێ موبالاتییەوە لە گەنجەکانیان دەڕوانی، ژنان و کچان کە بە بەردەمیاندا تێدەپەڕین، چرکەیەک ڕادەوەستان و سەریان دادەخست. کازاخە لاوەکان، هەنگاویان شل دەکردەوە، بە ڕێزەوە کڵاوەکانیان دادەگرت و چەند ساتێک بە دەستەوەیان دەگرت. هێندێکیان بە شێوەیەکی گرژ و وشک، هێندێکیشیان بە ڕوویەکی خۆشەوە چاویان لە ڕێبوارەکان دەکرد و بە هێواشی کڵاوەکانیان دادەگرت و دیسان لە سەریان دەکردەوە.

ژنان هێشتا دەستیان نەکردبوو بە سەمای بەکۆمەڵ. ڕەنگی بەشمیتەکانی بەریان تۆخ و لەچکەی سپییان لە سەریان پێچابوو و هەتا سەر برۆیان داپۆشیبوو. لە دەوری یەک کۆ ببوونەوە و لە چەند شوێن کۆزیلکەیان بەستبوو، لەسەر زەوی و بەردەرگای ماڵەکان لە بەر پڕشنگی کەشوتووشی

خـــۆری پـــاش نیـــوەڕۆ دانیشـــتبوون، دەنگـــی پێکەنـــین و چەنەوەری و تریقانەوەیان کۆڵانەکانی داگرتبوو. منداڵان و کچان و کوڕان تۆپێنیان دەکرد و تۆپەکەیـان زۆر بەرز بەرەو ئاسـمانی ڕوونـاک هەڵدەخسـت و بە هەڵات هەڵات و هەراوهوریا بە گۆڕەپانەکەدا ڕایاندەکرد. کچانی گەورەتر، ئێستا لە سووچێکی تر دەستیان گرتبوو و هەڵدەپەڕین، بە دەنگێکی تیژ و زایەڵەدار گۆرانییـان دەگوت. کاغەزنووسـەکان، ئەو کازاخـانەی مۆڵەتیـان وەرگرتبـوو، ئەو کورە گەنجانەی بۆ جێژن هـاتبوونەوە بۆ گونـد، هەموویـان چەرکسـای نوێی سپی یان سووری ڕازاوە بە مەنگوڵەیان لە بەر کردبوو؛ بە ڕوخسـاری بـزە تێـزاوەوە دوو-دوو و سـێ-سـێ دەسـتیان لە دەسـتی یەک نـابوو و بە دەوری کچەکانـدا دەسـووڕانەوە و لەم کـۆڕەوە بـۆ کـۆڕێکی تـر دەڕۆیشـتن، هێنـدێ جـار ڕادەوەسـتان و لەگەڵ کچەکـان گاڵتەوگەپیـان دەکـرد و سـەریان دەخستە سەریان.

دووکانـداری ئەرمەنـی چەرکسـایەکی شـین و نـوێی مـاهووتی ناسـکی لە بەردا بـوو کە زۆری گێزوگوڵێنگ پێوە هەڵواسـرابوو. لەبەر دووکـانەکەی کە لەچکە و دەسـماڵی ڕەنگاوڕەنگ هەڵواسـرابوون، بە پۆز و دمـارێکی تـایبەتی فرۆشـیارانی ڕۆژهەڵاتـی و ئاگـادار لە گرنگـایەتیی خـۆی، چـاوەڕوانی هـاتنی کڕیار بوو. دوو کەسی چێچێنی، کە لەوبەری چۆمەکەوە هـاتبوون بۆ سـەیر کردنـی جێـژن و شـایی، لە بەردەرگـای مـاڵی یەکێـک لە دۆسـتانی خۆیـان هەڵترووشـکابوون، بەبـێ جلـوبەرگی مـۆڵەت و بە کـڵاوی کـۆنەوە جارجـار هەڵدەسـتان و بەپەلە بە نێـو خەڵـکەکەدا دەسـووڕانەوە و سـەرلەنوێ دەچوونەوە جێی خۆیان.

ئێسـتا لە هەمـوو لایەکەوە دەنگـی گـۆرانی و بەزمـوڕەزمی کازاخەکـان دەهـات کە شـەڕابیان خواردبـۆوە و سـەرخۆش بـوون. دەرگـای حەوشـەی هەمـوو ماڵەکـان ئـاواڵە بـوون، بەردەرگـا گەسـک درابـوون و ئـاوپڕژێن کرابـوون، قاڵدرمەی هەمـوو ماڵەکـان لە شـەوی ڕابـردووەوە شـۆرابوونەوە. تەنانەت پیرێژنەکانیش لە ماڵێ هاتبوونە دەرێ. لە نێو کۆڵانەکان و لە چەقی

خۆڵینی گۆڕەپانەکەدا تۆوی کوولەکە و کاڵەک لە ژێر پێدا ورد دەبوون. هەوا گەرم و سـریوەی بـا نەدەهـات، ئاسـمان سـاماڵ و شـین و ڕوونـاک بـوو. کێوەکان بە ڕەنگێکی سپیی ماتەوە، لە ژوور سەربانی ماڵەکانەوە دیار بوون و زۆر نزیک دەهاتنە بەرچاو، لووتکە تاوگرەکانیان لە ژێر پڕشنگی مەیلەو زەردی ئێوارەدا سووریان دەنواند. هێندێ جار لەوبەری ڕۆخەکەوە تەقەی تفەنگێـک دەبیسـترا. بەڵام دەنگـی گـۆرانی و شـادی و پێکەنـین تەواوی گوندەکەی داگرتبوو.

ئۆلێنین تەواوی مـاوەی پـێش نیـوەڕۆ لە حەوشـەکە پیاسـەی کردبـوو و چاوەڕوان بوو ماریانکا لە ژوورەکە بێتە دەرێ. بەڵام ئەو کاتێک کارەکانی ماڵێی تەواو کرد، زۆر بە پەلە ڕۆیشت بۆ کلێسا. پاشان ئۆلێنین چاوی پێی کەوت هێندێ جار لە بەردەرگای حەوشەکەیان دادەنیشت تووی دەترووکاند و هێنـدێ جـاریش لەگەڵ دەستەخوشـکەکانی دەهـاتەوە بـۆ حەوشـە و بە بزەیەکی شیرین و شادەوە چاوی لە کرێنشینەکەی خۆیان دەکرد. ئۆلێنین دەترسا بە زمانێکی گاڵتەئامێز و لە لای چەند کەسی بێگانە سەری قسەی لەگەڵدا بکاتەوە. دەیویست دانووستانەکانی شەوی ڕابردووی کۆتایی پێ بێنێ و وەڵامێکی ڕاشکاوانە ببیستێ. بەڵام کاتی لەبار هەڵنەدەکەوت و ئیتر نەیدەتوانی لەو حاڵەتە بێ ئاسۆییەدا خۆی ڕاگرێ. ماریانکا سەرلەنوێ چوو بۆ کۆڵان، ئۆلێنینیش بێ ئەوەی بزانێ بۆ کوێ دەچێ، بە دوایدا ملی پێوەنا. پاشان بەو لایەدا ڕۆیشت کە ماریانکا بە ڕوخساری گەشاوە و بە بەشمیتی هەورێشمی شینەوە دانیشتبوو. دەنگی پێکەنینی لاوێکی لە پشت خۆیەوە هاتە گوێ.

ماڵی بیلێتسکی لە تەنیشت گۆڕەپانەکە هەڵکەوتبوو. ئۆلێنین هەروا کە بە بەردەمـی ماڵەکەیانـدا تێـدەپەڕی، دەنگـی بیلێتسـکی بیسـت کە دەیگـوت «فەرمووا!» ئۆلێنین چووە ژوورەوە.

دوای ئەوەی هێنـدێک پـێکەوە دووان، هەردووکیـان لە بەرپەنـجەرەکە دانیشتن. دوای ماوەیەکی کورت ئێرووشکا کە بەشمیتە نوێیەکەی خۆی لە

بەر کردبوو، هات بۆ لایان.، سڵاوی کرد و لە بەردەمیان لە سەر تەرکی ژوورەکە دانیشت. بیلێتسکی بە بزەیەکەوە و لەگەڵ ئەوەی جگەرەیەک لە بەینی قامکیدا بوو، هەر بەو دەستەی ئاماژەی بە پۆلی ڕەنگاوڕەنگی کچان کرد و گوتی: «ئەو پۆلە کچە خانەدانەتان دیتووە؟ یارەکەی منیش لەگەڵیانە، کراسی سووری لە بەردایە. ئەو کراسەی تازە کڕیوە.» پاشان لە پەنجەرەکەوە چاوی لە دەرێ کرد و دەنگی هەڵبڕی: «دەی مەگین هەڵپەڕکێ دەست پێناکا؟» ڕووی لە ئۆلێنین کرد و گوتی: «ڕاوەستە با هەوا تاریک بێ، ئێمەش دەچین. کچەکان بانگهێشتن دەکەین بۆ ماڵی ئۆستینکا. دەبێ میوانداربیەکی باشیان لێ بکەین.»

ئۆلێنین بە لەبزێکی لێبڕاوانەوە گوتی: «منیش دێم بۆ ماڵی ئۆستینکا. ماریانکاش لەوێ دەبێ؟»

بیلێتسکی بەبێ ئەوەی تووشی کەمترین سەرسووڕمان بێ گوتی: «جا دیارە لەوێ دەبێ. تۆش حەتمەن وەرە.» پاشان پۆلی ڕەنگاوڕەنگی کچانی نیشان دا و گوتی: «دیتووتە چەندە جوانن.»

ئۆلێنین لەگەڵ ئەوەی هەوڵی دەدا خۆی زۆر هۆگر نیشان نەدا، قسەکەی بیلێتسکی پەسند کرد و گوتی: «بەڵێ زۆر جوانن، لەم جێژنانەدا شتێک کە تووشی سەرسووڕمانم دەکا ئەوەیە کە تەنیا بەو هۆیەی ئەمڕۆ بۆ وێنە پازدەی مانگە، تەواوی خەڵکی ئاوایی بێ ئیختیار هەست بە شادی و حەساوەیی دەکەن. بۆنی جێژن وڵاتی داگرتووە. چاوەکان، ڕوخسارەکان، جووڵانەوە و دەنگەکان و جلوبەرگ و هەوا و هەتاو هەموو جێژنیان گرتووە. بەڵام ئێمە، ئێمە لە مانای ئەم جێژنە تێناگەین.»

بیلێتسکی کە حەزی لەو جۆرە بیر و باوەڕانە نەبوو، گوتی: «ڕاست دەکەی وایە.» پاشان ڕووی قسەی لە ئێرووشکا کرد و گوتی: «دەی پیرەپیاو، تۆ بۆچی شەڕاب ناخۆیەوە؟»

ئێرووشکا بە ئاماژەی چاو بیلێتسکیی پیشان ئۆلێنین دا.

ـ دەڵێی چی؟ ئەو هاوڕێیەت زۆر لەخۆباییە!

بیلێتسکی پێکەکەی خۆی بەرز کردەوە و گوتی: «ئەڵڵاویردی![٦٣]» پێکەکەی هەڵدا.

ئیرووشکا بە پێکەنینەوە گوتی: «سائوبول (بە خۆشیت)» ئەویش پێکەکەی خۆی هەڵدا. پاشان لە جێی خۆی هەستا و بە ئۆلێنینی گوت: «تۆ دەڵێی جێژن! ئەمە چ جێژنێکە؟ بریا ئەو کاتانە لێرە بووایەی و بتدیبایە کە خەڵکی چەن خۆشی ڕادەبوێرن! ژنان ساراڤۆنی جوان و مەنگوڵەداریان لەبەر دەکرد و لە ماڵەکانیان دەهاتنە دەرێ. دوو ڕیزیان سکەی ئاڵتوون بە سەر سینگیاندا شۆڕ دەکردەوە و سەریان بە کۆکۆشنیکی زێڕین دەرازاندەوە. کاتێک بە ڕێدا دەڕۆیشتن خشەخشی داوێنی کراس و خرینگەی خشڵ و زەمبەر ڕۆحی بە بەر مردوودا دەکردەوە. هەر ژنەی خۆی شازادەیەک بوو. ژنان ئاوا پۆل پۆل لە ماڵەکانیان دەهاتنە دەرێ و گۆرانییان دەگوت. دەنگی خۆش و دڵڕفێنیان هەموو گوندەکەی دادەگرت. شەوێ هەتا بەیانی بەزم و شادی بوو و پیاوان چلیکی پڕ لە شەڕابیان بە نێو حەوشەی ماڵاندا دەگێڕا، لە دەوری یەک کۆ دەبوونەوە و هەتا بەیانی شەڕابیان دەخواردەوە. یان دەستی یەکتریان دەگرت و پۆل پۆل بە نێو ئاواییدا دەسووڕانەوە. هەرچییەک بهاتبایەتە سەر ڕێگایان هەڵیاندەگرت و کۆڵان بە کۆڵان دەگەڕان. جاری وا بوو سێ ڕۆژ لە سەر یەک جێژنیان دەگرت. لە بیرمە باوکم لەو شەوانەی جێژندا سوور هەڵدەگەڕا و تێروپڕ و بە سەری بێ کڵاوەوە دەهاتەوە بۆ ماڵێ. ئەوی پێی بوو لەملا و لەولا ونی کردبوو. بەم شێوەیە دەهاتەوە بۆ ماڵێ و دەیویست بخەوێ. دایکم لە پێشدا دەیزانی باوکم پێویستی بە چییە. بۆ ئەوەی حاڵی بێتەوە سەرخۆ کاڤیاری تازە و چیخیری پێویست بوو. پاشان دایکم بە دوای کڵاوەکەی باوکمدا تەواوی گەڕەک و کۆڵانەکانی سەنگوسووژن دەدا. باوکم بەو شێوەیە دوو ڕۆژی ڕەبەق دەخەوت! پیاوانی ئەو کات ئاوا بوون و هی ئەمڕۆش ...»

---

٦٣ یانی خودا داویە. ئەم وشانە شادیانەی ئاسایی خەڵکی قەفقازە، کاتی خواردنەوەی شەڕاب.

بیلێتسکی لێی پرسی: «ئەی کچان، ئەوانیش سارافۆنیان لە بەر دەکرد؟»

ـ بەڵێ، سارافۆنی ساکاریان لە بەر دەکرد. کازاخەکان هێندێ جار بە سواری و هێندێ جاریش بە پێیان دەهاتن و دەیانگوت: یا ئەڵڵا، با شاییەکەیان لێ بشێوێنین! لەپڕێکدا ئاوقایان دەبوون. کچەکانیش دەستیان دەدایە دار و پەیاغ. هێندێ جار لە ڕۆژانی کۆتایی کەرنەڤاڵدا کە خواردنی گۆشت ئازاد بوو، کچەکان کازاخێکی بەغیرەتیان دەگرت و بە ئەسپەکەوە دەیاندایە بەر زەبری تێلا و پەیاغ. پاشان بە زنجیرێک دەیانبەستەوە. ئەویش کتوپڕ زنجیرەکەی دەپساند و یەکێک لە کچەکانی دەگرت و دەیڕفاند. کچیش هەر باسی مەکە، هەموو دەتگوت لەگەڵ تەرزە باریون!»

# سی و پێنج

لەو کـــاتەدا لە کـــۆڵانێکی لای ڕۆخەکەوە دوو کەس بە ســـواری هـــاتن . گەیشـــتنە گۆڕەپـــانەکە. یەکیـــان ناســـایر و ئەوی دیکەشـــیان لووکاشـــکا بـــوو. لووکاشکا قیتوقۆز و گورج و چالاک لە سەر پشتی ئەسپە کوێتەکەی خۆی دانیشتبوو. ئەسپی ڕەسەنی کاربادا، بە هێواشی سمی دەنا بە تەرکی ڕەقی ڕێگـاکەدا و ســـەری جـوان و یـاڵوبژە نەرمەکەی دەجووڵانـدەوە. لووکاشـکا تفەنـــگەکەی شـــارەزایانە لە بەرگە قایشـــەکەی هەڵکێشـــابوو، دەمـــانچەکەی نێوقەدی بەستبوو و کڵاوەکەی بۆ دواوە کشابۆوە. هەموو ئەوانە نیشاندەری ئەوە بـوو کە لووکاشـکا لە شـوێنێکەوە هـاتۆتەوە کە نە دوور لە کێشـەیە و نزیکیشە. لە هەڵسوکەوتە جوان و بەشکۆکەیدا و لە جووڵانی بێ موبالاتانەی دەستیدا، کە بە هێواشی قامچیی لە زگی ئەسپەکە دەدا و بەتایبەت لە چاوە ڕەش و گەشـەکانیدا، کە بە شـێوەیەکی لـووتبەرزانە چـاوی دەتروو‌کانـد و لە هەموو لایەکی دەڕوانی، وزە و متمانەی لاوی شـەپۆڵی دەدا. لەو کاتانەدا وات بە بیـــردا دەهـــات کە ئەو چـــاوانە لە هەر جێـــیەک بـــڕوانن، هـــاوار دەکەن: لووکاشـکای بەجەرگتـان دیتـووە؟ ئەسـپە ڕەسـەنەکەی بە زیـن و ڕەختـی زێوینەوە و سوارێکی جوانچاک کە قیت لە سەر پشتی دانیشتووە، سەرنجی تەواوی ئەو خەڵکەی ڕاکێشا کە لە گۆڕەپانەکە کۆ بووبوونەوە. ناسایر لاواز وردیلە بوو و بە هیچ شێوەیەک لەگەڵ لووکاشکا هاوشان نەبوو. لووکاشکا کە گەیشتە بەردەمی پیرەپیاوەکان، کڵاوە سپییەکەی لە سەری داگرت و قژە ڕەش و پـڕەکەی وەدەرکەوت. پیرەپیـاوێکی خـڕپلانە کە چـاوێکی مژمـۆر و بـرۆی پـڕ و درێـژی هەبـوو لێـی پرسـی: «دەی، وا دیـارە زۆرت ئەسـپ لە نووقانییەکان دزیوە؟»

لووکاشکا سەری وەرسووڕاند و وەڵامی دایەوە: «باوەگەورە، تۆ خۆشت دەزانی دەڵێی چی؟»

پیرەپیاو بە ڕوانینێکی مژمۆرانەترەوە گوتی: «کەوایە ئەو کوڕەت بۆچی لەگەڵ خۆتدا بردووە؟»

لووکاشکا لە دڵی خۆیدا گوتی: «پیرە شەیتان! هەموو شتێک دەزانیٚ.» پاشان ڕوخساری حاڵەتێکی بیرمەندانەی لە خۆ گرت! بەڵام لە ناکاو چاوی بە سووچێکی گۆڕەپانەکە کەوت کە پۆلێک کچی عازەب لەویٚ کۆ بووبوونەوە و ئەسپەکەی بەرەو ئەویٚ لێخوڕی. بە دەنگێکی بەرز وەک ئەوەی لە زارکی کەڕەنایەک بێتە دەرەوە گوتی: «کچەکان سڵاو، بەبیٚ من خۆتان پیر دەکەن! هەی جادووبازانە!» پاشان ئەسپەکەی بە تەواوی ڕاگرت و دای لە قاقای پێکەنین.

چەند دەنگی شاد وەڵامیان دایەوە: «سڵاو، لووکاشکا! سڵاو کوڕی جوان! حەتمەن زۆرت پارە پێیە! هاتووی شیرینیمان بۆ بکڕی؟ لێرە زۆر دەمێنیەوە؟ لەمێژە هیچ کەس چاوی پێت نەکەوتووە.»

لووکاشکا قامچییەکەی هەڵسووڕاند و ئەسپەکەی بۆ لای کچەکان ڕادا و گوتی: «من و ناسایر هاتووین ئەمشەو لێرە بە خۆشی ڕایبوێرین.»

ئۆستینکا هەنیشکی لە کەلەکەی ماریانکا کوتا و بە پێکەنینەوە گوتی: «ماریانکا زانیوتە لووکاشکا بە تەواوی تۆی لە بیر بردۆتەوە؟»

ماریانکا لە ئەسپەکە دوور کەوتەوە، ئاوڕی دایەوە، بە هەردوو چاوە گەشەکانی لە لووکاشکای ڕوانی و بە لەبزێکی ساردوسڕ گوتی: «هەر بەڕاست لەمێژە لێرە ڕۆیشتووی! چییە ئاوا هاتوویە پێشیٚ و خەریکی بمانخەیتە ژێر سمی ئەسپەکەت!» ماریانکا ئەوەی گوت و پشتی لە لووکاشکا کرد.

لووکاشکا شاد و دڵخۆش دیار بوو. ڕوخساری شادی و گوڕوتینی لە خۆ گرتبوو. وەڵامەکەی ماریانکا موچڕکی بە دڵیدا هێنا. لووکاشکا نێوچاوانی تێکنا. لە ناکاو بە سڕینەوەی هەرچەشنە گومانێک هاواری کرد: «وەرە لە پشتمەوە

سوار بە. دەتبەم بۆ ئەو کوێستانانە.» پاشان بۆ لای ماریانکا دانەوییەوە و گوتی: «دەمهەوێ ماچت بکەم. ئێستا دەیبینی چۆنت ماچ دەکەم!»

چاویان لە چاوی یەکتر بڕیبوو، ماریانکا سوور هەڵگەڕا و هەنگاوێک کشایە دواوە و گوتی: «لە کۆڵم بەوە! بڕۆ دواو، سمی ئەسپەکەت لاقی ورد کردم!» سەری داخست و لە لاقە جوان و ناسکەکانی خۆی ڕوانی. گۆرەوییەکی شینی ڕێڕێی لە پێدابوو، جووتێک چوویاکی سووری نوێی بە کەلبەدوونی زێوینەوە لە پێ کردبوو. لووکاشکا بۆ لای ئۆستینکا وەرسووڕا و ماریانکا لە پەنا ژنێکی منداڵەبەری کازاخدا دانیشت. منداڵەکە خۆی کێشا بۆ لای ماریانکا و بە دەستە نەرم و خرپنەکەی ئەو هەیاسە زێوەی گرت کە بە سەر بمشیتە شینەکەیدا لە پشتی بەستبوو. ماریانکاش بۆ لای منداڵەکە داهاتەوە و لە بنەوە چاوی لە لووکاشکا کرد. لووکاشکا لەو کاتەدا دەستی کرد بە باخەڵی چەرکساکەیدا و لە گیرفانی بەشمیتە ڕەشەکەی بەستەیەکی شیرینی و تووی گوڵەبەڕۆژە دەرهێنا. بەستەکەی بۆ لای ئۆستینکا ڕاداشت و بە پێکەنینەوە لە ماریانکای ڕوانی و گوتی: «ڕەنگە ئەوەتان بەس بێ. بەشی هەمووتان دەکا.»

شلەژانێک سەرلەنوێ ڕوخساری کچەی داگرت. چاوە جوانەکانی تەمێکیان بە سەردا کشا. دەستی لە لەچکەکەی بەردا کە بکەوێتە بەر چەنەی و لێوی وەدەرکەوت. سەری بۆ لای دەموچاوی سپی و خڕی مناڵەکە وەرسووڕاند کە هەروا هەیاسە زێوینەکەی بە دەستە خرپنەکانی گرتبوو و تامەزۆریانە دەستی کرد بە ماچ کردنی. منداڵەکە بە دەستە چکۆلەکانی خۆی بە سنگی ماریانکاوە نووساندبوو و بە دەمە جوان و بێ ددانەکەی گڕوگاڵی دەکرد و دەیقریشکاند. ژنە منداڵەکەی لە باوەشی ماریانکا دەرکێشا، بەرکۆژەی بەشمیتەکەی ترازاند بۆ ئەوەی شیر بدات بە منداڵەکەی و گوتی: «بۆچی وەک شەوە بە منداڵەکەمەوە نووساوی و هەڵیدەگوشی! وا باشترە دەزگیرانەکەی خۆت ماچ بکەی!»

لووکاشکا قامچییەکی لە ئەسپەکەی ڕاکێشا و گوتی: «من دەچمەوە بۆ ماڵێ ئەسپەکەم دادەکەم و لەگەڵ ناسایر دێینەوە بۆ ئێرە تاکوو ئەمشەو بە خۆشی ڕایبوێرین.»

ئەسپەکە دەستی کرد بە وێرغە و لە کچەکان دوور کەوتەوە. کاتێک لووکاشکا و ناسایر لە کۆڵانەکانی خوارووی گوند چوونە دەرێ، گەیشتنە دوو ماڵی پێکەوە لکاو. لووکاشکا ڕاوەستا لە بەر گەلەخانی تەنیشتنی دابەزی و بە پارێزەوە ئەسپەکەی بەرەو ژوورێ ڕادا و گوتی: «گەیشتین برا گیان! زوو کە!» پاشان ڕووی لە خوشکە لاڵەکەی کرد کە ئەویش جلوبەرگی نوێی لە بەر کردبوو و بۆ وەرگرتنی ئەسپەکە لە کۆڵانەوە هاتبۆوە بۆ ماڵێ و گوتی: «سلاو، ستیڤانی!» پاشان بە ئاماژە تێی گەیاند کە ئەسپەکە لە بەر ئاخوڕەکەدا ببەستێتەوە، بەڵام ڕەخت و زینەکەی لێ نەکاتەوە.

کچە دەنگێک لە گەرووی هاتە دەرێ. لێوی جووڵاند و ئاماژەی بە ئەسپەکە کرد و قەپۆزی ئەسپەکەی ماچ کرد. مانای ئەو کارەی ئەوە بوو کە ئەو ئەسپی خۆشدەوێ و ئەسپ زۆر جوانە.

لووکاشکا تفەنگەکەی بە دەستەوە گرت و هات بۆ سەر قاڵدرمەکان، بانگی دایکی کرد و گوتی: «سلاو دایە گیان! وا دیارە هێشتا نەچوویە دەرێ؟»

دایکی درگاکەی لێ کردەوە و گوتی: «من چاوەڕوانی تۆ نەبووم، پێم وا نەبوو دەگەڕێیتەوە. سیریاک دەیگوت تۆ خەیاڵت نییە بەم زووانە بێیتەوە.»

ـ دایە گیان، زوو چیخیرم بۆ ئامادە بکە. ئێستا ناسایر دێ بۆ ئێرە. ئێمە دەمانەوێ بۆ جێژن بەزم و شادی ساز بکەین.

ـ هەرئێستا لووکاشکا گیان، هەرئێستا بۆت ئامادە دەکەم. هەموو ژنەکان دڵیان خۆشە. پێم وایە لاڵەی خۆشمان چۆتە دەرێ.

دایکی لووکاشکا دەستی دا کلیلەکە و ڕۆیشت بۆ لای هەمبارەکە. ناسایریش دوای ئەوەی ئەسپەکەی داکرد، تفەنگەکەی هەڵگرت و هات بۆ لای لووکاشکا.

# سی و شەش

لووکاشکا جامێکی پڕ لە چیخیری لە دایکی وەرگرت، بە ئارامی بەرزی کردەوە و پێش ئەوەی بینی پێوەنێ، گوتی: «بە خۆشیی تۆ!»

ناسایر گوتی: «دیتووتە چیمان کردووە؟ گوێت لێبوو بۆرلاکی پیر گوتی: حەتمەن زۆرتان ئەسپ دزیوە؟ کەوایە ئاگای لە هەموو شتێکە.»

لووکاشکا لە بن لێوەوە گوتی: «پیرە شەیتان!» پاشان سەری ڕاوەشاند و گوتی: «کوڕە هەر گوێیشی مەدەیە! ئێستا ئەسپەکانیان گەیاندۆتە ئەوبەری ڕووبارەکە. لێی گەڕێ با بە کەیفی خۆیان بیرێسن. هەرکەس پیاوە بچێ بیاندۆزێتەوە!»

- بەڵام زۆرم پێ ناخۆش بوو.

- کوڕە گوێی مەدەیە! سبەینێ چۆڕێ چیخیری بۆ بەرە و دەمی ببەستە، چارەکەی هەر ئەوەیە و خەمی هیچت نەبێ. ئێستا دڵی خۆت نارەحەت مەکە و ئەمشەو دەبێ دڵخۆش بین.» پاشان لووکاشکا هەر بەو لەبزەی کە ئیرووشکا قسەی پێدەکرد دەنگی هەڵبڕی: «شەڕاب بنۆشە! وەرە با بچین لەگەڵ ئەو کچانە ڕایبوێرین. تۆ بچۆ هەنگوین بێنە، نا نا، مەچۆ، من لاڵە دەنێرم بۆمان دێنێ. هەتا بەیانی دەبێ سەرخۆش بین و کەیف بکەین.»

ناسایر بە پێکەنینەوە گوتی: «دەی پاشان چی؟ زۆر لێرە دەمێنیەوە؟»

- جارێ لەوانە گەڕێ. زوو بچۆ ڤۆدکا پەیدا کە! هانێ، ئەوەش پارە!

ناسایر بە قسەی کرد و بەپەلە ڕۆیشت بۆ ماڵی ئیانکا.

مامە ئیرووشکا و ئەرگۆشۆڤ، کە دەتگوت داڵ و سیسارکن و بۆنیان کردووە، شوێنی خواردنەوەکەیان دۆزییەوە. هەردووکیان سەرخۆش بوون و بە دوای یەکدا خۆیان کرد بە نێوماڵەکەدا. لووکاشکا لە وەڵامی سڵاو و بۆ

ڕێزگرتن لە میوانەکان هەرای لە دایکی کرد: «دایە نیوە چلیکێکی دیکەمان چیخیر بۆ بێنە!»

مامە ئیرووشکا دەنگی هەڵبڕی: «دەی پێم بڵێ، لاپرەسەن، ئەسپەکانت لە کوێ دزیوە؟ وا دیارە کوڕێکی بەجەرگی! من زۆرم حەز لەو کارانەیە!»

لووکاشکا بە پێکەنینەوە وەڵامی دایەوە: «منیش زۆرم حەز لێیەتی. باشە پێم بڵێ، تۆش هەرچی لە یۆنکەرەکانت وەرگرتووە، دەیدەی بە کچان، ها پیرەپیاو؟»

ـ «نا نا! ئەو قسەیە ڕاست نییە، مارک!» دای لە قاقای پێکەنین و گوتیشی: «ئەم هەتیوە لاپرەسەنە، زۆر شتی لە من دەویست! پێی دەگوتم بڕۆ هەر کارێکی پێت خۆشە بیکە! دەیویست یەک کارابینم بداتێ. بەڵام نا، خودا فەوت و فەنات کا! لەوانەبوو من کارەکە جێبەجێ بکەم، بەڵام دڵم بە تۆ دەسووتێ. دەی پێم بڵێ لە کوێ بووی؟» پاشان بە تورکی دەستی کرد بە قسە کردن.

لووکاشکا بە گورجی وەڵامی دایەوە، بەڵام ئەرگۆشۆڤ کە زمانی تورکیی نەدەزانی جارجار بە وشەیەکی ڕووسی دەپەڕییە نێو قسەکانەوە. جارێک گوتی: «من دەڵێم تۆ ئەسپت دزیوە، من دەزانم.»

لووکاشکا بەم شێوەیە باسەکەی بۆ گێڕایەوە:

ـ ئێمە دووبەدوو لەگەڵ قیری گچکە بە ڕێدا دەڕۆیشتین (لووکاشکا بۆ خۆنواندن بە قیریخانی دەگوت قیری گچکە، کازاخەکانیش لەوە تێدەگەیشتن) ئەو دیعـــایەی ئەوەی دەکـــرد کە تەواوی ئیســـتیپی ئەوبەری ڕووبـــارەکە شارەزایە و ڕاست دەمانگەیێنێتە شوێنی مەبەست. کاتێک چووینە دەرێ، تاریکەشەو بوو، دیتم قیری گچکەی من بەملا و بەولادا دەسووڕێتەوە و لە ڕێگا دەگەڕێ، بەڵام نایدۆزێتەوە. بڕوا بکە چەندە ئاوایی لە گیرفانی مندا بوو هەر ئەوەندەش لەو سەحرایە. ئێمە هەتا نیوەشەو بە دوای ڕێگادا گەڕاین، لە کۆتاییدا خودا ڕوحمی پێکردین و گوێمان لە وەڕینی سەگەل بوو.

مامە ئیرووشکا گوتی: «بێ شعوورانە! منیش زۆر جار شەوانە لە بیابان سەرم لێ شێواوە. بەقوڕگیرێ چ بیابانێکە! بەڵام ئێمە دەچووینە سەر

بستوویەک و من وەکوو جارچییەکان هاوارم دەکرد، بڕوانن ئاوا: (پیرەپیاو دەستی لە بەردەمیدا پێکەوە نووساند و وەهای لووراند کە دەتگوت گەلەگورگێک پێکەوە دەلوورێنن) سەگەکان بە جوانی وەڵامیان دەدایەوە. دەی ئێستا بۆمان باس بکە. ئاخری ڕێگاکەتان دۆزییەوە؟»

- زوو هەوسارمان لە ملیان کرد. ژنانی نووقانی هاتن ناسایریان گرت، باوەڕم پێ بکەن!

ناسایر کە تازە هاتبووە ژووری، بە حاڵەتێکی شەرمەزارانەوە گوتی: «بەڵێ ڕاست دەکا منیان گرت.»

- کاتی گەڕانەوە دیسان قیری گچکە بزر بوو. دیسان ئێمەی بردەوە بۆ لای تەپکە لمەکان. دەیگوت ئێمە لە تەرەک نزیک بووینەتەوە و کەچی زۆری لێ دوور کەوتبووینەوە.

مامە ئیرووشکا گوتی: «تۆ دەبوو تەنیا چاو لە ئەستێرەکان بکەی.»

ئەرگۆشۆڤ قسەکەی ئیرووشکای پشت ڕاست کردەوە و گوتی: «بەڵێ دەبوو چاو لە ئەستێرەکان بکەین!»

ـ بڕوانن کاتێک هەموو شوێنێک تاریک دەبێ، دۆزینەوەی ڕێگا زۆر دژوارە! من زۆرم ڕق هەستابوو! ئاخر ماینێکم وەگیر کەوت، حەمایەتم کرد. ئەوجار هەوسارم بۆ شل کرد و ئیختیارم دایە دەست ماینەکە. پێموابوو ئەو ملی ڕێ دەگرێ و دەمانگەیێنێتەوە. دەی پێتانوایە چیمان بەسەرهات؟ ماینەکە هەروا دەیحیلاند و لمبۆزی لە زەوی دەساوی و ڕێگای دەدۆزییەوە. وەلحاسڵ ڕاست منی بردەوە بۆ گوندەکە. شوکر بۆ خودا! کاتێک گەیشتین، ڕۆژ بووبۆوە. تەنیا فریای ئەوە کەوتین ئەسپەکان لە نێو دارستانەکەدا بشارینەوە. من پەڕیمەوە بۆ ئەمبەری ڕووبارەکە و پارەی ئەسپەکانم وەرگرت.

ئەرگۆشۆڤ سەری لەقاند و گوتی: «من دەڵێم کاری باش بەوە دەڵێن! زۆرتان پارە وەرگرت؟»

لووکاشکا دەستی لە گیرفانی دا و گوتی: «هەمووی لێرەدایە!»

دایکـــی لووکاشـــکا لەو کـــاتەدا هـــاتە ژووریّ. لووکاشـــکا پاشـــماوەی بەسەرهاتەکەی نەگێڕایەوە و بە دەنگی بەرز گوتی: «شەڕاب بنۆشن!»

ئیرووشکا دەستی کرد بە قسە کردن:

ـ من جارێکیان زۆر درەنگ وەخت بوو کە لەگەڵ گیرچیک چووین ...

لووکاشکا قسەکەی پیّ بڕی و گوتی: «باشە ئیتر، ئەم چیرۆکانەی تۆ قەت دواییان نایە. من ئیتر دەڕۆم.» دەفری پڕ شەڕابی نا بە سەریەوە، قایشەکەی نێوقەدی توند کرد و چووە دەریّ.

# سی و حەوت

کاتێک لووکاشکا چووە دەرێ، هەوا بە تەواوی تاریک بووبوو. شەوێکی فێنکی پاییز بوو، بای نەدەهات. مانگەشەو دار سنەوبەرەکانی سووچی گۆڕەپانەکەی تریفەباران دەکرد کە قیت و بێ جووڵە لە جێی خۆیان چەقیبوون. دووکەڵکێشیماڵەکان دووکەڵیان لێ دەهاتە دەرێ و بە سەر گوندەکەوە لەگەڵ تەمومژ تێکەڵ دەبوون و شەپۆلیان دەدا. لە هێندێک پەنجەرەوە شۆقی چرا دەڕژانە سەر سینگی کۆڵان. بۆنی تەپاڵە و تڵتەی ترێ و تەمومژ ئاسمانی گوندەکەی داگرتبوو. قاقای پێکەنین و چریکەی گۆرانی و قرتەقرتی توو گوڵەبەڕۆژە ترووکاندن تێکەڵ پێکەڵ، بەڵام باشتر لە ڕۆژ دەبیستران. لەچکە و کڵاوە سپییەکان، پەڵەیان خستبووە سەر تاریکایی دەوری ماڵەکان و پەرژینی حەوشەکان.

لە گۆڕەپانەکە و لە بەردەرگای ڕووناک و کراوەی دووکان، کۆزیلکەی ڕەش و سپیی کازاخەکان و کچەکان وەبەرچاو دەکەوتن کە پۆل پۆل لە دەوری یەکتر کۆ بووبوونەوە زایەڵەی پێکەنین و ئاوازەکانیان گوندەکەی داگرتبوو. کچەکان بە شێوەیەکی بازنەیی دەستی یەکتریان گرتبوو و هەڵدەپەڕین و نەرم و لەسەرەخۆ لەگەڵ هەوای گۆرانییەکە هەڵدەپەڕین و لەم سەری گۆڕەپانەکەوە دەچوون بۆ ئەوسەر. کچێکی لاواز، لە هەمووان ناشیرینتر، ئەم گۆرانییەی دەگوت:

**(لە نێو لێڕەوارەکاندا، لێڕەوا تاریکەکان،**
**ئاخ لای، لای ئاخ لای لای!**
**لە باخێکی ڕازاوەوە،**
**لە باخێکی سەر سەوزەوە،**
**دوو کوڕی چاونەترس گەیشتنە ئێرە**

**دوو کوڕ بوون هەردووکیان ڕەبەن**
**گەیشتنە ئێرە ڕاوەستاون،**
**ڕاوەستاون و تێیان هەڵکرد لە گۆرانی:**
**کچێکی جوان چووە سەر ڕێگاکەیان و گوتی:**
**شوو بە یەکێکتان دەکەم من.**
**کوڕە سپی ڕوخسارەکە قژ زێڕینەکەی هەڵبژارد**
**کوڕە دەستی ڕاستی کچەی گرتە دەستی و**
**هێنای بۆ گەڕی شاییەکە،**
**لە بەرچاوی هاوڕێکانی بە خۆی نازی:**
**«ئەی برادەران بڕوانن،**
**چ ژنێکی جوانم هەیە!»)**

پیرێژنەکان بە پێوە ڕاوەستابوو و گوێیان بۆ گۆرانییەکە شل کردبوو. کوڕێژگە و کچۆڵەکان بە تاریکایی دەوری گۆڕەپانەکەدا هەڵدەهاتن و یەکتریان دەگرت. لاوانی کازاخ بازنەیەک پێکدێنن و شان لە شانی ئەو کچانە دەدەن کە لەم بەری گۆڕەپانەکەوە دەچن بۆ ئەوبەر. هێندێ جاریش خۆ دەکەن بە نێو گەڕی شایی کچەکاندا و دەستیان دەگرن و لەگەڵیان هەڵدەپەڕن. لە سووچێکی تاریکیماڵەکەدا، بیلێتسکی و ئۆلێنین ڕاوەستابوون. هەردووکیان چەرکسا و بەشمیتیان لە بەردا بوو، بە دەنگێکی نزم و زمانێکی جیا لە زمانی کازاخەکان قسەیان دەکرد. بەڵام دەنگیان دەبیسترا. هەردووکیان هەستیان دەکرد کە هیچ کەس چاوی لێیان نییە. لە سووچێکی تر ئۆستینکا، خڕوخۆڵ و قەڵەو بەشمیتێکی سووری لە بەردا و شان بە شانی باڵای بەرز و شەنگی ماریانکا دەڕۆیشت کە ئەویش کراس و بەشمیتێکی نوێی لە بەردا بوو. ئۆلێنین و بیلێتسکی جۆرێکیان قسە دەکرد کە بتوانن سەرنجی ماریانکا و ئۆستینکا بۆ لای خۆیان ڕاکێشن کە لە گەڕی هەڵپەڕکێدا بوون. بیلێتسکی پێی وابوو ئۆلێنین حەزی لە ڕابواردنە، بەڵام ئۆلێنین چاوەڕوانی بڕیارێک بوو کە دەبوو چارەنووسی دیاری بکا. ئەو

دەیویست هەرچۆنێکە دەبێ ئەمڕۆ بە تەنیا چاوی بەماریانکا بکەوێ. هەموو شتێکی پێ بڵێ و لێی بپرسێ کە ئەو دەیهەوێ و دەتوانێ شووی پێ بکات یان نا؟ لەگەڵ ئەوەدا کە ماوەیەک بوو ئەم مەسەلەیە بە شێوەیەکی نەرێنی شوێنی لە سەر دانابوو، کەچی دیسان هیوادار بوو کە بە هۆی هەوڵی زیاترەوە بتوانێ ئەوەی هەستی پێدەکا پێی بڵێ و تێی بگەیێنێ.

بیلێتسکی گوتی: «بۆ قسەی لەگەڵ ناکەی؟ دەکرا ئەو کارە بدەمە دەست ئۆستینکا و پێی جێبەجێ بکەم. تۆ بەڕاستی مرۆڤێکی سەیری!»

- چبکەم؟ ڕۆژێک بەم زووانە هەموو شتێکی پێ دەڵێم. ئێستا داواتان لێ دەکەم، کارێکم بۆ بکەن کە ماریانکا بێت بۆ ماڵی ئۆستینکا.

ــ زۆر چاکە! ئەوە زۆر کارێکی ئاسانە ...! باشە. مەگین ماریانکا دەزگیرانی ئەو کوڕە قژڕەشە نییە؟ مەگین دەزگیرانی لووکاشکا نییە؟

بیلێتسکی ئەوەی گوت و بۆ سڵاو کردن لە ماریانکا وەرسووڕا. بەڵام بێ ئەوەی چاوەڕوانی وەڵام بێ، چوو بۆ لای ئۆستینکا و داوای لێکرد ماریانکا بێنێ بۆ ماڵی خۆیان.

بیلێتسکی هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو کە سەرۆکی دەستەی گۆرانیبێژان گۆرانییەکی نوێیان دەست پێکرد. کچەکان هەرکام یەکتریان دەکێشا و هەوڵیان دەدا بچنە پێشێ. کچەکان ئەم گۆرانییەیان دەگوت:

**(لە پشت باخەکە، باخەکە،**
**کوڕێک دەچوو بۆ سەیران**
**هەنگاوی دەنا لەمسەر تا ئەوسەری کۆڵان.**
**جاری یەکەم بەو شوێنەدا تێپەڕی و**
**بە دەستی ئاماژەی کرد.**
**جاری دووهەم کڵاوەکەی ڕاوەشاند.**
**جاری سێهەم ڕاوەستا.**
**ڕاوەستا و بە خاکەڕایی ئەمەی گوت:**
**«من دەمویست تۆ ببینم و**

**گلەییت لێ بکەم خۆشەویستەکەم!**
**ئازیزەکەم بۆچی نایەی؟ لە نێو باخیدا دەگەڕێی؟**
**ئازیزەکەم بۆ مەگین لە من بێزاری؟**
**ئازیزەکەم دڵت ئارام دەبێتەوە**
**من دەنێرم بۆ خوازبێنیت،**
**دەتکەم بە بووک.**
**تۆ فرمێسکم بۆ دەڕێژی.»**
**من دەمزانی دەبێ چی بڵێم،**
**بەڵام نەمدەوێرا وەڵام بدەمەوە.**
**بەڵێ نەمدەوێرا وەڵام بدەمەوە**
**من چووم بۆ سەیران لە نێو باخە سەوزەکەدا**
**سڵاوم لە یارەکەم کرد.**
**«سڵاو لە تۆ ئەی کچی جوان!**
**تۆ وەرە پێ لە سەر چاوم دانێ گوڵم،**
**ئەو دەسرەیە بە دیاری لە من وەرگرە،**
**بە دەستە سپیوسۆڵەکەت وەریبگرە.**
**خۆشەویستم بە و**
**دەستە جوانانەت بیگرە و خۆشت بوێم.**
**من نازانم چۆن ڕەفتار بکەم**
**چ دیارییەک پێشکەش بە ئازیزەکەم کەم...؟**
**دەسرەیەکی گەورە دەدەم بە خۆشەویستە جوانەکەم.**
**ئەویش بە جێی ئەو دەسرەیە**
**پێنج ماچی تەڕم دەداتێ.»**

لووکاشکا و ناسایر بازنەی شاییەکەیان هەڵبڕی و چوونە نێو کچەکانەوە. لووکاشکا گۆرانییەکی بە دەنگێکی گڕ دووپات دەکردەوە و دەستی ڕادەوەشاند و بە نێو کۆڕی هەڵپەڕکێکەدا دەگەڕا. لە ناکاو دەنگی

هەڵبڕی: «یاڵڵا، یەکێک لە ئێوە بێتە دەرێ.» کچەکان پاڵیان بە ماریانکاوە نا و خستیانە دەرێ. بەڵام ماریانکا نەیدەویست بڕواتە دەرێ. لەگەڵ دەنگی گۆرانییەکە، قاقا و پێکەنین و شەققەی ماچ و سرتەسرت دەهاتە گوێ. لووکاشکا هەروا کە لە پێشەوە دەڕۆیشت، بە سەر ئاماژەیەکی دۆستانەی پێکرد و گوتی: «دیمیتری ئاندرێڤیچ! تۆش هاتووی بۆ سەیر کردن؟»

ئۆلێنین بە ساردوسڕی گوتی: «بەڵێ.»

بیلێتسکی بۆ لای ئۆستینکا خۆی دانەواند و شتێکی بە گوێیدا چرپاند. ئەو ویستی تێبگا، بەڵام فریا نەکەوت. جاری دووهەم کە بە بەردەمیاندا تێپەڕی، گوتی: «باشە، ئێمەش دێین.»

ئۆلێنین بۆ لای ماریانکا داهاتەوە و گوتی: «تۆش دێی؟ تکات لێدەکەم، ئەگەر بۆ یەک خولەکیش بێ، وەرە. دەمەوێ قسەت لەگەڵ بکەم.»

- ئەگەر کچەکان بێن، منیش دێم.

ئۆلێنین دیسان بۆ لای ماریانکا داهاتەوە و لێی پرسی: «ئەو پرسیارەی لێم کردی، وەڵامم دەدەیەوە؟ وا دیارە ئەمڕۆ زۆر دڵخۆشی.»

ئێستا ئیتر ئەو دوور کەوتبۆوە. ئۆلێنین بە دوایدا دەڕۆیشت.

- دەی پێم بڵێ وەڵامم دەدەیتەوە یان نا؟

- وەڵامی چی؟

ئۆلێنین سەری لە گوێی بردە پێشێ و گوتی: «هەر ئەوەی وا پێرێ پێم گوتی. تۆ شووم پێدەکەی؟»

ماریانکا بیری کردەوە و گوتی: «بەم زووانە وەڵامت پێدەدەمەوە. وەڵامت پێدەدەمەوە.»

لە تاریکییەکەداترووسکەیەکی ڕووناک و مێهرەبان لە چاوی ماریانکاوە دادەڕژا و لە ڕوخساری دەدا، ئۆلێنین هەروا بە دوایدا دەڕۆیشت و کاتێک بۆ لای دادەهاتەوە دەمی لە گوێچکەی دەبردە پێشێ، چێژێکی شیرین گیانی دادەگرت.

بەڵام لووکاشـکا لەگەڵ ئەوەی گـۆرانیی دەگـوت، دەسـتیماریانکـای بە توندی گرت و لە شـاییەکەی هێنـایە دەرێ. بەڵام هەر ئەوەنـدە فریـا کەوت بڵـێ: «کەوایە وەرە بـۆ مـاڵی ئۆسـتینکا» و گەڕایەوە بـۆ لای هـاوڕێکەی. گۆرانی تەواو بووبوو. لووکاشکا لێوی سڕی و ماریانکاش هەر وای کرد و یەکتریان ماچ کرد. لووکاشکا گوتی: «نا، دەبێ پێنج جار بێ!»

ئێسـتا هەڵپەڕکێیەکـی ڕێکوپێـک و نەرمەسـەما، جێگـای خـۆی دابـوو بە هەراوهوریـــا و تێکەولـــێکە و تریقوهـــۆڕ. لووکاشـــکا کە وێـــدەچوو زۆر سەرخۆش بێ، دەستی کرد بە دابەش کردنی شیرینی بە سەر کچەکاندا و بە لـووتبەرزییەکی قۆشـمانە و لەگەڵ ئەوەشـدا شـوێندانەرانەوە گـوتی: «بەشـی هەمـــووان دەدەم!» پاشـــان بە چـــاوێکی مانـــادارەوە لە ئـــۆلێنینی ڕوانـــی و گوتیشـی: «ئەوانەی لەگەڵ سـەربازەکان کەینوبەینیـان هەیە لە شـایی بڕواتە دەرێ!»

کچەکـان شـیرینییان لە دەسـتی لووکاشـکا دەڕفانـد و قاقـا پێـدەکەنین. بیلێتسکی و ئۆلێنین لەوێ دوورکەوتنەوە.

لووکاشـکا وەک ئەوەی دەسـتودڵبازییەکەی خـۆی شـەرمەزاری کردبـێ، کڵاوەکەی لە سـەری داگرت و لەگەڵ ئەوەی بە سـەرقۆڵی کراسـەکەی دەمـی دەسڕی، لە ماریانکا و ئۆستینکا چووە پێشێ و گوتی: «ئازیزەکەم بۆ مەگین لە مـن بێـزاری؟» ئەوە هەر ئەو گـۆرانییە بـوو کە کچەکـان چەنـد خـولەک لەمەوبەر چڕیبوویـان. پاشـان بـۆ لای ماریانکـا وەرسـووڕا و بە لەبزێکـی تۆسنانە دووپاتی کردەوە: «مەگین لە من بێزاری، من زەماوەند لەگەڵ تۆدا دەکەم، تۆش فرمێسکم بۆ دەڕێژی.» پاشان ئۆستینکا و ماریانکای پێکەوە ماچ کرد.

ئۆسـتینکا، خـۆی کێشـا دواوە، دەسـتی هەڵێنـایەوە چەپـۆکێکی کێشـا بە پشتیدا کە دەستی خۆی ئێشی پێگەیشت. لووکاشکا لێی پرسـی: «دەی ئێوە دیسان هەڵدەپەڕن؟»

ئۆستینکا وەڵامی دایەوە: «هەرچۆنێک کچەکان پێیان خۆش بێ. من خۆم دەڕۆمەوە بۆ ماڵێ و ماریانکاش دەیهەوێ لەگەڵم بێ.»

کازاخی لاو هەروا کە باوەشی بە ماریانکادا کردبوو، کێشای بۆ سوچی تاریکی دیوارێک.

ـ ماریانکا گیان، مەچۆ بۆ ماڵی ئۆستینکا. ئەمە دوایین جارە کە ئێمە بە خۆشی ڕایدەبوێرین. بڕۆوە بۆ ماڵی خۆتان. منیش دێم لەگەڵتدا.

ـ بڕۆینەوە بۆ ماڵێ چبکەین؟ ئەمشەو بۆیە پێی دەڵێن جێژن، بە خۆشی ڕایبوێرین، من دەچم بۆ ماڵی ئۆستینکا.

ـ بەڵام من زەماوەندت لەگەڵ دەکەم.

ـ زۆر باشە، با بزانین چۆن دەبێ.

لووکاشکا بە لەبزێکی جیددی گوتی: «کەوایە دەچی؟» پاشان توند لە باوەشی گرت و ڕوومەتە ناسکەکەی ماچ کرد.

ـ بەرم دە. بۆ لە کۆڵم نابیەوە؟

ماریانکا خۆی لە باوەشی لووکاشکا ڕاپسکاند و وەک ئاسکی سرک دوور کەوتەوە. لووکاشکا لە جێی خۆی ڕاوەستا و بە لەبزێکی سەرکۆنەئامێزەوە گوتی: «ئاخ چەتیوە! ئەمە زۆر کارێکی خراپە، تۆ فرمێسکم بۆ دەڕێژی.» پاشان ڕووی لێ وەرگێڕا و گوڕاندی بە سەر کچەکاندا: «هۆی شۆخە کچەکان، ئێوە شادی بکەن.»

ماریانکا وەک ئەوەی قسەکانی لووکاشکا ترسی شکاندبێتە گیانی، ڕاوەستا و گوتی: «چی زۆر کارێکی خراپە؟»

ـ هەر ئەوە.

ـ چی؟

ـ دەی هەر ئەوەی کە تۆ لەگەڵ کرێنشینەکەتان، لەگەڵ ئەو سەربازە ڕایدەبوێری، هەر بۆیە منت خوش ناوێ.

- ئەگەر تۆم خۆش ناوێ، لەبەر ئەوەیە حەزم لێ نییە. مەگین تۆ دایک و باوکی منی؟ هیچ هەقێکت بە سەرمەوە نییە. ئیتر بۆ دەستم لە کۆڵ ناکەیتەوە؟ من هەرکەسێک حەزم لێ بێ خۆشمدەوێ.

لووکاشکا گوتی: «وایە! لە بیرت نەچێ!» پاشان ڕۆیشت بۆ لای دووکانەکە و دەنگی هەڵبڕی: «هۆی کچەکان! بۆ ڕاوەستاون؟ یاڵڵا دەی، گەڕێکی دیکە هەڵپەڕن. ناسایر ڕاکە بچۆ شەڕاب بێنە.»

ئۆلێنین لە بیلێتسکی پرسیی: «تۆ دەڵێی چی! بڵێی بێن؟»

بیلێتسکی وەڵامی دایەوە: «با هەرئێستا بڕۆینەوە و کەلوپەلی میوانییەکە ئامادە بکەین و مێزەکە بڕازێنینەوە.»

# سی و هەشت

کاتێک ئۆلێنین بە دوایماریانکا و ئۆستینکادا لە ماڵی بیلێتسکی هاتە دەرێ، زۆر درەنگ وەخت بوو، پەڵەی تاریکی کەوتبووە سەر سینگی کچەکە. مانگی تریفە زێوین بەرەو ئیستیپ دادەگەڕا. تەمومژێکی سپی بە سەر گوندەکەوە شەپۆلی دەدا. هەموو شتێک بێدەنگ و کڕوکپ بوو. لە هیچ شوێنێکەوە ڕووناکی نەدەهاتە دەرێ، جگە لە ترپەی پێی کچەکان کە دوور دەکەوتنەوە، هیچ دەنگێکی تر نەدەهاتە گوێ. بەزم و گۆرانی دوایی هاتبوو. ئۆلێنین دڵی بە پڕتاو لێی دەدا. ڕوخساری گەرمداهاتووی بە شنەی شێداری شەوبا فێنک دەبۆوە. چاوی لە ئاسمان دەکرد، پاشان چاوی لەو ماڵە کرد کە لێی هاتبووە دەرێ؛ مۆمەکە کوژابۆوە. سەرلەنوێ چاوی لە کچەکان کردەوە کە وردەوردە لێی دوور دەکەوتنەوە. لەچکەی سپی لە نێو تەمومژدا بزر بوو. ئۆلێنین ترسا بە تەنیا بمێنێتەوە. کەتبووە دڵەکوتە و هەستی بە شادییەکی زۆر دەکرد! لە سەر قاڵدرمەکانەوە بازی دا و بە دوای کچەکاندا هەڵات. دەنگێک گوتی: «بۆ کوێ دێی؟ دەتبینن!»

ـ قەیناکا با بمبینن.

ئۆلێنین خۆی گەیاندە ماریانکا و باوەشی پێداکرد. ماریانکا خۆی ڕانەدەپسکاند، ئاسکێکی کەوی بوو. ئۆستینکا گوتی: «لە ماچ کردنی تێر نەبووی؟ کاتێک زەماوەندت لەگەڵ کرد، بە کەیفی دڵی خۆت ماچی بکە. بەڵام ئێستا تۆزێ ددان بە خۆتدا بگرە.»

ـ خوداحافیز ماریانکا. من سبەینێ دەچم بۆ لای باوکت قسەی لەگەڵ دەکەم. تۆ خۆت باسی هیچ مەکە.

ماریانکا گوتی: «جا من چی هەیە باسی بکەم؟»

کچەکان بە هەڵەداوان دوور کەوتنەوە. ئۆلێنین بە تەنیا گەڕایەوە و بیری لەو هەموو چێژە ڕۆحی و ڕووداوە شیرینەی ئەمشەو دەکردەوە. ئەو شەوە

هەتا درەنگان لە سووچێکی ژوورەکە و نزیک سۆباکە، پێکەوە دانیشتبوون. ئۆستینکا بۆ ساتێک لە ژوورەکە نەچووبووە دەرێ. چونکە بیلێتسکی و کچانی تر ژوورەکەیان پڕ کردبوو. ئۆلێنین بە هێواشی لەگەڵ ماریانکا قسەی دەکرد.

ـ ماریانکا، شووم پێدەکەی؟

ئەو شاد و لەسەرەخۆ وەڵامی دایەوە: «تۆ گاڵتەم پێدەکەی و پێم ڕادەبوێری، تۆ منت ناوێ.»

ـ تۆ خودا وەڵامم بدەوە، تۆ منت خۆشدەوێ؟

ماریانکا بە پێکەنینەوە لەگەڵ ئەوەی بە دەستە قەویوقۆڵەکانی دەستی ئۆلێنینی دەگوشی، وەڵامی دایەوە: «بۆ دەبێ تۆم خۆشنەوێ؟ خۆ گێڕ و مجرۆ نیی!» هەروەها گوتیشی: «ئەو دەستانەت چەندە سپی و جوانن! چەندە نەرم و شلکن! وەکوو سەرتوێی شیر.»

ـ گاڵتەت پێناکەم. خۆشم دەوێی. پێم بڵێ بزانم شووم پێدەکەی؟

ـ ئەگەر باوکم ڕازی بێ بۆ شووت پێ ناکەم؟

ـ ڕاستم پێ بڵێ! بێتوو شوو بە کەسێکی تر بکەی، شێت دەبم. سبەینێ بەیانی لەگەڵ باوکت قسە دەکەم و خوازبێنی تۆی لێ دەکەم.

ـ کەوایە با لە ئێستاوە پێت بڵێم، نابێ ژنانی دیکەت خوش بوێ! من زۆر حەسوودم!

ئۆلێنین هەموو ئەو قسانەی بە چێژەوە لە دڵی خۆیدا دووپات دەکردەوە. بیرکردنەوە لەو قسانە هێندێ جار شادیی لە دڵی دەگێڕا و هێندێ جاریش خەمباری دەکرد. بە دژواری هەناسەی دەکێشا، خەمبار بوو، چونکە ئەو کاتەی لەگەڵی دەدوا ئەو وەک هەمیشە ئەهۆن و بێدەنگ بوو. وێدەچوو ئەو بارودۆخە هیچ کاریگەرییەکی لە سەری نەبووبێ و بڕوا بە قسەکانی نەکات، هەروەها لە بیری داهاتووشدا نەبێ. ئۆلێنین پێی وابوو خۆشەویستیی ماریانکا هەستێکی کاتییە و داهاتووی بە لاوە گرینگ نییە. ئەوەش دڵخۆشی دەکرد کە تەواوی قسەکانی لە ڕاست دەچوون و ئێستا ماریانکا ڕازی

بووبوو شووی پێ بکات. ئۆلێنین لە دڵی خۆیدا گوتی: «بەڵێ ئەو ڕۆژە یەکتری بە باشی دەناسین کە ئەو هی من بێ و ژیانمان پێکەوە گرێ بدرێ. ئەشقێکی ئەوتۆ پێویستی بە قسە نییە، بەڵکوو پێویستی بە ژیانە. پێویستی بە تەواوی ژیانە. سبەینێ هەموو شتێک ڕوون دەبێتەوە. من ئیتر ناتوانم بەو شێوەیە بژیم، من هەموو شتێک بە باوکی و بە بیلێتسکی و بە تەواوی خەڵکی گوندەکە دەڵێم...»

لووکاشکا دوای دوو شەو فیکر و خەیاڵ و شەونخوونی، لە ڕێوڕەسمی جێژندا هێندەی شەڕاب خواردبۆوە کە بۆ یەکەم جار بڕستی لێ بڕا و لە ماڵی ئیانکا کەلەلا کەوت و خەو بە لایدا هێنا.

# سی و نۆ

سبەینێی ئەو ڕۆژە، ئۆلێنین زووتر لە کاتی ئاسایی لە خەو هەستا. لە یەکەم ساتی بەخەبەر هاتنەوە، بیری لەو کار و ڕووداوانە دەکردەوە کە ئەمڕۆ دەبوو لەگەڵیان بەرەوڕوو بێ. بە دڵێکی لێوڕێژ لە شادییەوە ڕووداو و قسەکانی شەوی ڕابردووی وەبیر خۆی دەهێنایەوە: ماچەکانی ماریانکا، دەستی بەهێز و قسەکانی کە گوتبووی "ئەو دەستانەت چەندە سپی و جوانن!" پاشان لە تەختی خەوەکەی هاتە خوارێ و ویستی هەر ئەو کاتە بچێ بۆ لای خاوەنماڵەکەی و خوازبێنیی ماریانکایان لێ بکا. هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو، ئۆلێنین هەستی کرد لە کۆڵانەکەوە دەنگی هەرا و ژاوەژاو دێ. خەڵک بەڕێدا دەڕۆیشتن، بە سواری ئەسپ تێدەپەڕین و قسەیان دەکرد. ئۆلێنین چەرکساکەی بە شانیدا دا و هەڵات بۆ سەر قاڵدرمەکان. خاوەنماڵەکەی هێشتا لە خەو هەڵنەستابوون. پێنج سواری کازاخ، لەگەڵ ئەوەی بە دەنگی بەرز قسەیان دەکرد، بە کۆڵانەکەدا تێدەپەڕین. کازاخەکان هەموویان پێکەوە قسەیان دەکرد و هەراوهوریایان وەڕێ خستبوو. لە قسەکانیان حاڵی نەدەبوو، یەکیان دەنگی هەڵێنابوو: «دەربەستەکەی سەرەوە.» یەکێکی دیکەیان دەیگوت: «ئەسپەکەت زین کە و بە غار خۆت بە ئێمە بگەیێنە.»

ـ لە دەرگاکەی دیکەوە نزیکترە.

لووکاشکا دەیگوڕاند: «لەخۆڕا شەڕەچەقە مەکەن، لە دەرگاکەی نێوەڕاستەوە دەبێ بڕۆینە دەرێ ...»

یەکێکی تر لە کازاخەکان کە هەموو گیانی تۆزاوی بوو سواری ئەسپێک بووبوو کە ئازای ئەندامی لە ئارەقەدا خووسابوو، دەیگوت: «ئاوا باشترە، زووتر دەگەینێ.»

لووکاشکا بە هۆی خواردنەوەی زۆری شەوی ڕابردووەوە دەموچاوی سوور هەڵگەڕابوو و پەنەمیوی دەنواند و کڵاوەکەی بۆ پشتەوە هەڵگەڕابۆوە. وەکوو فەرماندەرێک هەڵسوکەوتی دەکرد و فەرمانی پێدەدان. ئۆلێنین کە بە زەحمەت توانیبووی سەرنجی کازاخەکان بۆ لای خۆی ڕاکێشێ لێی پرسین: «چی بووە؟ دەتانەوێ بۆ کوێ بچن؟»

ـ دەچین ئەبرەکەکان دەگرین. لە گردە ڕمڵەکان بۆسەیان ناوەتەوە. هەرئێستا دەچین بۆ ئەوێ، بەڵام ژمارەی سوارەکانی ئێمە کەمن.»

کازاخەکان، هەروا کە دەیانگوڕاند و لە دەوری یەک کۆ بووبوونەوە، وەڕێ کەوتن. ئۆلێنین بیری کردەوە کە ئەگەر لەگەڵ کازاخەکان هاوهەنگاو نەبێ، داهاتوویەکی ڕوونی نابێ؛ لەگەڵ ئەوەشدا ئەو دەبوو زۆر زوو بگەڕێتەوە. هەر بۆیە جلوبەرگی لەبەر کرد. دەستی دا تفەنگەکەی و هەرچۆنێک بوو لەگەڵ ژانۆ سواری ئەسپێکی زین کراو بوو و لە دەرەوەی ئاوایی بە کازاخەکان گەیشتنەوە. لەو کاتەدا کازاخەکان لە ئەسپەکانیان دابەزیبوون و کۆزیلکەیان بەستبوو؛ بۆ پیرۆزیی ئەو ڕێگایەی گرتبوویانە بەر، خەریک بوون لە چلیکێکی چکۆلە شەڕابیان دەخواردەوە و خوڵک و فەرمووی یەکتریان دەکرد. لە نێو ئەواندا یەک ملازم دووهەمی گەنج و جوانچاک و تەڕپۆش بەرچاو دەکەوت کە بە هەڵکەوت هاتبووە نێو گوندەکە و ئێستا فەرماندەری نۆ کەس کازاخی لە ئەستۆ گرتبوو. کازاخەکان هەموویان سەربازی ئاسایی بوون و لەگەڵ ئەوەی ملازم دووهەم وەک فەرماندەیەک خۆی دەنواند، هەموویان تەنیا بە گوێی لووکاشکایان دەکرد. کازاخەکان هیچ هەمیەتێکیان بە ئۆلێنین نەدا. کاتێک هەموویان سوار بوون و وەڕێ کەوتن، ئۆلێنین خۆی گەیاندە لای ملازم دووهەم و چۆنیەتی ڕووداوەکەی لێ پرسی. ملازم دووهەم پیاوێکی نەرمونیان و لەسەرەخۆ بوو. بۆ وەڵام دانەوەی ئۆلێنین هەموو گەورەیی و شکۆی خۆی تێکەڵ پۆز و هەوا کرد. ئۆلێنین زۆر بە زەحمەت بۆی دەرکەوت کە مەسەلەکە چییە و چ کارێکیان لە پێشە. گرووپێکی دیدەوانی کە ئەرکی گەڕان بە دووی

ئەبرەکەکانیان پێ سپێردرابوو چەند کەسی چیانشنیان لە هەشت وێرستی گردە ڕملەکان دیتبوو. ئەبرەکەکان لە کەندەڵانێکدا سەنگەریان گرتبوو و لەگەڵ ئەوەی تەقەیان کردبوو، هەڕەشەیان کردبوو کە بە زیندوویی خۆ بە دەستەوە نادەن. ڕائید کە لە گەڵ دوو کەسدا خەریکی دیدەوانی بوون، لەوێ مابوونەوە و کازاخێکیان بە سواری ناردبوو بۆ گوند و داوای یارمەتییان کردبوو.

هەتاو تازە لە کەل سەری وەدەرنابوو. لە سێ وێرستیی گوندەکە ئیستیپێکی بەرین وەدیار کەوت. لە هەموو لایەکەوە جگە لە بیابانێکی کاکی بە کاکی و وشک و خەمهێنەر و یەکهاوی هیچ شتێکی تر وەبەرچاو نەدەکەوت. جێگا سمی ماڵات لەو بیابانە وشکەدا وردەکووز و هێڵی لەسەر لمەکە کێشابوو، بنجە درک و گیاسندە و چەند تووڵەڕێ و بزنەڕێ کە بە زەحمەت لێک جیا دەکرانەوە، لە هەموو لایەکەوە وەبەرچاو دەکەوت. لە مەودایەکی دوور و نزیک ئاسۆ، چەند تاوڵ و چیغی خێڵی نووقانییەکان دیار بوون. نەبوونی تۆزە نیسێیەک و تایبەتمەندیی وەحشیی ئەو دیمەنانە، زیاتر لە هەموو شتێک سەرنجڕاکێش بوو.

هەڵاتن و ئاوا بوونی خۆر لە ئیستیپ هەمیشە جوان و دڵگیرە. کاتێک کە با هەڵیدەکا، شەپۆلی لم وەڕێ دەکەوێ و چاڵوچۆڵ پڕ دەبنەوە و لە چەند شوێنی تر گرد و تەپۆڵکی لم دروست دەبنەوە. کاتێک کە هەواکەی ئارامە، وەک ئەو ڕۆژە بەیانی، بێدەنگییەکی قورس کە هیچ چەشنە دەنگێک نایشکێنێ، مرۆڤ تووشی سەرسووڕمان دەکا. ئەو ڕۆژە بەیانی ئەگەرچی خۆر هەڵاتبوو، بەڵام ئیستیپ ئارام و تاریک بوو. هەستت بە چێژێکی ڕۆحیی تایبەت دەکرد، هەوا مەند و بێ جووڵە بوو؛ تەنیا خرمەی پێی ئەسپ و حیلاندیان دەهاتە گوێ. بەڵام بێدەنگیی مەزنی بیابان ئەو دەنگانەشی زۆر زوو کپ دەکرد و ئاسەواری نەدەهێشتن. کازاخەکان بە بێدەنگی دەچوونە پێشێ. چەکی کازاخەکان هەمیشە هێندە توندوتۆڵ لە شانی دەکەن کە قەت کاتی بەڕێدا ڕۆیشتن تەقوکوتی نایە. چەکێک کە شلوشەوێق بێ و تەقوکوتی

لێوە بێ، بۆ پیاوی کازاخ شوورەیی دێتە ئەژمار. لە گوند دوو پیاوی کازاخ لەگەڵیان کەوتن. دوو سێ وشە لەگەڵ ئەوان ئاخافتن. لاقی ئەسپەکەی لووکاشکا لە بنجە دڕوویەک گیرا و سەرسمی دا. لەلای کازاخەکان ئەوە نیشانەیەکی خراپە و شوومی باش نییە. هەموویان چاویان لە دەوروبەری خۆیان کرد، بەپەلە ئاوڕیان دایەوە و هەوڵیان دا گوێ بەو ڕووداوە نەدەن کە لەو کاتە هەستیارەدا زۆر گرینگ و چارەنووس ساز بوو. لووکاشکا لغاوی ئەسپەکەی کێشا و نێوچاوانی گرژ کرد، توند ددانی بە یەکدا نا و خەرەزەنگەکەی هەڵسووڕاند. ئەسپەکە بە تەکانێک لە سەر هەر چوار پەلی کەوتە حەوا و نەیدەزانی کام لاقیان بنێتە زەوی، دەتگوت دەیهەوێ بە حەوادا بفڕێ. بەڵام لووکاشکا خەرەزەنگێکی لە قەبرغەی گۆشتنی ئەسپەکە ڕاکێشا و هێوری کردەوە؛ دووهەمین زەبری قامچیی داهێنایەوە و سێهەمین زەبریشی لێدا. ئاژەڵی بەستەزمان ددانی لە ڕیچەوە برد و کلکی هەڵسووڕاند و لەگەڵ حیلاندن هەستایە سەر پاشوو، وەها بە پڕتاو چوارناڵی کرد چەندین هەنگاو وەپێش کازاخەکانی تر کەوت. ملازم دووهەم گوتی: «یەککوو چەندە ئەسپێکی نەجیبە!»

یەکێکی تر لە هەموویان پیرتر بوو گوتی: «خۆ ئەوە ئەسپ نییە، شێرە.»

گورووپی کازاخەکان، هەروا بە بێدەنگی، هێندێ جار بە وێرغە و هێندێ جاریش بە چوارناڵ دەچوونە پێشێ، بەڵام ئەم ڕووداوە بۆ ساتێک بێدەنگی و نەشەی ئەو ڕێبڕینەی شلەژاندبوو.

لە هەشت وێرستی ئیستیپەوە، تووشی هیچ گیانلەبەرێک نەبوون. تەنیا چاویان بە یەک کیبیتکا[٦٤]ی نووقانی کەوت کە لە سەر عارەبانەیەک هەڵدرابوو و لە مەودای یەک وێرستیی ئەوانەوە بە ڕێدا دەڕۆیشت. ئەو عارەبانەیە هی کابرایەکی نووقانی بوو کە لەگەڵ بنەماڵەکەی لە تاوڵێکەوە بۆ تاوڵێکی تر دەچوون. لە دوڵێکی ئەو نزیکانە چاویان بە دوو ژنی نووقانیش کەوت کە هەرکامەی سەوەتەیەکیان بە کۆڵەوە بوو شیاگەی ئەو گاڕانەیان

---

٦٤ ڕەشماڵی بە خوری و موو تەندراو

کۆ دەکردەوە کە لەوێوە تێپەڕیبوون و بۆ پێژانی کیزیاک کۆیان دەکردەوە. ملازم دووهەم کە زمانی نووقانی باش نەدەزانی، پرسیاری لە ژنەکان کرد، بەڵام ئەوان لە قسەکانی ملازم دووهەم تێنەگەیشتن و بە ترسەوە چاویان لە یەکتر کرد.

لووکاشکا چوو بۆ لایان و ئەسپەکەی ڕاگرت، بە پێی دابونەریت سڵاو و چاکوخۆشیی لەگەڵ ژنەکان کرد، ژنەکان خۆشحاڵییان دەربڕی و ئازادانە قسەیان لەگەڵ کرد، وەک ئەوەی لەگەڵ برای خۆیان قسە بکەن. هەردووکیان ئاماژەیان بەو شوێنە کرد کە کازاخەکان بۆی دەڕۆیشتن و بە سکاڵاوە گوتیان: «ئەیەڕۆ، کەپ ئەبرەک» ئۆلێنین تێگەیشت کە ژنەکان دەیانگوت: «ئەو شوێنە زۆری ئەبرەکی لێیە.»

ئۆلێنین کە هیچ کات ڕووداوی لەو جۆرەی نەدیتبوو و تەنیا لە چیرۆکەکانی مامە ئیرووشکادا بیستبووی و هێندێک لە دیمەنەکانی لە زەیندا مابوو، بڕیاری دا کە تەنانەت یەک هەنگاو لە کازاخەکان دوور نەکەوێتەوە و هەموو شتێک لە نزیکەوە ببینێ. ئۆلێنین لە دڵەوە ئافەرینی بەو پیاوانە دەگوت و بە وردی لە هەموو شتێکی دەڕوانی و گوێی بۆ هەموو شتێک شل دەکرد و هەموو شتێکی لە بەرچاو دەگرت. شمشێرەکەی لە نێوقەدی بەستبوو و تفەنگەکەشی پڕ کردبوو. بەڵام کە بۆی دەرکەوت خەریکە لە کازاخەکان دوا دەکەوێ، بڕیاری دا بە هیچ شێوەیەک لە جەنگەکەدا بەشداری نەکا، بەتایبەت بە پێی بیر و باوەڕی خۆی، ئازایەتییەکەی لە یەکە سەربازییەکەیدا سەلمابوو، بەتایبەت ئێستا زۆر شاد و دڵخۆش بوو. لە ناکاو لەو دوورانەوە تەقەی تفەنگێک هاتە گوێ.

ملازم دووهەم وەخۆ هاتەوە و فەرمانی بە کازاخەکان دا بڵاو ببنەوە و لە کام لاوە دوژمن گەمارۆ بدەن. بەڵام کازاخەکان ڕاشکاوانە گوێیان بە فەرمانەکانی ملازم دووهەم نەدەدا، تەنیا گوێیان بە فەرمانی لووکاشکا دەدا و چاویان لە هەڵسوکەوتی ئەو بوو. لووکاشکا هەموو ڕەفتار و تەنانەت ڕوخساریشی هێمنایەتی و شکۆی پێوە دیار بوو. ئەسپەکەی بە هەنگاوی ورد

بــۆ پێشـــەوە دەئــاژوا و بەردەوام چــاوی لە پــێش خــۆی بڕیبــوو و نەیدەترووکاند. لە ناکاو ئەسپەکەی ڕاگرت و گوتی: «سوارێک دەرکەوت.»

ئۆلێنین هەرچی ڕوانیی، هیچی نەدی. کازاخەکـان زۆر زوو چاویـان بە دوو سـوار کەوت و بە هەنگاوی ورد و لەسـەرەخۆ بەرەولای ئەوان کەوتنە ڕێ. ئۆلێنین لێی پرسین: «ئەوانە ئەبرەکەکانن؟»

کازاخەکان وەڵامی ئەو پرسیارە بێمانایەیان نەدایەوە، چونکە ئەبرەکەکان دەبـێ زۆر گەوج بـووبێتن. ئەگەر بە سـواری ئەسـپ هـاتبێتن بـۆ ئەمـبەری ڕووبارەکە.

لووکاشکا دوو سواری پیشان دان کە ئەمجارەیان بە باشی دیار بوون و گوتی: «حەتمەن باوە ڕوودکایە کە دروشممان پێدەدا، خەریکە دێت بۆ لای ئێمە.» لە ڕاستیدا دوای چەند خولەک دەرکەوت ئەو سوارانە لە کازاخەکانی گرووپی دیدەوانین و ڕائید هات بۆ لای لووکاشکا و بەرەوڕووی ڕاوەستا.

# چل

لووکاشکا تەنیا لێی پرسی: «دوورن؟»

هەر لەو کاتەدا سی هەنگاو لەولای ئەوانەوە دەنگی تەقەیەک هات. ڕائید زەردەیەکی گرت، بە سەر ئاماژەی کرد و گوتی: «ئەوە هاوڕێکەی خۆمان گوورکایە کە تەقەیان لێدەکا.»

چەند هەنگاوی تر چوونە پێشێ، چاویان بە گوورکا گەوت کە لە پشت تەپۆڵکە لمێک دانیشتووە، خەریکە تفەنگەی پڕ دەکاتەوە. گوورکا سەرەڕای ماندوویەتی خەریک بوو وەڵامی تەقەی ئەبرەکەکانی دەدایەوە کە لە پشت تەپۆڵکە لمێکی دیکە خۆیان حەشار دابوو. گوللەیەک بە پەنایاندا ویزەی هات.

ملازم دووهەم دیار بوو ترس شکاوتە گیانی و ڕەنگی هەڵبزرکابوو. لووکاشکا دابەزی و ئەسپەکەی دایە دەست کازاخێک و خۆی ڕۆیشت بۆ لای گوورکا. هێشتا نەگەیشتبووە لای گوورکا کە دوو گوللە بە سەریاندا ویزەی هات. لووکاشکا بە پێکەنینەوە چاوی لە ئۆلێنین کرد کە خۆی دانەواند و گوتی: «ئاندریێڤیچ، لەوانەیە تۆ بکووژن. زوو لێرە دوورکەوەوە. خۆ تۆ لێرە هیچ کارێکت نییە.»

لە پشت تەپۆڵکە ڕملێک، بە مەودای دووسەد هەنگاو، چەند تفەنگ و کڵاوی دی. لە ناکاو دووکەڵێکی کەم لەوێ کەوتە بەرچاو و سەرلەنوێ گوللەیەک ویزەی هات. ئەبرەکەکان لە خوار گردەکەوە لە نێو زەلکاوێکدا سەنگەریان گرتبوو. ئۆلێنین کە دیتی ئەو شوێنەیان بۆ مەتەرێز هەڵبژاردووە سەری سووڕما. ئەو شوێنە، هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی ئیستیپ نەبوو، بەڵام هەر بەو هۆیەی کە ئەبرەکەکان لەوێ کەمینیان دانابوو، ئەو شوێنە لە چاو شوێنەکانی دیکە جیاوازیی لە خۆ گرت و بە شێوەیەکی تایبەت خۆی نواند. ئۆلێنین پێی وابوو ئەو شوێنە تەنیا خاڵێکە کە

ئەبرەکەکـان دەتـوانن سـەنگەری لـێ بگـرن. لووکاشـکا گەڕایەوە بـۆ لای ئەسـپەکەی و ئـۆلێنینیش بە دوایـدا ڕۆیشـت. لووکاشـکا گـوتی: «دەبـێ عارەبانەیەک گیاوگژ پەیدا کەین. دەنا هەموومان دەکووژن. بڕوانە، بڕوانە لە پشت ئەو گردە، عارەبانەیەکی نووقانی لێیە، پڕە لە گیاوگژ.»

ملازم دووهەم گوێی ڕاگرت و ڕائید ڕەزایەتی دەربڕی. عارەبانەی پڕ لە گژوگیایـان هێنـا و کازاخەکـان لە سـەری ڕاکشـان و گژوگیاکەیـان لە پـێش خۆیانەوە هەڵچنی. ئۆلێنین سواری ئەسپەکەی بوو و چووە سەر گردێک کە لەوێـوە هەمـوو شـوێنێک دیـار بـوو. عارەبـانەی پـڕ لە گژوگیـا وەڕێـکەوت. کازاخەکان لەوێدا خۆیان مەڵاس دابوو. کازاخەکان چوونە پێشێ، چێچێنەکان ـ کە نۆ کەس بـوون ـ لە پـاڵ یەکدا چۆکیـان بە چۆکی یەکتـرەوە نـابوو و تەقەیان دەکرد.

هەموو شـتێک ئـارام بـوو. لە ناکـاو، لە لای چێچێنەکانەوە دەنگێکی سـەیر کە ئاوازی خەماویی «ئاخ ئاخ مخـابن»ی مـامە ئیرووشـکای وەبیـر دێنـایەوە، لەو دەشتە بەرینەدا بوو بە زایەڵە. چێچێنەکان دەیـانزانی ڕزگـار بوونیان لەو شـەڕەدا مەحـاڵە، لەبەر ئەوەی ڕانەکەن، هەرکـام بە گوریسـێک چـۆکی بە چـۆکی هاوسـەنگەرەکەیەوە بەسـتبوو، ئەوان چەکەکانیـان ئامـادە کردبـوو و سروودی پڕشکۆی خۆیان دەچڕی.

کازاخەکان، خۆیان لە سەر عارەبانەی پڕ گژوگیا حەشار دابوو و ئۆلێنین سـات بە سـات چـاوەڕوانی تەقەی تفەنگەکـان بـوو. بەڵام جگە لە سـروودی خەماویی چێچێنەکان هیچ شـتێکی تر بێدەنگی ئەو بیابانە کاکی بە کاکییەی نەدەچڕژانـد. لە ناکـاو دەنگـی سـروودەکە ڕاوەسـتا و تەقەیەکـی چکۆلە هـاتە گـوێ. گـوللەیەک لای سـەرووی عارەبـانەکەی پێکـا. دەنگـی هـاوار و جنێـوی چێچێنەکان بەرز ببۆوە. تفەنگەکـان یەک لە دوای یەک تەقەیـان لـێ هەڵدەسـتا و گوللەکان لە عارەبانە و گیاوگژەکە دەدران. کازاخەکان تەقە لە تفەنگیـانەوە نەدەهات و ئێستا گەیشتبوونە پەنایان و پێنج هەنگاوییان لێ دوور بوون.

دوای ســـــاتێک کتـــــوپڕ کازاخەکـــــان لە دوو لای عارەبـــــانەکەوە بە هاتوهاوارێکی وەحشییانەوە دەرپەڕین. لووکاشکا لە پێش هەموویانەوە بوو. ئـۆلێنین تەنیـا دەنگـی بەرزی هـاوار و تەقەی تفەنگـی دەبیسـت. لەودیـوی تەپۆڵکە لمەکەوە تەنیا دووکەڵ و خوێن وەبەرچاو دەکەوت. ئۆلێنین خەریک بوو دڵی ببوورێتەوە، ئەسپەکەی بەرەڵڵا کرد و هەڵات بۆ لای کازاخەکان. ڕق و بێزاری پەردەی بە سەر چاویدا کێشابوو. نەیتوانی هیچ شتێک ببینێ. بەڵام بۆی دەرکەوت کار لە کار ترازاوە. لووکاشکا وەک چۆڕی شیر سپی هەڵگەڕابوو، دەستی چیچێنێکی برینداری گرتبوو و هاواری دەکرد: «ئەو نەکووژن! دەبێ بە زیندوویی دەستگیری بکەین!» ئەو چیچێنە پیاوە موو سوورەکە، برای ئەو ئەبرەکە بوو کە چەند مانگ لەمەوبەر بە دەستی لووکاشکا کوژرابوو. بۆ وەرگرتنەوەی تەرمی براکەی هاتبوو بۆ پاسگای گوندەکەیان. لووکاشکا هەردوو دەستی کابرا سوورەی لە پشتەوە گرتبوو و ڕێکـی دەگوشـی. لە ناکـاو سـوورە خـۆی ڕاپسـکاند، دەمـانچەکەی لە بەر پشتێنەی دەرهێنا و قامکی بە پەلاپیتکەدا نا. لووکاشکا کەوت. خوێن لە زگی هەڵقوڵی. لە ناکاو هەستایەوە و دیسان کەوتەوە. بە زمانی ڕووسی و تورکی جنێـوی دەدا. خـوێن بە زگ و پشـتیدا دەهـات و شـۆلاوگەی بەسـتبوو. کازاخەکـان گەیشـتنە سـەری و پشـتێنەکەیان کـردەوە. ناسـایر بەر لەوەی یـارمەتیی لووکاشـکا بـدا، مـاوەیەک حەپەسـابوو و نەیـدەتوانی شمشـێرەکە بخـاتەوە نێو کـالانەکەی. چـونکە دەستی دەلەرزی و بـۆی نەدەچـۆوە جـێ. دەمی شمشێرەکە شەلاڵی خوێن بوو.

چێچێنە سوورهوولەکان بە سمێڵی کورت کراوە و جەستەی شەقارشـەقار بوو لە سەر زەوی کەوتبوون. تەنیا ئەو کەسەی تەقەی لە لووکاشکا کردبوو زینـدوو بـوو، وەک هەڵـۆی برینـدار شـەڵتانی خـوێن (خـوێن بە ژێـر چـاوی ڕاستیدا دەهاتە خوارێ) ددانی چیڕ کردبۆوە و ڕوخساری خوێناوی و ڕەنگ پەڕیوی ڕقی لێ دەباری. چاوانی وەک گڕکانی هەڵچوو لە هەموو لایەکیان

دەڕوانـی. لە سـەر زەوی بە چۆکدا هـاتبوو و خەنـجەر بە دەسـت، ئامـادەی بەرگری کردن لە خۆی بوو.

مـلازم دوهەم لە لاتەنیشـتەوە لێـی چـووە پێشـێ و هەروا کە خـۆی لـێ دەپاراسـت، کتـوپڕ بە دمـانچەکەی گـوللەیەکی بە گـوێچکەیەوە نـا. سـوورە ویستی ئاوقای بێ، بەڵام نەیتوانی و بە لادا کەوت.

کازاخەکان بە هەناسەبڕکێ گوریسەکانیان لە چۆکی کوژراوەکان کردەوە، بە ڕیز ڕایانکێشان و چەکەکانیان کۆ کردەوە. هەرکام لەو چێچێنە سوورانە مرۆڤێـک بـوون و قەڵافەتێکـی تایبەتیـان هەبـوو. لووکاشـکایان بـرد بـۆ لای عارەبـانەکە. ئەو هەروا بە زمـانی ڕووسـی و تـورکی جنێـوی دەدا و لەگەڵ ڕاوەشاندنی دەست و لاقی دەیگوت: «درۆ دەکەی، هەرئێستا دەتخنکێنم، تۆ نـاتوانی لە دەسـت مـن ڕزگـارت بـێ ئانانسـی!» بەڵام دوای تاوێـک بێهـۆش کەوت.

ئـۆلێنین گەڕایەوە بـۆ مـاڵێ. لای عەسـر خەبەریـان پێدا کە لووکاشـکا لە حـــاڵی گیانکەنشـــتدایە. بەڵام تورکێـــک لەوبەری ڕووبـــارەکەوە هـــاتووە و دەیهەوێ بە گیای دەرمانی چارەسەری بکا.

تەرمـی کوژراوەکانیـان کێشـا بـۆ بەر پاسـگای گونـدەکە. ژنـان و منـداڵان دەهاتن بۆ سەیری تەرمەکان.

کاتی خۆرئاوا بوون ئۆلێنین گەیشـتەوە مـاڵێ و هەتـا مـاوەیەک دیتنـی ئەو دیـمەنە سـامناکانە تاسـاندبووی و نەدەهـاتەوە سـەر حـاڵی ئاسـایی. بەڵام شـەوێ بیرەوەرییەکـانی شـەوی ڕابـردوو ڕۆحـی لە خـۆیەوە پێچـا و لە پەنـجەرەکەوە چـاوی لە دەرێ کـرد. ماریانکـا کە دیـار بـوو پەشـۆکاوە، لە ژوورەکەیان هاتە دەرێ و ڕۆیشت بۆ لای هەمارەکە. دایکی چووبوو بۆ نێو باخە مێوەکە. باوکی هێشتا لە فەرمانگە نەگەڕابۆوە. ئۆلێنین چاوەڕوان نەما کە ماریانکا کارەکانی تەواو بکات و چوو بۆ لای. ماریانکا لە ژوورەکەیان دانیشـتبوو، هەرکە چـاوی بە ئـۆلێنین کەوت ڕووی وەرگێـڕا. ئـۆلێنین پێـی

وابـوو ئەو کـارە بە هـۆی شــەرم و حەیـاوەیە، دەنگـی هەڵبـڕی: «ماریانکـا، ماریانکا گیان! دەکرێ بێمە ژووری؟»

لە ناکـاو ماریانکـا ئـاوڕی دایەوە. فرمێسـک لە چاویـدا قەتـیس مـابوو و ڕوخساری تەمی خەمێکی پێوە دیار بـوو. بێ ئەوەی متەق بکا، بە نیگایەکی جوان و پڕشکۆوە لە ئۆلێنینی ڕوانی.

ئۆلێنین دووپاتی کردەوە: «ماریانکا گیان منم ...»

ماریانکا گوتی: «لە کۆڵم بەوە، تاقەتم نییە!»

ڕوخسـاری گۆڕانی بە سـەردا نەهـات بەڵام فرمێسـک بە سـەر ڕوومەتیدا هاتە خوارێ.

- چی بووە؟ بۆ دەگریی؟

ماریانکا بە دەنگێکی گڕ و بە دڵپڕییەوە گوتی: «چی بووە؟ مەگین نەتدیوە کازاخەکانیان قەڵاچۆ کردووە. ئیتر دەتەوێ چی بێ؟»

ئۆلێنین گوتی: «لووکاشکا؟»

- بڕۆ، وازم لێ بێنە.

ئۆلێنین لێی نزیک بۆوە و گوتی: «ماریانکا!»

- من هیچ کارێکم بە تۆ نییە، تکایە بڕۆ دەرێ.

ئۆلێنین بە بزەیەکەوە گوتی: «ماریانکا، قسەی وا مەکە!»

ماریانکـا لەگەڵ ئەوەی لاقـی لە تەرکـی ژوورەکە دەکوتـا و بە هەڕەشــە کــردنەوە دەهــات بــۆ لای، گوڕانــدی: «بــڕۆ دەرێ، لە کــۆڵم بەوە چەپەڵ!» پاشـان هەسـتی ڕق و بێـزاری و سـووکایەتی ڕوخسـاری داگـرت و ئـۆلێنین بـۆی دەرکەوت بـۆ ئەوە نـابێ هـیچ هیـوایەکی پێـی هەبـێ؛ تێگەیشـت کە ئەو بۆچوونەی جارانی، یانی ئەوەی کە کچێکی زۆر سرکە و مەحاڵە کەوی بێ، ڕاستە؛ بۆیە هیچی نەگوت و بەپەلە لە ژوورەکە هاتە دەرێ.

# چل و یەک

دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی خۆی، دوو کاتژمێری تەواو لە سەر چرپاکەی بێ جووڵە خۆی لە گەزدا. پاشان چوو بۆ لای ملازم و مۆڵەتی لێ خواست کە بچێت بۆ بنکەی ناوەندی ئەرتەش. خوداحافیزیی لە هیچ کەس نەکرد و تەنیا دەستووری بە ژانۆ دا کە حیساب و کیتابەکە بە خاوەنماڵەکە بدات. پاشان بەرەو قەڵایەک وەڕێکەوت کە بنکەی سەربازخانە بوو. تەنیا مامە ئیرووشکا بە بۆنەی هاتنەوەی جێژنی گرت. هەردووکیان پێکەوە شەڕابیان خواردەوە، دیسان شەڕابیان خواردەوە. ڕاست وەک ڕۆژی وەڕێکەوتن لە مۆسکۆ، یەک ترویکای پۆستە، لە بەردەرگا ڕاوەستابوو. بەڵام ئۆلێنین ئیتر وەک ئەو ڕۆژە لە گەڵ خۆی حیسابێکی نەبوو پاکتاوی بکا، ئیتر بە خۆی نەدەگوت ئەوەی کردوویە و بیری لێ کردۆتەوە، ئەوە نەبووە کە ویستوویەتی؛ ئیتر چاوەڕوانی ژیانێکی نوێ نەبوو. ماریانکای زیاتر لە پێشوو خۆش دەویست و ئێستا دەیزانی کە ئەو هیچ کات ئەوی خۆش ناوێ.

مامە ئیرووشکا گوتی: «دەی مامە گیان! خوداحافیز! ئەگەر بۆ چالاکییەکی نیزامی چووی، بە وردی بیر بکەوە و گوێ بۆ ئامۆژگاریی پیرەپیاوەکان ڕاگرە. کاتێک دەتەوێ شەڤخوون لێدەی بە سەر جێگایەکدا بدەی یان کارێکی ترت هەیە (من گورگێکی پیری باران دیدەم) و دەبینی دوژمن تەقە دەکات، بە تێگڕایی مەچن بۆ شوێنێک کە تاقمێکی زۆری لێیە و خۆشتان بڵاو ببنەوە. چونکە ئێوە سەربازەکان کاتێک ترس داتاندەگرێ خۆتان بە یەکترەوە دەنووسێنن و پێتانوایە ئاوا بە دەستەجەمعی باشترە. بەڵام لە ڕاستیدا هیچ شتێک لەوە خراپتر نییە، دوژمن هەمیشە تەقە لەو شوێنە دەکا کە تاقمێکی زیاتری لێیە. دەی!

ئێستا حاڵی بووی؟ من لە ماوەی تەمەنمدا تەنانەت یەک جاریش نەپێکراوم. بەڵام هەموو ئەوانەم دیتووە!

ژانۆ کە لە نێو ژوورەکە خەریکی پێچانەوەی جانتاکان بوو گوتی: «بەڵام تۆ گوللەیەک لە نێو پشتتدایە.»

ـ ئەوە ئیتر، ئاسەواری دلۆڤانیی کازاخەکانە.

ئۆلێنین لێی پرسی: «کازاخەکان؟»

ـ بەڵێ، کازاخەکان! ئێمە شەڕابمان خواردبۆوە، ژانۆ سیتکین، یەکێک لە کازاخەکان زۆر سەرخۆش بووبوو. لە ناکاو تەتەق... بە دەمانچەکەی گوللەیەکی لە پشتی من دا.

ئۆلێنین پرسیی: «حەتمەن زۆرت ژان پێگەیشتووە؟» پاشان ڕووی لە ژانۆ کرد و گوتی: «دەی ژانۆ، تەواو بووی؟»

ـ جاریێ پەلە مەکە! زۆر بەپەلەی! ڕاوەستە با بۆت بگێڕمەوە... کاتێک گوللەکە لە پشتم درا، نەگەیشتە سەریەسقان، هەروا لە نێو گۆشتەکەدا مایەوە! منیش بە ژانۆ سیتکینم گوت: ڕۆڵەگیان خەریک بوو بمکوژی! بۆ لەخۆڕا تەقەت لە من کرد؟ بەڵام حاڵی بە من، دەستت لە کۆڵ ناکەمەوە، دەبێ یەک چلیکم شەڕاب پێ بدەی.

ئۆلێنین بەبێ ئەوەی بە باشی گوێی گرتبێ، دیسان پرسیی: «دەی، ژانت پێگەیشت؟»

ـ چۆن ژانم پێ بگا! قسەکەم پێ مەبڕە، من ئەوەم پێ خۆش نییە. لێم گەڕێ با قسەکەم تەواو کەم. ئێمە هەروا شەڕابمان خواردەوە، هەتا بەیانی بە خۆشی ڕامانبوارد. من مەست و بێهۆش، لەسەر وەجاخەکە خەوتم. بەیانی کە لە خەو هەستام، دیتم ناتوانم بە ڕێدا بڕۆم.

ئێستا ئیتر ئۆلێنین چاوەڕێ بوو وەڵامێک ببیستێ و پرسیی: «تۆ زۆرت ژان پێگەیشت؟»

ـ مەگین من بە تۆم گوت کە ژانم پێگەیشت، نا، ژانم پێنەگەیشت. تەنیا نەمدەتوانی هەستمە سەرپێ، نەمدەتوانی بجووڵێم.

ئۆلێنین کە بە هۆی دڵتەنگییەوە حەزی لە پێکەنین نەبوو، پرسیی: «ئەی برینەکە، خۆی ساڕێژ بۆوە؟»

ـ بەڵێ، خۆی ساڕێژ بۆوە. بەڵام گوللەکە هەروا لەوێدا مایەوە! دەستت بە پشتمدا بێنە.

کراسەکەی هەڵکرد و پشتە پان و پڕ ماسوولکەکەی وەدەرخست. لە سەر پشتی نزیک بڕبڕەی، گوللەیەک لە ژێر گۆشتەکەیدا بوو، کە ئۆلێنین قامکی پێدانا گریمانەکەی لە بن قامکیدا دەخزی. پیرەپیاو دەستی برد بۆ نێوپشتی خۆی و هەروا کە وەکوو مەڕمەڕ یاریی بە گوللەکە دەکرد گوتی: «دیتووتە چۆن لە ژێر قامکمدا دەخزێ. ئەوەتا، دیتووتە، ئەوە هاتە خوارێ.»

ئۆلێنین پرسیی: «مامە بڵێی لووکاشکا بمێنێ؟»

ـ دەزانی چییە، ئێرە پزیشکی لێ نییە. جارێ چوون پزیشکێک بێنن.

ـ لە کوێ پزیشک دێنن؟ لە گرۆزنی؟

ـ نا مامە گیان! نا، پزیشکە ڕووسییەکانی ئێوە، ئەگەر من تێزار بوایەم، لەمێژ بوو هەموویانم لە سێدارە دابوو. ئەو پزیشکانە تەنیا دەزانن گۆشتی خەڵک لەتوکوت بکەن و تووڕی هەڵدەن. بۆ وێنە یەکێک لە کازاخەکانی خۆمان، باکلاشۆڤ، ئەوان زەلیل و گردەنشینیان کرد، یانی لاقێکیان بڕیەوە. ئاخە گەوجانە! ئێستا ئیتر ئەو پیاوە کەڵکی چییە؟ نا، مامە گیان، لە کوێستانەکان ئێمە پزیشکی ڕاستەقینەمان هەیە. بۆ وێنە هاوڕێیەکی من ڤۆرچیک، لە کاتی شەڕدا، ئێرە سینگی پێکرابوو، دەی دەزانی چی بوو؟ پزیشکەکانی ئێوە جوابیان کرد! بەڵام ساحەب لە شاخەوە هات و چارەسەری کرد. هۆکارەکەشی ئەوە بوو پزیشکەکانی کوێستان گژوگیا دەناسن.

ئۆلێنین گوتی: «لە سەری مەڕۆ. گەوجێتی بەسە. من زۆر زوو سەرگوردێک لە هەنگەوە دەنێرم لووکاشکا چارەسەر بکات.»

پیرەپیاو بە تیتاڵییەوە وەڵامی دایەوە: «گەوجێتی! بێ شعوور! سەرگوردێک دەنێرم! باشە ئەگەر پزیشکەکانی ئێوە بیانتوانیبایە خەڵک چارەسەر بکەن، کازاخەکان و چێچێنەکان بۆ ماریجە دەچوون بۆلای ئەوان، کەچی ئەفسەرەکانی ئێوە و سەرهەنگەکانتان دەچن پزیشکەکانی کوێستانی بۆ چارەسەر کردنی خۆیان دەبەن. لە لای ئێوە هەموو شتێک نایاساییە، هەمووشتێک درۆ و دەلەسەیە.»

ئۆلێنین وەڵامی نەدایەوە. ئەویش لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە ئەو دنیایەی ئەو تێیدا ژیاوە و ئێستا دەیەوێ بۆی بگەڕێتەوە هەموو شتێکی درۆیە. پرسیی: «تۆ خۆت لووکاشکات دیتووە؟»

- بەڵێ، وەک مردوو لە نێو پێخەفدا کەوتووە و جگە لە ڤۆدکا هیچ شتێکی تر ناخوا. نە نان دەخوا نە شەڕاب! لەسەریەک ڤۆدکا دەخواتەوە. بەڵام خۆ ئەوە کەڵکی نییە. پیاو دڵی پێی دەسووتێ. ئەو کوڕە ڕاست وەک من پیاوێکی جیگیتە. منیش جارێک خەریک بوو بمرم. ژنان بۆم دەگریان و خاچیان دەکێشا. سەرم وک کوانووی ئاور گەرم داهاتبوو. منیان بردبوو لە ژێر وێنەی پیرۆزدا ڕایانکێشابووم و پێموابوو لە ژوور سەرم هەزاران تەپڵی چکۆلە درمەیان دێ. من هاوارم دەکرد، ئەوانیش توندتر لێیان دەدا. (پیرەپیاو پێکەنی) ژنان قەشەیان هێنایە ژوور سەرم و دەیانویست بمنێژن. دەیانگوت: هاتۆتە سەر دنیا لەگەڵ ژنان عەیاشی کردووە، پیاوی کوشتووە، دزیی کردووە، بالالایکای ژەنیوە.» بە منیان دەگوت: «تۆبە بکە. منیش تۆبەم دەکرد. هەرچی قەشە سەبارەت بە بالالایکا پرسیاری لێکردم و پێی گوتم مەلعوون، ئەو ئامێرە گڵاوە لە کوێیە؟ زوو جێگاکەیمان پێ نیشان بدە با لەتوکوتی بکەین، من وەڵامم دەدایەوە: لێرە نییە، بەڵام من خۆم لە ئەمبارێک و لە نێو خەشە خوریەکدا شاردبوومەوە و دەمزانی هیچ کەس ناتوانێ بیدۆزێتەوە. پاشان دەستیان لە کۆڵ کردمەوە و من چاک بوومەوە! دیسان دەستم کردەوە بە ژەنینی بالالایکا ... دەی باسی چیم دەکرد؟ ئەها، جوان گوێ

بگرە. هەمیشە دوور لە کەسانی تر بە ڕێدا بڕۆ دەنا گەوجانە خۆت بە کوشت دەدەی. ڕاستت دەوێ من دڵم پێت دەسووتێ، تۆ پیاوێکی شەڕابخۆری و من تۆم خۆش دەوێ. ئەفسەرەکانی ئێوە حەز دەکەن هەمیشە بە سواری ئەسپ بە کێوەکاندا هەڵگەڕێن. بۆ وێنە یەکێک لە ئەفسەرەکانی ئێوە لێرە بوو، لە ڕووسیاوە هاتبوو. هەمیشە بە کێوەکاندا هەڵدەگەڕا و وەکوو سووکایەتی ناوی ئەو کێوانەی نابوو تۆپە. هەرکە چاوی بە یەکێک لەو گردانە دەکەوت، لەڕێوە پێیدا هەڵدەگەڕا. جارێک هەرئاوا هەڵدەگەڕێ و زۆریش دڵخۆش و ڕازی دەبێ. چەکدارێکی چێچێن تەقەی لێکرد و کوشتی. ئەوەش بزانە. چێچێنەکان زۆر تیرهاوێژی چاکن. هێندێ کەسیان هەیە کە زۆر لە من زیرەکترن. من کەسێکم خۆش ناوێ کە گەوجانە خۆی بە کوشتن بدا. هێندێ جار کە چاو لە سەربازەکانی ئێوە دەکەم سەرم سووڕ دەمێنێ لەو هەموو گەوجێتییەیان. چارەڕەشانە بە پۆل بە ڕێدا دەڕۆن و پانتۆڵی سووریش لە پێ دەکەن. ئاوا قەت تیرت بە خەتا ناچێ. یەکێک دەکوژرێ و دەکەوێ. هەڵیدەستێننەوە. یەکێکی تر دێتە پێشێ.ـ پیرەپیاو سەری ڕادەوەشاند و دووپاتی دەکردەوە: ئەوە ئەوپەڕی گەوجێتییە! گەوجێتییە! دەبێ بڵاو ببنەوە و بە ڕیزی دوور لە یەک و بە ڕێدا بڕۆن! ئاوا دەبێ بڕۆیە پێشێ. ئەگەر ئاوا بکەی، هیچ کات ناتوانن بتپێکن. تۆ هەمیشە ئاوا بکە!

ئۆلێنین هەستا ڕۆیشت بۆ لای دەرگاکە و گوتی: «زۆر سپاس، مامە گیان، خوداحافیز! بە هیوای خودا دیسان چاومان بە یەکتر دەکەوێتەوە.»

پیرەپیاو لە تەرکی ژوورەکە دانیشتبوو هەڵنەدەستا.

ـ ئاوا لە یەکتر جیا دەبنەوە؟ ئاخ، گەوجە پیاو! ئەوەش خەڵکی ئەمڕۆ!ساڵێکە پێکەوە هاوڕێین و لە پڕ: خوداحافیز و دەڕۆی و تەواو. بەڵام من تۆم خۆش دەوێ. دڵم پێت دەسووتێ! تۆ چەندە چارەڕەشی هەمیشە

بەتەنیای، هەمیشە تەنیا. چەندە وەحشیی، هێندێ جار من چاوم ناچێتە خەو، بیر لە تۆ دەکەمەوە. هەروا کە تۆ ئەو گۆرانییە دەڵێی: "**براکەم، ژیان لە وڵاتی بێگانە زۆر دژوارە**"، کاری تۆش هەروایە.

ئۆلێنین دیسان گوتی: «خوداحافیز!»

پیرەپیاو هەستا و بۆ تۆقە دەستی درێژ کرد، ئۆلێنین دەستی گرت و گوشیی، ویستی بڕوا ..

- ڕوومەتت، ڕوومەتت بێنە پێشێ.

پیرەپیاو سەری ئۆلێنینی بە هەردوو دەستە گەورەکەی گرت و ئۆلێنین بە سمێڵ و لێوی تەڕی خۆی ئەوی ماچ کرد و دەستی کرد بە گریان.

- من تۆم خۆشدەوێ! خوداحافیز!

ئۆلێنین سواری ترۆئیکاکە بوو. پیرەپیاو لەگەڵ ئەوەی فرمێسک بە چاویدا دەهاتە خوارێ گوتی: «دەی، هەرئاوا دەتەوێ بڕۆی؟ خۆزگە لانیکەم یادگارییەکەت بۆ بەجێ دەهێشتم! تفەنگەکەت بدە بە من. تۆ تفەنگت بۆ چییە؟»

ئۆلێنین تفەنگەکەی لە شانی داکەند و دای بە مامە ئیرووشکا.

ژانۆ لە ژێر لێوەوە گوتی: «هەرچی بیدەی بەو پیرەپیاوە سواڵکەرە، هێشتا هەر پێی کەمە و چاوی تێر نابێ. ئەمانە زۆر خەڵکێکی چاوبرسی و خوازەڵۆکن.»

ئەوەی گوت و باڵتەکەی لە خۆی پێچا و لە پێشەوە دانیشت.

پیرەپیاو بە پێکەنینەوە گوتی: «دەمت لێکنێ، گەمژە! تۆ بۆ ئەوەندە بەرچاوتەنگی!»

ماریانکا لە ژوورەکەی هاتە دەرێ. بەبێ موبالاتییەوە چاوێکی لە ترۆئیکاکە کرد، سەری لەقاند و گەڕایەوە بۆ ژوورەکەی. ژانۆ بە چاوی ئاماژەی کرد و گوتی: «l' faille بڕوانە» هەر خێراش دەستی کرد بە

پێکەنـــین. ئــۆلێنین بە دڵتەنگیــیەوە دەنگــی هەڵبــڕی: «بــڕۆ ون بە لە بەرچاوم!»

مامە ئیرووشـکا دەنگی هەڵێنا: «خوداحـافیز، مـامە گیـان خوداحـافیز! هیچ کات تۆم لە بیر ناچێتەوە.»

ئـۆلێنین چـاوی لە دەوروبەری خـۆی کـرد. مـامە ئیرووشـکا لەگەڵ ماریانکا دیار بوو سەبارەت بە کارەکانی خۆیان دەدوان و هـیچ کامیـان نە پیرەپیاو و نە کچە، لە ئەویان نەدەڕوانی.

---

سـەرچاوە: قزاقـان، لئـو تولسـتوی، تـرجمە مهـدی مجـاب، انتشـارات نگـاه، چاپ اول، تهران، 1365

# فەرهەنگۆک

**ئاڵقەڕێز**: دوو ئاڵقەیە بە زنجیرەوە درگای پێ دادەخەن

**ئەوق**: نوقم، دەرەتان لێ بڕاو، قەتیس بوو

**بزگوڕ**: لەتەپەڕۆ، تیتۆڵ

**بزۆک**: شتێک کە دەجووڵێتەوە (متحرک)

**بڵغەتە**: تاعوون، چاوقووڵکە (طاعون)

**بۆرەکە**: بۆرەپیاو، خوێڕی (مرتیکە)

**بیور**: تەور، بڤر، باڵتە

**بەدەو**: جوان، شۆخوشەنگ

**بەرپیوار**: ون، نادیار، وندا، گوم

**پۆڵاکورۆژ**: بریێتی لە مرۆڤی بەهێز و بەجەرگ

**پەنەمیو**: ماسیو، باکردوو

**تۆسن**: تووڕە، ئاڵەتی

**تێکقژقژان**: ئاڵۆزان و تێکەولێکە

**تەڕپۆش**: کەسێک کە جلوبەرگی جوان و ڕازاوە لە بەر دەکا

**چکووس**: ڕژد، مست قووچاو، ڕەزیل، جەبوون (خسیس)

**چوار هەنگڵ بوون**: بریتی لە زۆر خواردن و تێر بوونی ئاژەڵ (هێندەی خواردووە، چوار هەنگڵ بووە.)

**چەقەسرۆ**: زۆربڵێ، چەنەوەر، چەنەدەرێژی، چەنەوێرغە، چەناکە شکاو، دەمەوەر

**حەمایەت کردن**: گرتن و کەوی کردنی ئەسپ و ماین بۆ سواری

**دێمۆدە**: بێنرخ، سووکوچرووک (مبتذل)

**دەغەزدار**، ڕق لە زگ، قیناوی (کینەتوز)

**ڕمڵ**: لم، خیزی زۆر ورد

**ڕمووسک**: مۆسک، ڕێموسک، گیایەکی قالۆرەداری بۆنخۆشە

**ڕەفیچکە**: ڕەفیسکە، ڕەپیسک، ماسوولکەی بن ئەژنۆ

**ڕەققە**: کیسەڵی ئاوی

**زەنگەتە**: هێشووی ترێ

**سۆڵانەوە**: کزانەوە (سوزش)

**سیسارک**: داڵە کەرخۆرە، خەرتەل (کرکس)

**سیوشکە هەڵاتن**: بریێتی لە تینوێتیی زۆر (عطش)

**سەنگوسووژن دان**: پشکنین، بە وردی گەڕان بە دوای شتێکدا

**شەڕەنگێز**: شەڕانی، جینگزی، شەڕ هەڵایسێن

**شەڤخوون**: هەڵمەتی شەوانە (شبیخون)

**شەونخوونی**: خەو لێ نەکەوتن و بەخەبەر مانەوەی شەوانە

**عەسرۆژە**: ژەمەخوێرِی، نان و چایی عەسرانە

**غەزریو**: تووڕە و تۆسن

**قورساخ**: بەویقار، قورسی و گرانیی مرۆڤ

**قونجڕک**: قوژبن، سووچ

**قوولە پێکردن**: بەرگە نەگرتن، خۆ لە بەردا نەگرتن، بۆ کار و بۆ خواردن دەیڵێن (هێندەی لێ ئازایە، قوولەی پێدەکا)

**قۆڕەکوشتوو**: بۆ ڕەشەوڵاخ دەیڵێن، یانی بە نەخۆشیی قۆڕە بمرێ.

**قەرابینە**: جۆرێ تفەنگی قەدیمی

**قەمچ کردن**: قرتاندن

**کلومنجڕ**: کەشوتووش، قیلەوقانج (اریب)

**کوڕپیژگە**: مێرمنداڵ، کوڕی چکۆلە

**کوودەڵە**: بەچکەی بەراز

**کۆدە**: زەویی شێوبڕاوی نەچێندراو

**کۆزیلکە بەستن**: کۆ بوونەوە لە دەوری یەک

**کۆلکەی سەربەخوێن**: برێتی لە مرۆی بە فیتنە و ئاژاوە، بە تایبەت بە ئافرەت دەگوترێ.

**کەلبەدوون**: پەراوێزی زەڕی کە لە دەوری ملیوانە و پێشی عەبا و سەردەستی دەدەن (گلابتون)

**گونجڕ**: جینگن، شەڕانی، جینگزی، بەهانەگر، پێچەقێن

**لاپرەسەن**: خۆ تێهەڵقوتێن

**لووتاوێژ**: بریتی لە خواردنی بە نابەدڵی

**مارێز**: زاڵم، دیکتاتۆر، مارِز

**ماریلە**: ئاوی کەمی جۆگە و کانی کە خەریکە وشک دەبێ.

**مجرۆ**: گۆج، نقوستان (فلج)

**مژمۆر**: کەسێ کە چاوی چکۆلە و خووتەکەیە؛ پڕووشە چاو.

**مگێز**: ئیشتیا، تاسە، مەیل، حەز.

**نڤشک**: سەرشیر، سەرتوێی شیر

**نێرگزە**: نووکی کلکی ئەسپ کە دەیقرتێنن بۆ ئەوەی کلکی قیت ڕاوەستێ و مووەکەی بژ بێتەوە.

**واق وڕمان**: سەرسام بوون، عەبەسران، سەرسووڕمان

**هەنگەمە**: هەراوهاوار، بگرە و بەردە، هاتوهاوار.

**بەرهەمە چاپ کراوەکانی ئەمین گەردیگلانی:**

١) تـاپۆی وەرزێکـی سـەوز، کۆمەڵەشـیعر، چاپخـانەی شـوعاع تەورێـز، ١٩٩٧

٢) شەوەژانی ئەستێرەیەک، کۆمەڵەشیعر۔ تاران، نشر عابد، ٢٠٠٠

٣) مەرگەخەون، کۆمەڵەشیعر، تاران، نشر پیام امروز، ٢٠٠٣

٤) دیسان لەو شـەقامانەوە، کۆمەڵە چیرۆکی بیژەنی نەجدی، وەرگێڕان، ئاراس، ٢٠٠٥

٥) تەپڵی ئاور، کۆمەڵە چیرۆکی بیانی، وەرگێڕان، ئاراس، ٢٠٠٥

٦) جێگای بەتاڵی سلووچ، ڕۆمـان، مەحمـوودی دەوڵەتئابـادی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠٠٦

٧) خـۆر و لاولاو، کـۆمەڵە شـیعری منـداڵان، بۆکـان، چاپخـانەی داهـاتوو ٢٠٠٧

٨) یەکگـرتن، چیرۆکـی منـداڵان، قودسـی قـازی نـوور، وەرگێـڕان، ئـاراس، ٢٠٠٧

٩) برایـانی کارامـازۆف، ڕۆمـان، فیـۆدۆر دۆستۆیۆفسـکی، وەرگێـڕان، موکریانی، ٢٠٠٧

١٠) خولیای نووسین، کۆمەڵە وتار۔ ڕەزا بەراهەنی، وەرگێڕان. موکریـانی، ٢٠٠٨

١١) فەرهەنگـی ڕێـژگە (ئەو وشـانەی لەهەنبـانە بـۆرینەدا نەهـاتوون)، موکریانی ٢٠٠٩

١٢) کەڵەشـێری ورگـن، چیرۆکـی منـداڵان، فۆلکلـۆر؛ نووسـینەوە، بۆکـان، ئیزیرتوو، ٢٠٠٩

١٣) تازیەبـارانی بەیەل، ڕۆمـانی غوڵامحوسـێن سـاعیدی، وەرگێـڕان، موکریانی٢٠١١

١٤) مەرگی ئیڤان، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١١

١٥) دار وپەپـــوولە و ڕووبـــار، چیرۆکـــی منـــداڵان، فەریـــدە شەبانفەر، وەرگێڕان، ٢٠١١
١٦) دیلی قەفقاز، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١١
١٧) باوکە سێرگی، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١١
١٨) ئاغا و نۆکەر، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١١
١٩) هاوسـەرگیری بەختـەوەرانە، ڕۆمـان، تۆلسـتۆی، وەرگێـڕان، هەولێـر، خانەی کتێبی ئاوێر ٢٠١٢
٢٠) نارنجی فڕین، چیرۆک، وەزارەتی ڕۆشنبیری، سلێمانی، ٢٠١٢
٢١) ئانا کارنینا، ڕۆمان، تۆلستۆی، وەرگێڕان، موکریانی، ٢٠١٢

**ئەم بەرهەمانەش ئامادەی چاپن:**

١) ئاپۆرەی خەو، کۆمەڵە شێعر
٢) شەیتان، ڕۆمان، لئۆ تۆلستۆی، وەرگێڕان
٣) سترانی شەپۆلەکان، شێعری هاوچەرخی فارس، وەرگێڕان.
4) ڕێگایەک بەرەو هەتاو، کۆمەڵەچیرۆک، وەرگێڕان
5) شارەزاییە بنەڕەتییەکانی ژیان، دووروونی ڕیچ، وەرگێڕان
6) پەسلان، ڕۆمان، لیۆ تولستوی، وەرگێڕان
7) هاوار و ژیلەمۆ، کۆمەڵە شیعر